

# فه رهه نگی

# "شیرین"ی نوێ

عه ره بی _ کوردی






فازیل نیزامه دین



# فەرهەنگی "شیرین"ی نوێ

تا ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووش، فەرهەنگێکی باشی عەرەبی – کوردی لە کتێبخانەی کوردیدا نەبوو. ئەمە لە کاتێکا بە حوکمی ڕۆژگار و بەحوکمی دراوسێیەتی و بارودۆخی سیاسی ، زمانی عەرەبی و کتێبخانەی عەرەبی سەرچاوەیەکی ڕاستەوخۆی ئەدیب و نووسەر و خوێنەری کورد بووەو بە تایبەتیش لەدوای پەنجاکان و تا کۆتایی هەشتاکان دەتوانین بڵێین بوو بە تاقە سەرچاوەی ڕۆشنبیری بۆیان، ئیدی پێمان خۆش بێت یان نا ئەمە ڕاستییەکەو نکۆڵیی لێ ناکرێ. هەڵبەت گەر بۆ هۆکارەکانیش بگەڕێین، گەلێ هۆکار دەبینینەوە کە بوونە مایەی دروستکردنی ئەو دۆخە. بۆیە هەر لێرەوە بوونی فەرهەنگێکی تایبەت بە هەردوو زمانی عەرەبی – کوردی بووە پێداویستییەك بۆ گەلێ لەو ئەدیب و خوێنەرانەی کە مامەڵەیان لەگەڵ زمانی عەرەبیدا دەکرد و وەکو وتیشمان تا ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو فەرهەنگێکی لە مجۆرە کە بتوانێ ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە لە گۆڕێ نەبوو.

هەڵبەت دواتریش گەر هەوڵەکانی گیوموکریانی و پاشان مامۆستا کەمال جەلال غەریب (کە پتر فەرهەنگەکانی زانستی بوون) ومامۆستا جەمال عەبدول و چەند فەرهەنگۆکێکی وەکو ئەوەی کۆڕی زانیاری کورد و ژمارەیەکی گۆڤاری (پەروەردە و زانست)ی لێ دەربکەین چاومان بە فەرهەنگێکی عەرەبی – کوردیی ئەوتۆ ناکەوێت کە ببێتە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ خوێنەری کورد.

مامۆستا (فازیل نیزامەدین) یەکێك بوو لەو پیاوە دڵسۆزانەی کە هەر زوو هەستی بەم بۆشاییە گەورەیە کرد لە کتێبخانەی کوردیدا و بۆیە بڕیاریدا خۆی بۆ ئەم بوارە تەرخان بکات و لەم ڕووەشەوە هێندەی بۆی کرا درێغیی نەکرد. ئەوەبوو سەرەتا بە فەرهەنگی " ئەستێرە گەشە " دەستی پێ کرد کە فەرهەنگێکی (کوردی – عەرەبی)بوو و لە کاتی خۆیدا بەتیراژێکی زۆر چاپ کراو خوێنەرێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. پاشتریش زۆرترین کاتی خۆی دا بە ئامادەکردنی فەرهەنگێکی (عەرەبی – کوردی) کە بەناوی (فەرهەنگی شیرین)ەوە دەرچوو و لەلایەن ئێمە "دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم"ەوە چاپ و بڵاوکرایەوە و تائێستا چەند جارێك چاپکراوەتەوە. دواهەمین

فەرهـەنگی، ئـەم فەرهەنگەیـە کـە ئێـستا لەبەردەسـتی خوێنـەری هێژادایـەو بـۆ جیاکردنەوەی لە (فەرهەنگی شیرین)، من و خوالێخۆشبوو پێکەوە رێککەوتین لەسەر ئەوەی ناوی بنێین (فەرهـەنگی" شیرین"ی نوێ). وشـەکانی ئـەم فەرهەنگـە بـەپێی سیـستمی (ئـەلفبێی – قیاسـی) ڕیزکـراون، واتـە ئـەوەی ئـەم فەرهەنگـە تازەیـە لـە فەرهەنگەکەی پێشوو جیادەکاتەوە ئەوەیە کە بۆ دۆزینەوەی وشەکان لـەم فەرهەنگـەدا پشت بە ڕەگی سێینەی فرمانـە عەرەبیـەکان نەبەستراوە. بـۆ نموونـە کاتێـك خوێنـەر بیەوێت بۆ وشەی (ارتكب) بگـەڕێت، هـەر لـە پیتـی (أ)دا دەیدۆزێتـەوە، نـەك لـە (ر)دا، ڕەگی (وشەکە "ركب"ەیە). هەروەها گەربیـەوێت وشـەی (مـستنقع) بدۆزێتـەوە، دەبـێ هەر لە پیتی (م)دا بۆی بگەڕێت نەك بیگەڕێنێتەوە بۆ ڕەگەکەی کە (نقع)ەیـە. هەربۆیـە ئەم فەرهەنگە لە ڕووی بەکارهێنانەوە زۆر ئاسانترە لە (فەرهەنگی شیرین) واتە کەسێك گـەر شـارەزاییەکی ئەوتۆشـی لـە زمـانی عەرەبیـدا نـەبێت، دەتـوانێ بەئاسـانی ئـەم فەرهەنگە بەکاربهێنێت و مانای ئەو وشەیەی تیا بدۆزێتەوە کە مەبەستێتی.

بەداخەوە کە ئەم فەرهەنگە لەبەر گەلێ هـۆ دواکـەوت و لەسـەروو هەمووشیانەوە کـاتی پێویست بۆ تایپکردنی و هـەروەها پێداچوونەوەی ورد و پاشانیش دیزاینـی. ئـەو ڕۆژەی مامۆستا فازیل نیزامەدین دوابەشـی ئـەم فەرهەنگـەی تـەواوکردبوو هـات بـۆ لام و دوای کەمێك گفتوگۆ لەسەرکارەکەی پێی وتم: ئێستا کە تـەواوم کـرد هەسـت دەکـەم ئـارامم، بەڵام هەر ئەو ڕۆژەو بە چەند سەعاتێك دوای ئەوەی لای من ڕۆیـشت هـەواڵی دڵتـەزێنی مەرگە چاوەڕواننەکراوەکەیم بیست و لە ناخەوە غەمی دامێ، چونکە ئـەو گـەڵێ خـەونی مابوو کە بەتەمابوو کاریان بۆ بکات و بە مەرگی ئەویش کتێبخانـەی کـوردی کەسـێك لـە دەست دەدات کە بەڕاستی و دڵسۆزانە لە خەمی فەرهەنگسازیدا بوو.

بە هێوایین هاوکات لەگەڵ چاپکردنی ئەم فەرهەنگەداو ڕووناکی بینینی لەناو کتێبخانـەی کوردیدا، ڕۆحی مامۆستا (فازیل)یش ئارامتر و ڕووناك و ڕۆشن بێتەوە.

ئازاد بەرزنجی

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرەی کتێب

# أ

أ-همزة الاستفهام: هلْ/ ئايا. ئاخۆ. أقرأتَ خطابي/ ئايا نامەکەمت خوێندەوە.

همزة التسوية: أم/ یان. أذهبْتَ أم بقيتَ/ چویت یان مایتەوە.

آبَ: راجع. عادَ/ گەڕایەوە. هاتەوە.

إئتابَ: رجع. عائد: گەڕایەوە. هاتەوە.

إئتزرَ: لبسَ الإزار/ خۆی پۆشی. پۆشاکی لەبەرکرد. پەشتەماڵی گرتەوە.

إئتى: اقتدى بـ/ لاسایی کردەوە. پەیڕەوی کرد.

إئتكلَ: تآكلَ/ داخورا. پوا. پوکایەوە.

إئتكل: أكل بَعْضَهُ بَعضاً/ یەکتریان خوارد. یەك یەکی خوارد.

إئتكل غضَباً: ثار ثائره. حَمى غضَبُهُ/ ڕقی هەڵسا. توڕە بوو.

إئتلاف: وئام. إنسجام. وفاق/ ئاشتی. خۆشی. ڕێکی. هاوکاری. کۆکی. تەبایی.

إئتلاف: إتّحاد/ یەکگرتن. یەکیەتی. یەکبوون. یەکگرتنی کاتی.

إئتلافي. حكومة إئتلافية/ حکومەتێکی پێکهاتوو بە هاوکاری.

إئتلفَ: إتَّحَدَ. إنضمَّ/ یەکیانگرت. پێکهاتن.

إئتلف: تناغَمَ. إنسجم/ گونجا. ڕێککەوت.

إئتلَف: شكَّلَ ائتلافاً بين احزاب وهيئات/ یەکیانگرت. بەرەیەکیان پێکهێنا.

إئتلَفَ: بهِ: إعتادَهُ/ ڕاهات لەگەڵی. هۆگری بوو.

إئتلقَ: تألّقَ: لمعَ أضاءَ/ شەوقی دایەوە. نیازی بوو.

إئتمَّ: قصد. توجَّه/ بۆی چوو. ڕووی تێکرد. نیازی بوو. مەبەستی بوو.

إئتمَّ بـ: إقتدى بـ/ پەیڕەوی کرد. لاسایی کردەوە.

إئتمار: تشاوُر/ وتوێژ. کۆبوونەوە.

إئتمار: تآمُر. مؤامرة/ پیلان. ئاژاوە. پیلانگێڕان. ئاژاوەنانەوە.

إئتمار: طاعة. خضوع: گوێڕایەڵی. ملکەچی. ملدان. سەرشۆڕی. هاتنە سەرڕێ.

إئتمام بـ: إقتداء بـ/ پەیڕەوی کردن. لاسایی کردنەوە.

إئتمان: ثِقة. وُثوق/ باوەڕ. دڵنیایی. بڕوا. باوەڕمەندێتی.

إئتمان: نسيئة. تسليف. مُداينة/ قەرز. دەستیاو.

سوء الائتمان. اساءة الإئتمان: خيانة الأمانة/ ناپاکی. دەستپیسی. بێ بەڵێنی.

إئتماني: ثقة. مأمون/ بوونی باوەڕ. باوەڕمەندێتی. باوەڕداری.

إئتمرَ: تشاورَ/ ڕاوێژی کرد. وتوێژی کرد. دووا.

إئتمرَ تآمرَ: دبَّر مكيدة/ پیلانی گێڕا.

إئتمرَ (بأمره له) أطاع. إمتثَل/ بە قسەی کرد. ملی کەچ کرد. ملی دا. سەری بۆ دانەواند.

إئتمنَ: وثقَ بـ/ باوەڕی کرد. دڵنیابوو. متمانەی پێکرد.

إئتمنَ على: "عهد اليه بـ/ لای دابنا. بە ئەمانەت لای داینا. متمانەی پێکرد.

إئتياب: رُجوع. عودة/ گەڕانەوە. هاتنەوە.

آنس. يائيس: ژنی لە حەیز وەستاوە، بێهیوابوو لەمناڵبوون.

قانط. بلا أمل/ نائومێد. بێ هیوا. پرزە بڕاو. ڕەنج بە با.

آنسة. عَجوز: پیرێژن. ئافرەتی بەساڵاچوو.

آبَ: رَجَعَ. عادَ/ گەڕایەوە. هاتەوە. بای دایەوە.

آبَ الى الله: تـــابَ/ گەڕایـــەوە بـــۆ خواپەرستی. تۆبەی کرد.

آب: شهر أغطس/ مانگی هەشتەم. گەلاوێژ.

آبَ: غير راشٍ/ ناقایل.

أبَّ اليه: إشتاقَ/ ئارەزووی کرد. تاسەی کرد.

أبّ: عُشب رطبة ويابسة/ گژوگیا. پوش و پەڵاش.

أب: والد/ باوك. بابا. بابە. باو. باڤ.

أب: كـاهن/ زەبـوان. قەشـە. ئاییـنكـار. پیـاوی ئایینی مەسیحی‌و جولەکە.

أب: جَدّ. سَلَف/ باپیر. پێشین. پێشینان.

آباء: أجداد/ باوو باپیر. باپیران.

أبو: أب. والد/ باوك. باب. بابە. بابا. باو. باوە. باڤ.

أبو الأشبال: باوکی بەچکەشێران

أسد/ شێر

أبو بَريح: غُراب/ قەلەڕەشکە.

أبو بريص: وَزَغَة. سام. أبـرص/ شـەوگەرد. چەپ. یسك، گەڕی.

البَشر: آدم/ ئادەم.

أبو بَيْض: عنكبوت/ جاڵجاڵۆکە.

أبو جابر: خُبز/ نان.

أبو الجامع: المائدة. مائدة الطعام/ سفرە. خوان. سینی و خوان.

أبو جُعْدَة: ذئب/ گورگ.

أبو جُعران: جُعَل. خُنفساء رَوث البقر/ گوخلێنکە. قالۆچە. قالۆنچە.

أبـو جَلَمبـو: سَـرَطان. سَـلَطَعون/ قرژال. کیڤژاڵـە. قرژان. قرژانگ.

أبـو جنيـب: سَـرطان/ قـرژان. کیڤژاڵـە. قـرژان. قرژانگ.

أبو الحارث: أسد/ شێر.

أبو خُدَيج: لَقلَق/ لەقلەق. حاجی لەقلەق.

أبو الحُصَين: ثَعلب/ ڕێوی.

أبـو الحنّـاء: طـائر/ مەلێکـە لـە چۆلەکە ئەچێ سنگی سورە.

أبو خالد: كلب/ سەگ.

أبو الخُطّاف: حِداة. حِدَايـة/ کۆلارە. سورەداڵە. مشککرە.

أبو خنجر: نبات: ڕوەکێکە لە شوێت ئەکا.

أبو دَقيق: فَراشة/ پەپولە.

أبو رِيَاح: فُزاعة/ داهۆڵ.

أبو زاجر: الغُراب/ قەلەڕەشکە.

أبـو زُرَيـف: طـار اكـبر مـن العـصفور/ جقـە. قەلەباچکە.

أبو زُهرة: إبن آوى. واوى/ چەقەڵ. شوغال.

أبو زَوبَعة: الريح الشيطانية/ گێژەڵووکە.

أبو سُرّة: برتقال: پرتەقاڵ.

أبو صابر: مِلح/ خوێ.

أبـو صـفار: مـرض اليرقـان. مـرض الـصفراء/ زەردوویی.

أبو صَباب: فَراج/ سوێسکە. سورك. گەڤژیلە.

أبو عَوف: ذكر الجراد/ نێرەی کوللە.

أبو العيد: قَثْلة. دعسوقة/ خاڵخاڵۆکە.

أبو فراس: أسد/ شێر.

أبو فَروة: كَستَنة/ شابەڕو. کەستەنە.

أبو قُرّة: حَرباء/ مارمێلکە.

أبـــو قَلَنـــسُوَة: خـــوري. شمـــاس. مـــن الطبـــور/ کلاوڕەش.

أبو كاسب: ذئب/ گورگ.

أبو كَرش: " أكرش/ ورگن. ورگ زل.

أبو كعب. أبو كُعيب: مرش النكاف/ نەخۆشی ملەخرە.

أبو لُبَد: أسد/ شێر.

أبو مالك: الكِبر/ پیری. پیرێتی.

أبو مالك: الجوع/ برسیێتی.

أبو مُعاوية: فهد/ پڵنگ.

أبو ملعقة: طائر مائي/ دەنوك كەوچك.

أبو منجل: طائر/ دەم داس. داس دەنوك.

أبو المُنذر: ديك/ كەڵەشێر. كەڵەباب.

أبو النطيط: جُندُب. نوع من الجراد/ كوللە مسكە.

أبو نظارة: ذو نظارة/ عەینەك لەچاو. چاویلكە لە چاو. چەشمەك پۆش.

أبو النوم: نبات الخشخاش/ خاشخاش.

أبو نُغام: لهب. من الطير/ قوڵنگ.

أبو هُبيرة: ذكَر الضفدع/ نێرەی بۆق.

أبو الهَول: تمثال/ پەیكەری ئەبولھەول لە میسر.

أبو اليقظان: ديك/ كەڵەشێر. كەڵەباب.

أبو كذا: صاحب كذا/ خاوەن، خاوەنی فلان.

أبَوان. أبَوَين: الوالدان/ دایك و باوك. داك و باب. باوان.

أباً عن جَد/ لە باووباپیرانەوە.

أبىَ: رَفَضَ/ نەیویست. بەدڵی نەبوو.

أبى: عافَ/ بەجێی هێشت. وازی لێهێنا.

أبىَ: أنِفَ. تَرَفَّع. إستَنكَفَ/ بێزی نەهات. بێزی لێكردەوە، لوتبەرزی كرد.

أبى عليه كذا: حَرَّمَهُ إياه/ لێی (قەدەغە. حەرام) كرد.

شاءَ أم أبى: أراد أو لم يَرد/ بیەوێ یا نەیەوێ. ویستی یا نا.

أباءَ بالمكان: أقام. نَزَلَ/ تیا نیشتەجێ بوو. جێگیر بوو. لە جێگەكەدا مایەوە.

أباءَ: آوى. أنزَلَ/ داڵدەی دا. جێی كردەوە.

أباءَ منه: فَرَّ/ لەدەستی دەرچوو. ڕایكرد. بۆی دەرچوو.

إباء. إباءة: رَفض/ نەویستن، ڕەتیكردەوە.

إباء: أنَفَة. عِزّة النفس/ ڕێزی خۆگرتن. ڕێزخۆ. بەفیز، نەفس بەرز.

أباتَ: جعله يَبيت/ گلی دایەوە. هێشتیەوە، شەومایەوە.

أباحَ: أجازَ. سَمَحَ/ ڕێی دا. هێشتی. هێڵای.

أباحَ بالسرّ: أظهر. أفشى/ نهێنیەكەی ئاشكرا كرد. دركانی.

أباحَ. استباح الشيء: عَدّهُ مُلكاً للجميع/ بەرەڵڵای كرد. گشتاندی. كردی بەهی هەموان.

إباحَة: إجازة. سَماح/ ڕێدان. هێشتن. هێڵان.

إباحة: بَوْح. إفشاء/ دركاندن. ئاشكراكردن. دەرخستن.

إباحي: خالِق العذاري. فاسق/ داوێن پیس. بێ ئابڕوویی. بێ شەرمی. بەرەڵڵایی. خراپەكردن.

إباحيَّة: فسق؛ خلاعة/ داوێن پیسی، بێ ئابڕوویی. بێ شەرمی. بەرەڵڵایی. خراپەكردن.

أبادَ: أهلكَ. بَحَقَ/ لەناوی برد. فەوتانی. قڕی تێخست. قەلاچۆی كرد. كاولی كرد. وێرانی كرد.

إبادة: إهلاك. بَحق/ لەناوبردن. فەوتانن. قڕتێخستن. قڕكردن. قەلاچۆكردن. كاواكردن. وێرانكردن. لنافبرن. ژنافبرن.

إبادة جماعية/ كۆمەڵ كوژی. بەكۆمەڵ كوشتن. قڕتێخستن.

أبـار: أهلك/ لـهناوى برد. فەوتانى. كاولى كرد. ويرانى كرد.

أبّـار: صـانع الإبـر أو بائعهـا/ دەرزى دروستكەر. دەرزى فرۆش.

أبَار: برغوث/ كێچ.

أُباشَة: خليط من الناس. جماعة/ كۆمەڵە خەڵك.

أباض: وضَع البيض. ألقى البيض/ هێلكەى كرد.

إباضة: خُروج البيضة/ هێلكەكردن.

أباعَ: عرَض للبيع/ داينا بۆ فرۆشتن. ئەيفرۆشێ.

أبالَ: جَعلَهُ يبول/ ميزى پێ كرد.

أبَـــانَ: بَــيَّنَ. أظهَـــرَ. أوضَـــحَ/ دەرى خـست. خستيەڕوو. ئاشكراى كرد. ڕوونى كردەوە.

أبـــانَ الـــشيء: قطعَـــهُ و فَـــصَلَهُ/ بـڕى. لێكـى جياكردەوە.

أبانَ: تَبَيَّنَ الشيء: إتّضَحَ/ دەركەوت. كەوتەڕوو. ئاشكرا بوو. ڕوون بوەوە.

إبّان: حينَ. وقت/ كات.

إبـانَ الـشيءُ: أوَّلُـه وأوانُـه/ سـەرەتا. هـەڕەت. نۆبەرە. نوخشە.

هـو في إبّـان شـبابه: في عنفـوان شـبابه/ وا لـه (هەڕەت. تاف. سێرە)ى لاويدا.

إبانَة تَبيين. إظهار. إيضاح/ دەرخستن. كەتنەڕوو. ئاشكرابوون. ڕوونبوونەوە.

إبانَـة الرجـل: كـل أصـحابه/ هـاوڕێ. هـاوەڵ. برادەران.

أبت النهار: إشتَدَّ حَرُّهُ/ گەرمى كرد. تاوى سەند.

إبتئاس. إبتاس: حُزن. غم/ پەژارە. خەم. خەفەت.

إبتـأس. حَـزِنَ: أصـبح مهمومـا/ پـەژارەدار بـوو. خەفەتى خوارد. پەست بوو. خەم دايگرت.

لاتبتـئس: لاتحـزَن/ خەفەت مـەخۆ. خـەم مـەخۆ. دڵگير مەبە. پەست مەبە.

إبتَـدأ: بَـدأَ. إفتَـتَحَ. شَـرَعَ/ كرديـەوە. دەسـتى پێكرد.

إبتاعَ: اشترَى/ كڕى. سەندى.

إبتـداء: بَـدء: إفتتـاح. شُـروع/ دەسـتپێكردن. سەرەتا. نوخشە. دەسپێك.

إبتداءً من: بدأً من/ لە.

إبتدائي: أولى. أساس/ سەرەتايى. بەرايى.

إبتدائي: تحضيري/ ئامادەيى، ئامادەكارى.

مدرسة إبتدائية/ قوتابخانەى سەرەتايى.

تعليم إبتدائي/ خوێندنى سەرەتايى.

إبتـداع: إبتكـار. إخـتراع/ داهێنـان. دۆزينـەوە. دروستكردن. بەدەوكارى. ئەفراندن.

بِدعَة. هرطقة. ضلال/ گومڕايى. لادان لە دامودەزگا و نەريت و ئاين.

إبتـداعي: هَرطَقـي. ضـلال/ ڕێ (لـێ ونبـوون. ونكردن).

إبتَدَعَ. إختَرَعَ/ دايهێنا. دۆزييەوە.

إبتِداه: إرتجال. على البيهة/ لەبەر. ڕاستەوخۆ. سەرپێى وتار و گفتوگۆ.

إبتَـدَرني إلى: أسـرعَ/ خێرايـى كـرد. پەلـەى كـرد. هەڵمەتى برد.

إبتَـدَرَ: إسـتَبَقَ/ دەسـتپێشـكەرى كـرد. دەسـتى خۆى پێشخست.

إبتَـدَرني قـائلاً/ پـێش مـن دوا. دەسـتى خـۆى پێشخست.

إبتَدَعَ: إختَرَعَ/ دايهێنا. دۆزيەوە.

إبتَـدَعَ: أتـى ببدعَـة (عقيـدة تخـالف الإيمـان)/ باوەڕێكى ئاينى تازەى هێنايە كايەوە.

إبتَـدَهَ: إرتَجَلَ/ ڕاستەوخۆ قسەى كرد و وتـارى دا. سەرپێى دوا. لەبەر وتارى خوێندەوە.

إبتذال: إمتهان. إساءة الاستعمال/ شڕکردن. لەکەڵك خستن. خراپ بەکارهێنان.

إبتذال: كَون الشيء مُبتذلاً/ كۆنە. شتی شڕ و بێکەڵك. زۆربەکارهاتوو. بێفەڕ.

إبتذال: عدم احتشام/ شورەیی. بێئابڕوویی.

إبتذل: إمتَسن/ شڕبوو. شڕووڕ بوو. كۆن بوو. کەڵکی نەما.

إبتذل: تَرك الإحتشام/ ئابڕووی نەما. بێئابڕوو بوو. خوێڕی بوو.

إبتذل نفسَهُ: إنحطَّ/ ئابڕووی خۆی برد. خۆی سوك كرد. ڕسوابوو.

أبتر: مقطوع/ بڕاو. کەل. قرتاو. کوڵ. دوابڕاو.

أبتر: بلا ذنب/ بێکەڵك. کوڵ. کلك بڕاو.

أبتر: بلا عَقِب. بلا نسل/ وەجاخ كوێر. بێ مندال، بێ نەوە.

أبتر: مُقتضب/ كورت كراو. كورت و كوێر.

إبتزّ: سَلَب. أخذ كرهاً. عَنوةً/ بەزۆر سەندی. ڕووتی کردەوە.

إبتزاز: سَلب. أخذ كرهاً/ بەزۆر. بە هەڕەشەسەندن. ڕووتکردنەوە.

إبتزازي: إغتصابي. جَبري/ زۆرداری. هەڕەشە. ڕووتکردنەوە.

إبتسام: تَبَسُّم/ خەندە. پێکەنینی بێدەنگ. زەردەخەنە.

إبتسامه: بَسمَة/ زەردەخەنە. بزە. بزەی لێو. شەکرخەنە. بشکوژین. زەردەکەنێ. گرنژین.

إبتسرَ: إستعجَلَ قبل الأوان/ نوقڵانەی لێدا. پێشبینی کرد.

إبتسمَ: تَبسّمَ: ضحكَ قليلاً/ بزەکرتی. زەردەخەنە گرتی.

إبتشكَ: كَذبَ/ درۆی کرد.

إبتشكَ الكلامَ: إرتجَلهُ و إختلقهُ/ قسەی هەڵبەست. لەبەر بوورە قسەی کرد.

إبثاث. بثّ/ بڵاوی کردەوە.

إبتعاد: ذهاب. مُغادرة/ ڕۆیشتن. ڕۆیین.

إبتعاد عن: البقاء بعيداً. غياب عن/ دوورکەوتنەوە. خۆ ونکردن. دوورەپەرێزی.

إبتعاد: إنفصال. فراق/ جیابوونەوە.

إبتعاد عن: تجنُّب/ دوورەپەرێز وەستان. وازلێهێنان. دوورکەوتنەوە.

إبتعاد: بُعد. قصاء/ دووری.

إبتعثَ. بعثَ/ بووژاندیەوە. بوژایەوە.

إبتعدَ عن: ذهب بعيداً/ دوورکەوتنەوە.

إبتعدَ عن: إنفصل/ جیابوەوە.

إبتعدَ عن: تَجنَّب. تفادى/ دورەپەرێز وەستا. وازی هێنا. خۆی لێ لادا.

إبتعدَ: كان بعيداً. قصيًا/ دوور بوو.

إبتغى: طَمحَ الى. رَغِبَ في. طَلَبَ/ ویستی. حەزیکرد. ئارەزووی کرد.

إبتغاء: طَلَب. رَغبَة. طُموح/ ویستن. حەزلێکردن. داواکردن. ئارەزووکردن. خواست.

إبتغاء: غاية. هَدَف/ مەبەست. ئامانج. هیوا. خواست. داوا. ویستن. خۆزگە. ئارەزوو.

إبتغاءً: بُغيَة. لِكَي/ بۆئەوەی. لەبەر. لەبەر خاتری.

إبتكار: إستنباط. إختراع. إستحداث/ دروستکردن. داهێنان. ئەفراندن. بەدەوکاری.

إبتكَرَ: إستنبطَ. إخترعَ/ دروستی کرد. دایهێنا.

إبتكر كَلمَةً أو عبارةً: صاغَها/ وشە و ڕستەی داڕشت.

إبتكر فُلاناً: أتاه باكراً/ زوو هاتە لای.

ابتكـر الفاكهـةَ: أكـل باكورتهـا/ نۆبـەرەی کـرد. نۆبەرەی خوارد

ابتَـلَّ: تَبَلَّـل. تَنَـدَّى. أخـذ رطوبَـةً/ تـەڕبوو. شێی هێنایەوە.

ابتلى: إختَبَر. جَرَّبَ/ تاقیکردەوە.

ابتُلـيَ: أصـاب بمِنـة أو مُصيبَة/ تووشی بـەڵا بوو. گرفتار بوو. دووچار بوو. گیرۆدە بوو. تێوەگلا.

ابـتلاء: إصـابة بمحنـة أو مُـصيبَة/ تووشـبوون. گرفتـــاربوون. دووچـــاربوون. گیرۆدەبـــوون. تێوەگلان.

ابـــتلاع: بَلْـــع. إزدراد/ قووتـــدان. لووشـــدان. هەڵلووشین.

ابتَلَـــعَ: بَلَـــعَ. إزدَرَدَ/ قـــووتی دا. لووشـــی دا. هەڵیلووشی.

ابتَنى: بَنى. شَيَّدَ/ دروستی کرد. دایمەزران.

ابتناء: إحياء/ زیندووکردنەوە. بووژاندنەوە.

ابتِهاج: فَرَح. سُرور/ خۆشی. شادی. شادمانی. ئاسوودەیی. دڵخۆشبوون. گەشانەوە.

ابتِهـال: تَـضَرُّع. تَوَسُّـل/ نزاکـردن. پاڕانـەوە. لاڵانەوە.

ابـتَهَجَ بــ: فَـرِحَ/ دڵـی خۆشـبوو. گەشـایەوە. شادمان بوو.

ابتَهَـر: بـالَغَ في الـشيء/ شتەکەی زل کرد. زۆری پێوەنا.

ابتَهَـر: تَبَجَّـحَ بــ. تبـاهى. ادَّعَـى كـذباً/ خـۆی هەڵکێشا. لافی لێدا. فیشاڵی لێدا. فشەی کرد.

ابتَهَـلَ: دَعـا وتَـضَرَّعَ/ نـزای کـرد. پاڕایـەوە. لالایەوە.

ابتِياع: شِراء/ کڕین. سەندن. ساندن.

أبَثَّ. الـسِرَّ أو الخبر: أطلعه. كاشَفَهُ/ نهێنیەکەی درکان. ئاشکرای کرد. بڵاوی کردەوە. جاڕی دا.

أبجَدَ: رتَّبَ بِحَسب ترتيب الأبجَدِيَة/ بە شێوەی ئەبجەدی ڕیزی کرد.

أبجدي: الألـف بـاء الأبجدي/ پیتـەکانی شێوەی ئەبجەدی.

أبجَدِيَة: الحروف الأبجدية. حـروف الهجـاء مُرَتَّبَـة حَسَبَ (أبجَـد. هَـوَز. حُطـى. كَلَمَـن. سَعفَص. قَرَشَـت. ثَخَذ. ضَظَغ)، ولكل حرف يقابله رقـم/ (ئەلف‌وبێ. ئابـێ. پیتـەکانی زمـانی عـەرەبی ڕیزکـراون بـە شـێوەی (ئەبجـەد. هـەوەز..) بـۆ هـەر پیتێـك ژمارەیەك دانراوە بەم جۆرە.

| أ | ١ | ه | ٥ | ح | ٨ | ك | ٢٠ | س | ٦٠ | ق | ١٠٠ | ث | ٥٠٠ | ض | ٨٠٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ب | ٢ | و | ٦ | ط | ٩ | ل | ٣٠ | ع | ٧٠ | ر | ٢٠٠ | خ | ٦٠٠ | ظ | ٩٠٠ |
| ج | ٣ | ز | ٧ | ي | ١٠ | م | ٤٠ | ف | ٨٠ | ش | ٣٠٠ | ذ | ٧٠٠ | غ | ١٠٠ |
| د | ٤ | | | | | ن | ٥٠ | ص | ٩٠ | ت | ٤٠٠ | | | | |

أبجَرَ: مُتَكَرِّش. كبير البطن/ ورگن. ورگ زل. ورگ داکەوتوو.

أبجَـرَ: بَـدين. ضَـخم/ قەڵـەو. شیـشمان. کەتـە. زەبەلاح.

أبَحَّ: بَحَّ. سَبَّبَ له خُشونة وغلظ في الصوت/ دەنگی گڕ بوو.

أبَحّ: مبحوحُ الصوت. أجَشّ. خَشِن الصوت/ دەنگ گڕ.

إبحـار: الـسَفَر بَحـراً/ کەشـتی کـرد بـە ئـاودا. بـە ڕێـی دەریـاوە ڕۆیـشت. بـە پـاپۆڕ و کەشـتی ڕۆیشت.

أبْحَر: سافر بَحْراً/ کەشتی کرد بە ئاودا. بە ڕێی دەریاوە ڕۆیشت. بە پاپۆڕو کەشتی ڕۆیشت.

أبحَرَت السفينة: أقْلَعَت/ کەشتیەکە کەوتەڕێ.

أبْخَر: من مكان رائحة فَمِه كريهاً. كريه رائحة الفم/ دەم بۆگەن.

أبخَق: خێل

أعوَر. بعينٍ واحدة/ یەك چاو. کوێر.

أبَـدَ بالمكـان: أقـام/ گلـی خـواردەوە. مایـەوە. لـە جێگەکەی خۆیدا مایەوە و ژیا.

أبَـدَ. أبِـدَ الحیـوانُ: تَـوَحَّشَ/ ئاژەڵەکـە هـار بـوو. کێوی بوو. دڕ بوو.

آبِد: ضارٍ. مُتَوَحِّش/ هار. کێوی. دڕندە.

أبَـدَ: سَـرمَدَ. خَلَـدَ/ مایـەوە. نـەمر بـوو. بـەردەوام بوو.

أبَد: دَوام. خُلود/ هەمیشەیی. مانەوە.

إلى الأبَـد: أبَـدَ الـدَهرِ. دائمـاً/ هەمیـشە. هەمووکات.

الى أبَـد الآ بـدين. الى دَهـر الـداهرين/ تـا هـەتا هەتا. هەتا هەتایە.

أبَداً: قَطّ. مُطلقاً/ نا. نـەء. هـەرگیز. بەڕای بەڕای. هیچ جارێك. نەخێر.

أبداً: دائماً/ هەموو کات. هەمیشە.

أبدأ: خَلَقَ/ دروستی کرد. پێکی هێنا.

أبدأ: أتى بجديد. إستَحدَثَ/ شتی تـازەی هێنایـە کایەوە.

أبـدى: أظهـر/ دەری خـست. پیـشانی دا. ڕایگەیاند. دەری بڕی. خستیە ڕوو.

أبـدى لـه صَفحَتَهُ: أظهَرهـا/ خـۆی ئاشـکرا کـرد. خۆی ناسان.

إبداء: إظهار/ دەرخستن. پیشاندان. ڕاگەیاندن. دەربڕین. خستنە ڕوو.

إبـداع: إبتکـار. إخـتراع/ داهێنـان. دۆزینـەوە. دروستکردن. بەدەوکاری. ئەفراندن.

إبدال: إستبدال. تَعويض. إستعاضة/ خستنەبری.

إبدال: إستبدال. تغيير/ گۆڕین.

آبِدَة: الشيء الغَريب/ شتێکی نامۆ، سەیر.

أوابِد الكلام: غرائبه/ قسەی سەیر.

أوابِد الشعر: مالا تُماثِل جودتـه/ هۆنراوەی بێ هاوتا. دانسقە. دەگمەن.

آبِدة: وَحش/ دڕندە. کێوی.

آبِـدة: الداهيـة/ بـەلا. کارەسـات. ڕووداوی دڵتەزێن.

أوابد الدنيا: دواهيها/ بەلا و کارەساتی ڕۆژگار.

أبْـدَعَ: أجـاد في عملـه/ وەسـتایی نوانـد. کـارێکی پوختی کرد. بە دڵ کاری ئەکرد. دڵکار بوو.

أبـدَعَ: إبتـدعَ: أتـى بالبِدعَـة (عقيـدة تخـالف الإيمان) باوەڕێکی ئاینی تازەی هێنایە کایەوە.

أبدَلَ: غَيَّرَ/ گۆڕی. گۆڕیەوە.

أبـدلَ عُقوبَـةً بمادونهـا: خَفَّـضَها/ سـزاکەی کـەم کردەوە.

أبَـدي: دائـم. خالـد. أزَلـي/ هەتاهـەتا. هەمیشە. هەمووکات. بەردەوام.

أبَدِيَة: أزَلِيَة/ هەتاهەتایی. هەمیشەیی.

أبَرَ: لَدَغَ/ پێوەی دا. گەستی.

أبَـرَ: إفتَـرَى. إغتـاب/ بوختـانی کـرد. دووزمـانی کرد. قسەی هەڵبەست.

أبَـرَ: أبَّـرَ: لَقَّحَ النبـات/ ڕوەکی چاککرد. تۆوی نێرەی کرد بەسەر گوڵە مێیەکاندا.

أبرَ. وفى. انجزَ. أتمَ/ بەجێی هێنا. بردیە سەر. پاراستی. بەوەفا بوو.

أبرَّ الله حج فلان: قَبلهُ/ خوا حەجەکەی لێ قبولْ کرد.

أبرأ من: حلَّ. حرَرَ. أعفى/ بەخشی. ڕزگاری کرد. سەرفرازی کرد. ئازادی کرد. گەردنی ئازاد کرد.

أبرأ الجريحَ والمريض: شَفاهُ/ چاکی کردەوە.

إبراء: إعفاء/ بەخشین. لێخۆشبوون. ئازادکردن. گەردن ئازادکردن.

إبراء: شفاء/ چاکبوونەوە. چاکردنەوە.

إبراء. ذمَّة: براءة/ گەردن ئازادبوون. ڕزگاربوون.

إبراز: إظهار/ دەرخستن. خستنەڕوو. پیشاندان.

إبراز: نشر. إصدار. طبع/ دەرکردن. بڵاوکردنەوە. چاپکردن.

إبراز: تبرُز. تغوُط/ گووکردن. ڕیان.

إبراق: إرسال برقى/ (بروسکە. تەلەگراف) ناردن.

إبـرام: إقـرار. مُصادقة/ پێکهـاتن. چەسـپاندن. سەلماندن. ڕێکەوتن.

إبرام: عَقد/ بەڵێننامە. قەواڵە.

وَثيقة إبرام/ بەڵگەنامەی پێکهاتن.

إبرة: أداة مُحدَّدة الرأس/ دەرزی.

إبرة: أداة خياطة الأكياس. مخيط/ سوژن. سوزن.

إبرة: أداة خياطة الملابس/ دەرزی دروومان.

إبرة: أداة خياطة ونسيج الحذاء الشعبي/ تەبەتە. تەبەنە. دلێران.

إبردة: أداة الحياكة. شيش الحياكة/ شیشی چنین.

إبرة: أداة تعيين الاتجاهات. إبرة الملاحة. البوصلة/ قیبلەنما.

إبرة الحشرات والعقرب: أداة اللَدغ/ چزوو. زچرق. ئەستنگ. درێشوکە.

إبرة: حُقنة زرق طبية/ دەرزی شرینقە.

إبرة مغنطيسية: البوصلة/ قیبلەنما.

إبرة النبات: شوك/ چقڵ. درك.

بَيت الإبرة: منبار. منبر/ دەرزی دان.

شُغل الإبرة: خياطة/ دروومان. دروون.

شغل الإبرة: تطريز/ چنین.

الوَخز بالابرة/ دەرزی ئاژن.

أبرَدَ: أرسل بالبريد/ بە پۆستەدا ناردی.

أبردَ الشيءَ بَردَهُ/ ساردی کردەوە.

أبرَدَت السماء: أمطرت بَرداً/ تەرزەباری.

أبـرَدَه المـرض: أضـعفهُ/ نەخۆشـی لاوازی کـرد. بێهێزی کرد. هێزی لەبەر بڕی.

أبرَزَ: اظهرَ/ دەریخست. پیشانی دا. خستیەڕوو.

أبرَزَ: أنتأ/ دەری پەڕان. هەڵی تۆقان. ئاوسانی.

أبرَزَ: نَشرَ. أصدرَ/ بڵاوی کردەوە. لە چاپی دا.

أبرَزَ: تَغوَطَ/ گوی کرد. ڕیا.

أبرَش: أبقَع. أرقَط/ بەڵەك. پەڵاوی. کونج. شلْ.

أبرَشـيَّة: أسـقفيَّة. دائـرة الكنيـسة/ خانـەی ئایندارانی دیان لە کەنیسە.

أبرَص: قَمر/ مانگ.

أبرَص: مُصاب بالبَرَص/ بەڵەك. بازەڵە.

أبـرَص: سـام أبـرص. ابـو بـريص/ شـەوگەرد. بێلەکەرە.

أبـرَق: مـا إجتمـع فيـه الـسواد والبيـاض/ ڕەش و سپی. ماش و برنج.

أبرَقَ: أرسَلَ برقيَة/ بروسکەی نارد.

أبـرَقَ: أصـابهُ بـرق/ (هەورەتریـشقە. تریـشقە. بروسکە)ی لێدا.

أبــرَقَ وَجهُــهُ: أشــرَقَ/ شــەوقی ئەدایــەوە. ئەبریسکایەوە.

أبرَقَ عن وجهه: كَشفَ/ ڕووی دەرخست.

أبرَقَت المرأة: تَزَيَّنَت/ ئارایشتی خۆی دا.

**أبرقت السماء:** ومضت/ چەخماخەی دا. بروسکەی دا.

**ابرق بسیفه:** أشاربه/ شمشێرەکەی ڕاوەشان. هێمای پێکرد.

**أبرك:** اناخ/ یخی دا. چۆکی پێدادا. خستیه سەرچۆك.

**أبرم:** أقرّ على/ چەسپاني. جێگیری کرد. بڕیاری لەسەر دا.

**أبرم:** عقد/ گرێی دا. بەستی. ڕێك کەوتنەکە پێکهات. بەسترا.

**أبرم:** فتل. جدل/ هۆنیەوە. بایدایەوە. کردی بە (کشتەك. پرچ).

**أبرم:** أضجر. ضایق/ (بێزار. هەراسان. قارس. قالس. جاڕز. توڕە)ی کرد.

**إبريّ الشكل:** مُدبّب/ نوك تیژ. نوکدار.

**إبريّ:** بائع الإبر/ دەرزی فرۆش.

**إبريَة:** قشرة الرأس/ کرێش.

**إبريج:** ممخضة/ مەشکە.

**إبريز:** ذهبٌ خالص صاف/ (ئاڵتون. زێڕ)ی تێزاب.

**إبريزي:** ذهبي/ ئاڵتونی. زێڕین.

**إبريسم. إبريسم:** حرير/ ئاوریشم. ئارمووش. هەڤریشم. ئاڤرمووش.

**إبريق:** إناء له عروة وفم/ مەسینە. کتلی. لوولێنە. مەسین.

**إبريق الشاي/** چاپەز. قۆری.

**إبريل:** شهرنیسان/ مانگی شەستەباران. گوڵان. نیسان.

**أول إبريل:** يوم الكذب/ ڕۆژی درۆی نیسان.

**أبزخ:** الصدر الخارج والظهر الخاسف/ سنگ دەرپەڕیو.

**أبزن:** حوض لغسل الوجه واليدين/ جورنە. دەستشۆر.

**إبزيم:** مشبك/ ئاوزونە. بەرمزانە. بەرمزوانە. بزیم.

**ابشر بـ:** فرح بـ/ پێخۆشحاڵ بوون.

**ابشر:** بلّغ البشرى/ مژدەی خۆشی دا. مژدەی هێنا.

**أبشر الشيء:** قشّرهُ/ پاکی کردەوە.

**أبشرت الارض:** أخرجت النبت/ ڕوەکی تیاڕوا. سەوز بوو.

**أبشم:** أتخم/ مریوو. زۆری خوارد.

**إبصار:** رؤية/ بینین. سەیرکردن.

**أبصر:** رأى. لاحظ. نظر الى/ بینی. سەیری کرد. چاوی پێکەوت.

**أُبض:** باطن الركبة/ ڕەفیسك.

**أبضهُ:** شدّ يديه/ دەستی بەستەوە.

**إباض:** حبل/ پەت. پەتی بەستنەوە.

**إبط:** باطن الكتف/ باخەڵ. بنباخەڵ. بنهەنگڵ. بندەست. کلێشە. بنکلێشە. بنکەفش. بنکەش. قۆڵنج.

**أبطأ. بطوء:** تأخر/ دواکەوت.

**أبطأ:** تباطأ. تأنّى. توانى/ خۆی دواخست. تەمەڵی کرد. خاوەخاوی کرد.

**أبطأ:** أخّر/ دوای خست. خاوی کردەوە.

**ابطاء:** تأخير. توان/ دواخستن. خاوەخاوکردن.

**إبطال:** إلغاء. فسخ/ هەڵوەشاندنەوە. تێکدان. پوچکردنەوە. پەشیمان بوونەوە.

**إبطال:** تعطيل المفعول. إحباط/ پەکخستن. لەکارخستن. پوچکردنەوە.

**أبطح:** واد عريض. مسيل واسع/ چەم و ڕوباری پان و بەرین.

أبطحُ: مُنبَسط. مُستوي/ تەخت. تەختان.

أبطر: أدهَش/ سەری سوڕمان. واقی وڕمان.

أبطرە: حَيْرَهُ بَطراً. تاكراً للجميل/ كردی بە سپڵە. بە پێنەزان.

أبطرَهُ ذرعَهُ: حمّلَهُ فوق طاقتـه/ لە توانای خۆی زیاتر باری (لێنا. گرانتر كرد).

أبطَلَ: ألغى. فسخَ/ هەڵیوەشانەوە. تێكی دا.

أبطَلَ: عطَّلَ. أحبَطَ/ پەكی خست.

أبطَنَ. أخفى/ شاردیەوە.

ابطنَ: بطَنَ الثوبَ: جعَلَ لـهُ بطانـةً/ بـەری بۆكرد. بەری پیاكرد. بەری پێوەنا. ناوی بۆ كرد.

أبعاد: بُعد. مَسافة/ ماوە.

أبعاد الشكل: تعيين طول وعرض وارتفـاع الـشكل/ درێژی و پانی و بەرزی. لاكانی شێوە.

متساوي الابعاد/ پەل یوون یەك. هاودووری.

إبعاد: إقصاء. عَزْل/ دەركردن. لابردن.

إبعـاد: نَفـي/ شـاربەدەر كـردن. دورخـستنەوە. ڕەمەندكردن.

إبعـاد: اسـتثناء/ كەلاخـستن. بـواردن. پەڕانـدن. سڕینەوە.

أبعدَ: أقصى. عزَلَ/ دەریكرد. لایبرد.

أبعدَ: نفى/ شاربەدەری كرد. دووری خستەوە. ڕەمەندی كرد.

أبعدَ: إستثنى/ كەلای خست. بواردی. پەڕانـدی. سڕیەوە.

أبعَدُ: أقصى: ضد أقرب/ دوورتر.

الأبعد: الأقصى/ دوورترین. هەرەدوور.

أبغضَ: مقَتَ. كرِهَ/ ڕقی بوەوە. كینـەدار بوو. ڕق و قینی لێبوو. خۆشی نەویست.

أبَـقَ. أبـقَ: هَـرَبَ/ ڕایكـرد. هـەڵهات. ڕۆی. بـۆی دەرچـــوو (ڕاكردنـــی ئیـــشكەر لەدەســـت خاوەنەكەی).

آبق: هارب/ ڕاكردوو.

أبق: نبات الكتان/ كەتان.

أبقـى: أدام. حـافظ علـى/ هێشتیەوە. پاراسـتی. دەستی پیاگرت.

أبقى: تركهُ كما هو دون تغيير/ دەستكاری نەكرد.

أبقى: حَجزَ/ گلی دایەوە. هێشتیەوە. هێڵایەوە.

أبقىَ عليه. أبقـى علـى حياتـه: رَحِمَهُ وشفَق عليـه/ بـەزەیی پیاهاتـەوە. هیـچی لـێ نـەكرد. ژیـانی پاراست.

إبقـاء: إدامـة. مُحافظـة/ هێـشتنەوە. پاراسـتن. دەستپیاگرتن. گلدانەوە. هێڵانەوە.

إبقاء: ترك/ دەستكاری نەكردن.

إبقاء على حيـاة شخص: حمايـة حيـاة شخص/ هیچ لێنەكردن. بەزەیی پیاهاتنەوە. ژیان پاراستن.

أبقَر: بَقَرَ. شَقّ/ هەڵی دڕی.

أبقعُ اللـون: مُبَقّـع. أرقـط. أبـرش/ پـەڵاوی. بەڵـەك. منجڵ.

أبْكى: جَعلَهُ يبكي/ گریانی. هێنایە گریـان. كردیە گریان.

إبكـار: تـبكير. بلـوغ أو نُـضج قَبـلَ الأوان/ زوو پێگەیشتن.

أبكَـرَ: بكَّـرَ: أسـرَعَ. تَقَـدَّمَ/ زووی كـرد. زوو بـە ئەنجامی گەیان. زوو گەیشت. زوو هەستا.

أبكَمَ: أسكَتَ. أخرَسَ/ لاڵی كرد. بێدەنگی كرد.

أبكَم. أخرس/ لاڵ لاڵە پەتە.

أبَلَّ مِن مرَضِهِ: شُفِيَ. بَرِىءَ/ چاكبووەوە.

إبِل. إبْل: جِمال/ وشتر. حوشتر. هێشتر. سارە.

إبلى: صَيَّرهُ بالياً/ ڕزاني. شڕی کرد. شڕووڕی کرد. کۆنی کرد. شیکردەوە.

اُبْلي: إبتلى بمِحْنة أو مُصيبة/ تووشی بەڵا بوو. گرفتار بوو. دووچار بوو. گیرۆدە بوو. تێوەگلا.

أبلى بلاءً حسناً: أظهر بأسه. بَرهَن شجاعته/ ئازایەتی و چاپووکی نواند.

إبلاغ: إخبار/ هەواڵ گەیاندن. ڕاگەیاندن. پێوتن. ئاگادارکردن.

إبلاغ عن: وشاية: خەبەرلێدان. بوختان بۆکردن. بەدەمەوە هەڵبەستن.

إبلال: شفاء/ چاکبوونەوە.

أبلج: أشرقَ و أضاءَ. بزغ/ شەبەقی دا. سپێدەی دا. دنیا ڕووناک بووەوە.

أبلج: مُشرق. صافٍ. واضح/ ڕووناک. شەوقدار. پرشنگدار.

أبلج: مُفترق الحاجبين/ بڕۆبڵاو.

أبلع: جعَلهُ يبلع/ پێی قووت دا. پێی هەڵلووشی. کردی بە قوڕگیا.

أبْلغ الخبَر: أوصَلَه/ هەواڵەکەی گەیاند.

أبْلغ عنه: خبَّر/ خەبەری لێدا.

أبلغ عنه: وشى به/ بوختانی بەدەمەوە کرد. بوختانی بۆ کرد. بۆی هەڵبەست.

أبلق: أرقط. مُبقّع. في لونه سَواد وبياض/ بەڵەک. ڕەش و سپی. ماش و برنج. بازوو.

أبله: ضعيف العقل. أحمق. غبي/ گێژ و وێژ. کەودەن. گێل. گەمژە. مێشق. وڕ.

إبليس: شيطان/ ئەهریمەن. شەیتان.

إبليس: شرّير/ بەد. نەگریس. پیاوخراپ. شەڕانی.

إبليسي: شيطاني/ خاوەنی کردەوە و ڕەفتاری شەیتان.

أبْنَ الميت: أثنى عليه. مَدحَهُ بعد موته/ ستایشی مردووەکەی کرد. لەسەری خوێند. بۆی لاوانەوە. پیاهەڵدا.

أبَنَهُ. تأبَّنهُ: إقتفى أثره. ترقّبهُ/ شوێنی کەوت. شوێن پێی هەڵگرت. بەدوایەوە بوو.

إبن: الولد الذكر/ کوڕ. ڕۆڵە. منداڵ. زا. نێرینە. فرزەند.

إبن الإبن: حَفيد/ کوڕەزا.

إبن الأخ/ برازا. کوڕی برا.

إبن الأخت/ خوشکەزا. کوڕی خوشك.

إبن آدم/ إنسان. مرء. شخص. رجُل/ پیاو. مرۆڤ.

إبن آوى: نوع من الثعالب/ چەقەڵ.

إبن بَريح: غُراب/ قەلەڕەشکە.

إبن بَطنه: هَمُّهُ مَصروف إليه/ چلێس. نەوسن. کوڕی ورگ. چی دەست ئەکەوێ ئەیخوا.

إبن البنت: سِبْط/ کچەزا. کچی کچ.

إبن بالتبني: مُتبنى/ بەخێوکراو. زڕکوڕ.

إبن بالرضاع/ کوڕی شیری.

إبن بَجْدَتها. إبن بجدة الأمر: عالم به/ زانیار. تێگەیشتوو. ئاگاداری کارەکەیە.

إبن بقيع: الكلب/ سەگ.

إبن بلد: إبن الوطن/ هاوڵاتی. کوڕی وڵات.

إبن بلد المرء: إبن مَدينته/ خەڵکی شارێکن.

إبن جَلا: الرجل المشهور/ پیاوی بەناوبانگ. ناودار. ناسراو.

إبن الحرام: غير شرعي/ زۆڵ. بیژی.

إبن الحرب: محارب. مقاتل/ جەنگاوەر. سەرباز.

إبن الخال/ خاڵۆزا. کوڕی خاڵ.

إبن الخالة/ پوورزا. کوڕی پوور. کوڕی خوشکی دایك.

ابـن ذكـاء: الـصبح/ بـەیان. بەرەبەیان. بـەیانی. سپێدە. تاریکوڕوون.

ابن الزنا: غير شرعي/ زۆڵ. بیژی.

ابن الزوج. ابن الضرة. ربيب: هەنەزا. کوڕی مێرد لە ژنێکی تر.

ابن الزوجة: ربيب/ هەنەزا. کوڕی ژن لە پیاوێکی تر.

ابـن سـاعته: إرتجـالي. بـلا تحـضير/ لەبـەر. لەبەربورە.

ابـن سـاعته: زائـل. وقـتي/ هـەر ئەوکاتـە. بـۆ ماوەیەکی کەم.

ابن السبيل: مُسافر/ ڕێبوار. گەشتیار.

ابـن الـسبيل: مُتـشرد/ ئـاوارە. بـەرەلا. کـۆڵانی. دەربەدەر. بێلانە. لانەشێواو.

ابن الطود: الصدى/ زایەڵە. دەنگدانەوە.

ابن عرس: حيوان القُندس/ دەڵەك.

ابن العم/ ئامۆزا. کوڕی مام.

ابـن العمـة/ پـوورزا. کوڕی پـور. کـوڕی خوشـکی باوك.

ابن غير شرعي: نُغل/ زۆڵ. بیژی.

ابن يومه: لايفكر بغده/ کوڕی ڕۆژ. کەمتەرخەم. بێباك. بێبار.

ابنة: بنت/ کچ. زا. فرزەند. دۆت. کیژ.

ابنة الأخ/ برازا. کچی برا.

ابنـة الأخت/ خوشـکەزا. کـچی خوشـك. خـوارزا. خوارزی.

ابنة البنت/ کچەزا. کچی کچ. وارزا.

ابنة الخال/ خاڵۆزا. کچی خاڵ.

ابنة الخالة/ پوورزا. کچی پـوور. کـچی خوشـکی دایك.

ابنة الزوج/ ربيبة/ هەنەزا. کچی مێرد لـە ژنێکـی تر.

ابنة الزوجة: ربيبة/ هەنەزا. کچی ژن لە پیاوێکی تر.

ابنة الضرة/ ربيبة/ هەنەزا. کچی مێرد لـە ژنێکـی تر.

ابنة العم/ ئامۆزا. کچی مام.

ابنة العمة/ پوورزا. کچی خوشکی باوك.

أبنوس: خشب وشجر/ دار و درەختی ئەبەنوس.

أبه لـ. أو بـ: إكترث. إهتم/ بایەخی پێدا. گوێی دایە. گرنگی پێدا. بەتەنگەوەهات

لايُؤبـه لـه أو بـه: لايلتفـت. لايكتـرث/ گـوێی نادرێتێ. بایەخی پێنادرێ. بە تەنگیەوە نایەت.

إبهام: غموض. إلتباس/ نادیاری. ئاڵۆزی.

إبهام اليد: أكبر الأصـابع/ پەنجەگـەورەی دەست. کەڵەموست. تلیابەرانی.

إبهـام الرجل: أكبر الأصـابع/ پەنجەگـەورەی پـێ. کەڵەموستی پێ.

أبهت: جعلـهُ باهتـاً. حيّـرهُ وأدهـشهُ/ واقـی وڕمـان. سەری سوڕمان. بزرکانی.

أبهـت: بهـت. دهـش/ واقـی وڕمـا. سەرسام بـوو. سەری سوڕما. هەڵبزرکا. ڕاما.

أبه: عظمة. فخامة/ دەبدەبە. کەشخەیی. لووت بەرزی. تەنتەنە. کەش و فش.

أبهج: أفرح/ دڵی خۆش کرد. گەشانیەوە.

أبهـر: إسـتغنى بعـد الفقـر/ بووژایـەوە. پـاش کەمدەستی دەوڵەمەند بوو. هەڵکرا.

أبهر: جاء بالعجب/ شتی سەیری کرد.

أبهر: تلون في أخلاقه/ بێباری نواند.

أبهر: ظهر/ پشت.

أبهر: شريان أبهر/ شاخوێنبەر.

أبْهـــران: عرقـــان يخرُجـــان مـــن القلـــب دووشاخوێنبەر.

ابْهنطه الحمل أو الأمر: أثقله وسبب له مشقّةً/ باری گرانبوو. کاری سەخت بوو.

أبْهم: أخفى. عمَ. ضدّ أوضحَ/ شاردییەوە. دەری نەخست. دەری نەبڕی.

أبْهم الكَلام: تكلّمَ بغموض/ تێکەڵ و پێکەڵ قسەی کرد. دەری نەئەبڕی ئەڵێ چی.

الأبوان: الوالدان/ باوك و دایك.

أبُوّة. والديّة. صفة الأب/ باوکێتی.

أبويّ: والديّ/ باوکم و دایکم.

أبيّ: مُترفّع. أنوف/ ڕوح زل. لووت بەرز. بەفیز.

أبيضّ: ضد إسودّ/ سپی بووەوە.

أبيَض: ضد أسود/ سپی. چەرمگ.

أبيض: بريء: خالٍ من العيوب/ پاك. بێ خەوش.

أبيض الشعر/ سەرسپی. پیر.

أبيض البشرة/ سپی پێست. کاڵ.

أبيض ناصع: مُشرق/ زۆرسپی. ئەبریسکێتەوە.

أبيض: غير مكتوب/ نەنوسراو. کاغەزی سپی.

إنقـلاب ابـيض: تغـيير الحُكـم سـلمياً/ گـۆڕانی کۆمەلأیەتی سیاسی بێ خوێن ڕشتن.

الخيط الابيض: الفجر/ بەرەبەیان. تاریك و ڕوون.

ذهب أبيض: بلاتين/ پلاتین.

رِقّ أبـيض: عبوديــة الانـسـان ابـيض البـشرة/ کۆیلەیەتی سپی پێست.

رقيق أبيض: عبد لون بشرته أبيض/ کۆیلەی سپی پێست.

موت أبيض: فُجائي/ مەرگی کوت و پڕی.

ألبيت الابيض: مقرّ رئيس جمهورية الولايات المتحدة/ کۆشکی سپی لە ئەمریکا.

ثـورة بيـضاء: حركـة سياسـية بـدون إراقـة دمٍ/ شۆڕشێکی بێدەنگ. بێ خوێن ڕشتن.

رايـة بيـضاء: رايـة الهُدنـة والـصلح أو الاستـسلام ئاڵای ئاشتی.

كذبة بيضاء: كذبـة بريئـة/ درۆی بێزیان. درۆی سپی.

كُرَيّة بيضاء: خليّة الدم البيضاء/ خڕۆکەی سپی خوێن.

ليلة بيضاء: مُقمرة/ مانگەشەو. شەوی ڕووناك.

يد. أياد بيضاء: مُحسنَة. فاعلة خير/ دەستبڵاو. خێرومەند. دەست بەخێر.

أبيضاض: تَبيض/ سپی بوونەوە. سپی کردنەوە.

ألأبيضان: اللبن والماء. اللبن والشحم. الخبز والماء/ شیر و ئاو. شیر و پیو. نان و ئاو.

الأبيـضين: شـهرين أو يـومين/ ١٣و ١٤ی مـانگی عـەرەبی یـان ١٤و ١٥ی مـانگی عـەرەبی دوو مانگ. دوو ڕۆژ.

آتٍ. الآتـي: مُقبل. قـادم. وافـد/ هـاتوو. داهـاتوو. ئاینده. ئەوەی کە دێت.

كالآتي. كما يلي. كما يأتي/ وەکو داهاتوو. وەکو ئەمەی خوارەوە. وەکو لای خوارەوە.

أتى: جاء/ هات.

أتى به: أحضرهُ/ هێنای. هاوردی. ئامادەی کرد.

أتى الرجُل: عَزبـه/ بەلایا تێپەڕی. چوو بۆ لای. سەری لێدا.

أتى: حدث. جَرى/ ڕوویدا.

أتـى الـشيءَ أو العمـلَ: فعلـهُ. قـام بـه/ کـردی. ئیشەکەی کرد. جێبەجێی کرد.

أتى جُرماً: إرتكبه/ تاوانی کرد.

أتـى عليـه الـدهرَ: أهلكَـهُ/ زەمانـە ڕسـوای کـرد. پەرێشانی کـرد. هیلاکـی کـرد. شـەکەتی کـرد. پەکی خست.

أتـى علـى الـشيء أو الأمـر: أتمَّـهُ. أنهـاهُ/ تـەواوی کرد. کۆتایی پێهێنا.

أتـى المـرأةَ: غـشيها. دَخَلَ عليهـا/ دەسـتی لەگـەڵ ئافرەتەکە تێکەڵ کرد. چووە لای. لاقەی کرد. گای.

أتــى عليـــه: وَشـــى/ بوختــانی بــۆ کــرد. بــۆی هەڵبەست.

أتى على: إستنفدَ/ بڕایەوە. کۆتایی هات. کۆتایی پێهێنا.

أتـى علـى الأخـضر واليـابس/ تەڕووشـکی پێکـەوە سوتان. هیچی نەمێشت.

أتى على ذكر كذا: ذكرهُ/ باسی کرد. ناوی هێنا.

أتى الشجرُ: طلعَ ثمرهُ. كثر حمله/ درەختەکە بەری گرت. بەرەکەی زۆر بوو.

أتاهُ الشيءَ وبه: أعطـاه إيـاه/ دايـە. پێـی دا. بۆی هێنا.

مايأتي: كالآتي/ وەکو داهاتوو.

فيما يأتي. في مايأتي. فيما يلي/ لـە داهـاتوو. لـە خوارەوە. لەمەودوا.

آتـى: وافـقَ. لائـم. ناسب/ قایل بوو. ڕازی بـوو. گونجا.

آتى: أعطى. زوَّدَ/ دای. پێی دا.

آتى ألزكاةَ: أدى الزكاةَ/ زەکاتی دا.

إتـــاء الأرض: ريعهــا وحاصـلها/ بـەروبومی زەوی. پیت و هاتی زەوی.

أتاحَ لـ.: سَمَحَ لـ/ ڕێی دا. هێشتی.

أتــاحَ لـــ: سـهّلَ. يـسّرَ/ ئاسـانی کـرد. لـوانی. گونجانی.

أتاحَ لـ. مكّنَ من. قـدّرَ على/ پێـی کـرا. بۆی کرا. توانی.

أتاحَ لـ: أعطى. وَهَبَ/ بەخشی. پێی دا.

أتــاحَ الفرصَـة: أعطـى الفرصَـة أو المجـال/ بـواری پێدا. دەرفەتی دایە. ڕێگەی دا.

إتاحة الفرصَة: تهيأ/ هەل هەڵکەوتن. بۆلوان. بۆ ڕێك کەوتن.

أتيحَتْ لـه الفرصَـة: أتـيحَ لـهُ النجـاح/ هـەلی بـۆ هەڵکەوت. دەرفەتی باشی دەستکەوت.

إتّأدَ: تمهَّلَ. تأنّى/ لەسەرخۆ بوو. شێنەیی بوو.

أتـأرَهُ النظر أو البصر: تفـرّس وتطلّـع فيـه/ چاوی تێبڕی.

أتان: حمار. مُطي/ ماکەر. دێڵەکەر.

إتاوة: ضريبة/ باج.

إتاوه: رشوة/ بەرتیل. سەرانە. هەستە. خاوە.

أتاهَ: تيَّهَ. أضلَ/ ونی کرد.

أتاهَ: تيَّهَ. حيّرَ/ سەری سوڕمان. سەرسانی کرد.

إتب: قميص بغير كمين/ کراسی بێ قۆڵ.

إتّبـــاع: ســـيرخلف كـــذا/ شـــوێنکەوتن. بـــە شوێناڕۆیشتن.

إتّباع: تبنّ/ پەیڕەوی کردن.

إتّبـاع: إلتـزام. تقيُّـد/ پەیوەنـدی. پەیوەسـتی. بەستنەوە. پەیوەندبوون. ناچاری.

إتّباع: إقتداء بـ/ چاولێکردن. لاسایی کردنەوە. شوێن کردار کەوتن.

إتّبـاع: مُطـاردة. مُلاحَقَـة. تعقيـب/ بەدواداگـەڕان. شوێنکەوتن.

إتّباع: إلحاق. ربط/ پەیوەندی بوون. پێوەبەستن. بەدوادا هاتن. پاشکۆ.

إتّبعَ: ألحقَ/ بەدوای هێنا. کردی بە پاشکۆ؟

إتّبع: تبع. مشى خلفَهُ/ بەدوایا ڕۆیشت. شیوێنی کەوت. دوای کەوت.
إتّبع: سارَ على. تَبنّى/ پەیڕەوی کرد. ڕێڕەوەکەی گرت.
إتّبع: إلتزم. تقيّد/ پەیوەند بوو. پەیوەست بوو. بەستراوە بوو. ناچار بوو.
إتّبع: إقتدى بـ. حذا حَذوَهُ. إقتفى أثرَهُ/ پەیڕەوی کـرد. وەکـو ئـەوی کـرد. بـەڕێ و شـوێنەکەیا ڕۆیشت.
أتبَـعَ بــ: ألحـقَ/ هـی تـری (شـوێن خـست. خستەسەر).
إتّجـار: مُتـاجرة. بيـع وشـراء/ بازرگـانی. کـڕین و فرۆشتن.
إتجـاه: جِهَـة. ناحيـة. صَـوْب/ ئاقـار. ڕێبـاز. دەوروبەر. ناوچە. شوێن.
باتّجاه: نَحوَ/ ڕوەو.
أتجـرَ: تـاجَرَ: تعـاطى التجـارة/ بازرگـانی کـرد. خەریکی کڕین و فرۆشتنە.
إتّجَهَ الى: أمالَ الى. أدار وجهَهُ نحو/ ڕووی تێکرد. ڕووی بۆ وەرگێڕا. وەرچەرخا.
إتحاد: وفاق. أُلفة/ یەکێتی. یەکبوون. یەکگرتن. ڕێکەوتن. یەکەتی. هەڤگرن.
إتّحاد الآراء. إتّفاق واجماع الرأي/ یەك دەنگ. یەك ڕای. یەکبوون.
بالاتجـاه. مَعـاً. بالاشتراك/ پێکەوە. بەیەکەوە. کۆمەکی.
إتّحَـدَ: إلتـأمَ. إنـضمَّ. إقتَـرَنَ/ یـەکیان گـرت. ڕێکەوتن. پێکهاتن.
إتّحد الـشيئان. صـارا شيئـاً واحـداً/ بوون بە یـەك. یەکانگرت. چوون بەناو یەکدا.

إتّحَـدَ القَــومَ. إتّفَقــوا/ ڕێکـەوتن. پێکهـاتن. یەکیانگرت.
أتحَــفَ: أهــدى. قــدَّمَ هديَــةً/ خـەڵاتی کـرد. پێـشکەشی کـرد. دیـاری بەخـشی. خـەڵاتی بەخشی.
إتّخَـذَ إجـراءاتٍ أو تـدابيرَ: اسـتعملها/ پێویـستی بەکارهێنا.
إتّخذَ شَكلاً: أخذ شكلاً/ شێوەیەکی وەرگرت.
إتّخذَ قراراً: إستعمل أو قـرَّرَ قـراراً. صمَّمَ/ بڕیـاری خۆی دا. خۆی ساخ کردەوە.
إتّخـذَ موقفـاً: ثَبّـتَ حالتَــهُ/ هەڵوێـستی خـۆی دەربڕی. ساخکردەوە. هەڵوێستی خۆی دا.
إتّخذَ صـديقاً: جَعَلـهُ صـديقاً/ کردی بە هـاوڕێی. بەهاوەڵی.
أتخَـمَ: أفعَـمَ: مـلأ جـداً/ زۆری تێکرد. زۆر پـڕی کرد.
أتخَمَـهُ الطعـامُ: سبّبَ لـه تُخمـاً/ زۆری خـوارد. مڕیوو. گرفتی کرد. بای کرد. ورگی ئاوسا.
إتّخَـمَ. أتخَـمَ: ثَقُـلَ عليـه الاکـل/ ورگـی ئاوسـا. گرفتی کرد. ناڕەحەت بوو. پێی نەکەوت.
أتْـرَبَ: غَبَّـرَ: وَضَـعَ عليـه الـتراب/ خۆڵی پیاکرد. خۆڵاوی کـرد. تۆزاوی کـرد. تـۆز و خـۆڵی کـرد بەسەرا.
أتْرَبَ: إغتنى. كَثُرَ مالُـهُ/ دەوڵەمەند بوو. بوو بە خاوەنی سامان و دارایی.
أتْرَبَ: إفتَقَرَ. قَلَّ مالُهُ/ هەژار کەوت.
أتْـرَحَ. أحْـزَنَ/ (دڵگـیر. خەفـەتبار. خـەمناك. پەست)ی کرد.
أتْرَسَ: أغلَقَ/ دایخست. کلۆمی دا.
إتّرَس بـ: إتّقَى بـ. احتمَى/ خۆی پێ پاراست.
أتْرَغَ: افعَمَ. ملأ/ پڕی کرد.

إتّرع: صار مُترعاً. ملآن للحافة/ پڕبوو. لێوان بوو.

أترفه المالُ: أبطره. أفسده/ دارایی و سامان زەرانی. بایی کرد. دەستی دایە خراپە.

أترنج: ثُرنج/ درەختی توورنج.

إتّزان: رزانة. ئاغری. لەسەرخۆیی. هێمنی. مەنگی. سەنگین.

إتّزان: حصافة/ دانایی ژیری. کارامەیی.

إتّزر بكذا: لبسه/ لەبەری کرد. لە خۆیەوە ئالآن.

إتّزر: لبس الوزرة/ پەشتەمالی گرتەوە. گەڵ پۆشی گرتەوە.

إتّزر: ركب الإثم/ گوناهی کرد. خۆی گونهبار کرد. دەستی دایە خراپە و تاوان.

إتّزن: كان رزيناً (ئاقڵ ئاغر. دووربین. قورس. هێمن. مەنگ) بوو.

إتّزن: كان حصيفاً/ (قسەزان. دەمڕاست. دانا و ژیر و کارامە) بوو.

إتّزن: وزن. أخذ بالوزن/ کێشانەی کرا. بە کێشانە وەرگیرا.

إتّزن: توازن/ هاوسەنگ بوو. ڕێك وەستا.

إتّساع: إمتداد/ کشان. پان بوون. فراوان بوون.

إتّساع: رحابة/ فراوانی. پان و بەرینی.

إتّساق: تناسق. ترتيب. تنظيم/ ڕێکی. ڕێکوپێکی.

إتّسخ: تَوسّخ. صار وسخاً/ پیس بوو. چەپەڵ بوو.

إتّسع: إنفسح. عرض. تمدد/ پان بوو. پان بووەوە. فراوان بوو. تەنیەوە.

إتّسع لـ: إستوعب. حوى/ گرتی. جێی تیابووەوە. بەشی کرد.

إتّسع: صار غنياً ذا سعة/ دەوڵەمەند بوو. بوو بە خاوەنی سامان و دارایی.

إتّسق: صار متناسقاً. إنتظم/ ڕێکوپێك بوو.

إتّسم: وَسم بالكيّ. إكتوى/ داخ کرا.

إتّسم بـ: إتّصف. تميّز/ جیاوازیەکی هەبوو.

إتّسم: جعل لنفسه سمة/ نیشانەی بۆ خۆی دانا.

إتّشح: توشّح بكذا. لبسه/ لەبەری کرد. لە ملیەوە ئالآن. دای بە شانیا.

إتّشح: توشّح بالسيف. تقلده/ شمشێری (دا لە خۆی. کرد بە قەدیا. حمایەل کرد).

إتّشح: توشّح بكذا: لبسه/ لەبەری کرد. لە ملیەوە ئالآن. دای بە شانی.

إتّشح: توشّح بالسيف: تقلده/ شمشێری (دا لە خۆی. کرد بە قەدیا. حمایەل کرد).

إتّصال: إرتباط. ترابط/ پەیوەندی. پەیوەستی.

إتّصال: تواصل. تعامل. علاقة/ مامەڵە. پەیوەندی.

إتّصال: مُخابرة/ هەواڵ پرسین. پەیوەندی کردن بە یەکەوە. ڕاگەیاندن.

إتّصال: إستمرار. تواصُل/ بەردەوامی یەك بینە.

إتّصال جماهيري: إرتباط وتكتّل الناس/ پەیوەندی بیروباوەڕ. یەکگرتن.

إتّصال جنسي: جماع الإنسان. تسافُد. نزاء. مُضاجعة. مباضعة/ کۆبوونەوەی پیاو ژن. کاری سێکسی.

إتّصال: تماس. تلاصُق. مُلامسة/ بەریەك کەوتن. بەیەکا لکان. بەیەکەوە نوسان.

إتّصف بكذا: تحلّى به. تميّز به/ پێوەی ناسرا.

إتّصل: إرتبط/ پەیوەندی (لەگەڵ بەست. پێوە کرد).

إتّصل: إستمرّ. تواصَل/ بەیەکەوە بەسترابوو. بەردەوام بوو.

إتّصل بـ: لاصق. لامس. تاخم/ پێوەی نوسا. پیالکا بەری کەوت.

إتَّصَلَ بـه: خـابره/ تەلەفۆنی لەگەڵ. بە تەلەفۆن (لەگەڵی دوا. پەیوەندی پێوە کرد).

إتَّصل به الخبر: وصلهُ الخبر. علِمهُ/ هەواڵەکەی پێ ڕاگەیەنرا. زانی. پێی زانی.

إتَّـصلَ الی: إنتمـی الی. إنتَـسَبَ الی/ گەڕایـەوە بـۆ. پەیوەندی هەبوو لەگەڵ.

إتَّصَلَ الی: بَلَغَ. وَصَلَ/ گەیشت.

إتِّضاح: وُضوح. جلاء. صَفاء/ ڕوونـی. ئاشکرایی. دیاری. زانراوی. دەرکەوتن. ئاشکرابوون.

إتِّضاع: تَذَلُّل وَتَخَشُّع/ ڕسوایی. سەرشۆڕی.

إتَّـضَحَ: بـان وانکـشَفَ وانجَلـی/ ئاشـکرابوو. دەرکەوت. زانرا. ڕوون بووەوە.

إتَّـضَعَ: تَـذَلَّلَ وتَخَـشَّعَ/ ڕسوا بوو. سەری شۆڕ کرد.

أتعاب: أجرة/ کرێ. مز. مزە. هەقدەست.

أتعَبَ: أرهَقَ. اجهَدَ/ (هیلاك. ماندوو. شەکەت)ی کرد.

أتعَبَ: أزعَجَ. ضايَقَ/ وەڕسی کرد. بێزاری کرد.

أتعَـــبَ: أشـــقى/ (کەســاس. کڵـۆڵ. بـارگران. خەفەتبار)ی کرد.

أتعَسَ: أهلَكَ/ باری خست. دەردی گران کرد.

إتَّعـظَ: قَبِـلَ النـصيحَةَ وعَمَـل بهـا/ ئامۆژگـاری و پەنـدی وەرگـرت. چـوو بـە گوێیـدا. دەرســی وەرگرت.

إتِّفاق. عقد. اتفاية. مُعاهدة/ پەیمان. تەباییینامە. ڕێکەوتننامە. پێکهاتن.

إتِّفـاق: صَـفقَة/ پێکهـاتن لەسـەر کارێـك لەسـەر دەستکەوتێك.

إتِّفاق: تَفاهُم/ ڕێکەوتن. پێکهاتن.

إتِّفاق: وِفـاق. ضِد خِلاف/ ئاشتی. تـەبایی. کوك بوون. برواڤانی.

إتِّفاق: إنسجام. مُلاءمة. مُطابقة. توافُق/ گونجـان. بۆیەك بوون.

اتفاق: مُصادفة/ ڕێکەوت.

اتفاقاً: مُصادفةً/ بە ڕێکەوت.

اتفاقـــا: بالإتفـــاق/ بـــە بڕیـــار و ڕێکـــەوتنی هەمووان.

اتفاق الآراء: إجماع الرأي/ بـە کۆمـەڵ. بـە گشتی. یەك دەنگ.

إتِّفـاق تجـاري: صَـفقة تجاريـة/ ڕێکەوتننامـەی بازرگانی.

اتفاق جماعي: بالإجماع. باتحاد الآراء/بە کۆمـەڵ. بە گشتی. بە یەك دەنگ. کۆدەنگ.

اتفاقي. عرَض. بالمصادفة. قضاء وقدر/ پێکهاتنێك بە ڕێکەوت کە لە بیردا نەبێ. لەخۆیەوە.

إتِّفاقي: رِضائي/ قایلبوون. مادان. خۆویست.

إتِّفاقي: لا إرادي/ پێکهاتنێکی نەویست.

إتِّفاقي: عَرضي. تقليدي. محافظة على التقاليـد/ نەریتی ئاسایی. ڕێکەوتنێك بە گوێرەی نەریت.

إتِّفاقِيَة: عَقد/ پەیمان. ڕێکەوتننامە.

إتَّفَـقَ مـع فـلان علـى: وافَـقَ/ ڕێککـەوت. لەگـەڵ.. پێکهات. تەبابوو.

إتَّفَقَ: عَقَد إتفاقاً/ ڕێکەوتننامەی بەست.

إتَّفَقَ: صادَفَ. مُصادَفَةً/ بە ڕێکەوت ڕوویدا.

کیفما إتَّفَقَ: بِلا تَرَوٍّ/ هەرچۆن بێ. کوێرانە.

إتَّقَــى: حَـذِرَ/ ئاگـادار بـوو. سـڵەمیەوە. ترسـا. خۆی پاراست.

إتَّقَى بـ: إحتَمى/ خۆی پێ پاراست.

إتَّقَــى: تَجَنَّـبَ: تَفـادى/ دوورەپـەرێز وەسـتا. دوورکەوتەوە. خۆی پاراست. خۆی لادا.

إتَّقَــى الله: صــارَ تَقِيــاً/ بـو بـە خواپەرسـت. خواناسی و خواپەرستی ئەکا.

إتقــاء: حــذر. إحــتراز. وقــايــة/ خۆپاراســتن. سڵەمینەوە. ترسان. وریابوونەوە.

إتقــاء: تجنــبْ. تفــادْ/ دووره‌پــه‌رێز وەســتان. دووركەوتنەوە. خۆلادان.

إتقائي: وقائي. تحفظي. تحذيري/ بۆ پاراستن. بۆ ئاگاداركردنەوە.

إتقــاد: إشــتعال. إضــطرام/ گرگــرتن. ســوتان. داگیرسان. كڵپەسەندن.

إتقاد: حَماسة/ تووڕەبوون. ڕق هەڵسان. جۆش سەندن.

إتقان: إحكام: پوختی. بێ خەوشی. كاركردن بە باشی و پوختی. وردەكاری.

بإتقــان: بإحكــام/ بــە باشــی. بــەبێ خــەوش. كاركردن بە باشی و پوختی.

إتَّقــدَ: إضــطرَمَ. إشــتَعل/ ســوتا. گــڕی گــرت. داگیرسا. هەڵگیرسا.

إتَّقدَ غيــضاً أو غـضباً: ثــار ثــائره/ ڕقــی هەڵسا. قینی گرت.

أتقَنَ: أحكَمَ/ تەواوی كرد بە پاكی و پوختی.

إتَّكأ على: تَوكّأ: أسند على/ پاڵی دایەوە. شانی دادا. خۆی دا بە سەردا.

إتّكــاء علــى: تَوكُّــؤ: إســتناد علــى/ پاڵدانــەوە. شاندادان. خۆبەسەردا دان.

إتّكال: إعتماد. وثوق/ پشت پــێ بەستن. متمانە پێكردن. بڕواپێكردن. دڵنیایی.

إتّكــالي: مُعتمــد علــى الغــير/ ئــەوەی پــشت بــە یەكێكی تر ئەبەستێ.

إتّكاليــة: الاعتمــاد علــى الغــير/ پــشت بەســتن بــە یەكێكی تر.

إتَّكل على: إعتمد على وَوثق/ پشتی پــێ بەست. متمانەی پێكرد. بڕوای پێكرد. لێی دڵنیابوو.

إتَّكل على الله: تَوكّلَ واعتمد على الله. إستسلم اليه/ خۆی دایە دەست خوا و پشتی پــێ بەست.

إتلاف: تعطيل. عَطَب. تدمير/ پەككەوتن. فەوتانن. لەناوبردن.

إتَّلدَ: توالَدَ: تكاثر/ زۆربوون. زیادكردن. زاوزێ كردن.

أتلَعَ: مَدَّ عُنقَهُ/ ملی درێژكرد.

أتلَعُ: طويل العُنق/ مل درێژ.

أتلَفَ: عَطّل. عطَب. دَمّر/ پەكی خست. فەوتانی. لەناوی برد.

أتَــمَّ: أنجَــزَ/ جێبــەجێ كــرد. كۆتــایی پێهێنــا. بڕانیەوە.

أتَمَّ: أنهى/ تەواوی كرد. ڕاپەڕان.

إتْمام: إنجاز/ جێبەجێ كردن. كۆتایی پێهێنان.

إتْمام: تتميم. إنهاء/ تەواوكردن. ڕاپەڕاندن.

إتهام: إدعاء. إقامة دعوى/ تاوانباركردن.

قرار الإتّهام: ماقرَّ عليه/ بڕیاری تاوانباركردن.

(مــذكرة. لائحــة. ورقــة) إتّهــام/ بەیاننامــەی تاوانباركردن.

إتَّهَمَ: ألصَق به تُهمةً. إدعى عليه بتهمة/ تاوانباری كرد. گوناهباری كرد. تاوانی خستە پاڵ.

إتّهَمَ: شكَّ في أمره أو صدقه/ دڵی لــێ پیس كرد. لێی بەگومان بوو. گومانی لێكرد. تاوانی خستە پاڵ.

أتون: فرن/ فڕن. تەنور.

أتُون: موقد نــار الحمام/ كورەی حــەمام. كورەی گەرماو. توون. دۆزەخە.

أتاحَ: أتــاح. تَهيّأ/ گونجا. تەرخان بوو. ڕەخسا.

أثَّ النبــاتُ: نَمــى. كَثُــرَ/ ڕووەك و درەخــت ڕووا. گەشەی كرد. پەرەی سەند.

أثّ: وافِر: غزير/ زۆر. فرە.

إثـــار: ثـــأر. إنتقـــام/ تۆڵـــه. تۆڵەســـەندن. تۆڵەکردنەوە.

أثـاب: کافأ جـازىٰ/ پاداشـتی دایـەوە. خـەڵاتی کرد.

إثابة: مكافأة/ پاداشت. خەڵات.

أثاث: مفروشات. متـاع البيت/ ناوماڵ. کەلوپەل. پیتاك. پیتۆڵ. تفاق. شمەك. شتومەك.

أثار: هيّج/ وروژانی.

أثار: حرّك/ جوڵانی. هەژانی. هانی دا.

أثار: عرض أو طرح أو فتح (مسألة. قضيّة. فكرة. نقطـة. موضـوعاً. سـؤالاً)/ باسـێك. پرسـیارێك. هەواڵێکی هێنایەکایەوە.

أثار ثائرتهُ أو غضبهُ: أغضبهُ. هيّجهُ/ تورەی کرد. ڕقی هەڵسان. وروژانی.

أثار العواطف او المشاعر: حرّكها وهيّجها/ هەست و بەزەیی و هۆش و پەرۆشی جوڵان.

أثار الغبـار: هـيّج وأثـار النـزاع/ ئاژاوەی نایـەوە. تێی چان. دووزمانی کرد. گێچەڵی دروستکرد.

أثـــار الغبـــار: غفـــر/ کـردی بـه تـەپوتۆز، بـه خۆڵەپەتانێ.

أثار: إثأر. ثأرَ/ تۆڵەی سەند. تۆڵەی کردەوە.

إثارة: تهييج/ وروژاندن.

إثارة: تحريك: جوڵاندن. هەژاندن. هاندان.

إثـــارة: طـــرح/ کردنـــەوەی باسـێك، هـەواڵێك، پرسیارێك بۆ گفتوگۆ و لێدوان.

إثارة: إغضاب/ تورەکردن. ڕق هەڵساندن.

إثارة جنسية: التهييج الجنسي/ ئارەزوو جوڵاندن. ئارەزووهەڵساندن.

آثـار: علامـات/ نیشانە. شوێن دەسـت و پـێ. شوێنەوار. پاشماوە. جێماو.

آثـار: بقايـا أثريـة/ کـەلاوە. شـتی کـۆن و مـاوە. شـتی دێـرین. شـوێنەوار. شـوێنەواری کـۆن. کۆنەوار.

دار الآثـار: متحـف/ مۆزەخانـە. شـوێنەوارگە. دێرینگە.

علـم الآثـار/ دێـرین ناسـی. شوێنەوارناسـی. کۆنەناسی.

آثاري: خاص بعلم الآثار/ پەیوەندی دار بە دێرین ناسیەوە.

آثـاري: عـالم بـالآثـار/ زانیار و پسپۆڕی دێرین ناسی. دێرین ناس.

إثبات: بيّنه: دليل/ بەڵگە.

إثبـات: برهنـة. إظهـار/ بەڵساکردن. دەرخستن. بەڵگەهێنانەوە.

إثبات: تـاكيد. تـاييد/ سەلماندن. دڵنیاکردن.

إثبات: تدوين. تسجيل/ تۆمارکردن.

إثبات: إدخـال. تثبيـت/ قایمکردن. جێگیرکردن. چەسپاندن. پتەوکردن.

إثبات شخص بشهادة شهود/ قەواڵە.

إثبات كتابي: تحريري/ بەڵگەنامە. نووسینێك.

إثبـات الهويـة أو الشخصيّة أو الذاتيـة/ ناسنامە. سەلماندن بە ناسنامە.

شاهد الاثبات/ گەواه.

عبء الإثبات/ ئەرکە سەلماندن.

أثبـت: بـرهن/ بەڵسای کرد. بەڵگەی هێنایـەوە. سەلماندی.

أثبت: أيّد. أكّد/ سەلماندی چەسپاندی.

أثـث الفـراش: مهّـدهُ. فرشـهُ/ جێگـەی (داخسـت. ڕاخست).

أثّث البيت: فرشهُ. جاء بـاثاث جديد/ ناوماڵی کرد. ناوماڵی تازەی هێنا.

أثث: أعدَّ. هيأَ/ ئامادەی کرد.

أثخنَ: أضعفَ. أوهنَ/ لاوازی کرد. بێهێزی کرد. هێزی لێ بڕی. هێزی لەبەر بڕی.

اثخنته ضرباً: ضَرَبَهُ ضرباً شديداً/ زۆری لێدا. زۆری پیاکێشا.

أثخنَ في العدوّ: بالغ وغلط في قتلهم. عمل مذبحةً وملحمةً/ کوشتاری چاکی کرد.

أثخنَ في الأمر: بالَغَ/ شتەکەی زا کرد. زۆری پێوەنا.

آثر الحديث: نَقَلَهُ/ قسەکەی گێڕایەوە. گەیاندی.

آثرَ: فضَّلَ. أكرمَ/ پەسەندتری کرد. ڕێزی کرد.

آثر فيه: ترك فيه أثراً/ کاری تێکرد.

أثر: تأثير. مفعول. وقع/ کارتێکردن. کاریگەری.

أثر قديم: آثار. بقايا أثرية/ کەلاوە. دێرین. پاشماوە.

أثـر: مَسْخَةً/ شتێکی زۆرکەم. زۆر بچوك. نەختێك. تۆزقاڵێك. بەحاڵ.

أثر: نتيجة. عاقبة/ ئەنجام.

أثر: حديث. الحديث الشريف/ فەرموودەی پێغەمبەر.

أثر: علامة باقية/ شوێن. جێگە. شوێنەوار. شۆپ.

أثر الجرح: بقايا التئام الجرح. علامة متروكة بعد التئام الجرح/ جێ برین. شوێن برین.

أثر القدم: طبعة القدم/ جێ پێ. شوێن پێ.

أثر سيء: وقع سيء/ کارتێکردنێکی خراپ. ئەنجام خراپ.

أثر. إثرَ: بعد. خرج في أثره أوفي إثره: بعده/ بەدوایا ڕۆی. شوێنی کەوت.

على الأثر. على الإثر. في الحال. توّاً/ یەکسەر. یەکەندەردو. ڕاستەوخۆ.

أثِر: أناني/ خۆپەرست.

أثرى: كَثُرَ مالُه/ بوویە خاوەنی سامان و دارایی. دەوڵەمەند بوو.

أثرى: جعلهُ غنياً/ کردی بە خاوەنی سامان و دارایی. دەوڵەمەندی کرد.

أثراء: إغناء/ بوون بە خاوەنی سامان و دارایی. دەوڵەمەند بوون.

أثرة: أنانية. حُبُّ الذات/ خۆپەرستی. خۆکای. تەن پەروەری.

أثرة: تفضيل. إختيار/ هەڵبژاردن. هەڵبژاردە.

أثرد: مُتشقق الشفتين/ لێو داقڵیشاو.

أثرم. مكسور السنّ/ دان کەل. دان شکاو.

أثري. عالم أثري: مُختص بآثار/ دێرین ناس.

أثغار: ظهور الأسنان/ داندەرهاتن.

أثغرَ الصبيُّ: سقطت أسنانُهُ الرواضع/ دانی شیری کەوت. دانی تازەی دەرهات.

أثفية: حجر توضع عليه القِدر/ کوچکی بن مەنجەڵ. سێ بەردە. سێ کوچکە. سێپا.

أثقال الأرض: كُنوزها/ گەنجینە و سامانی ناوزەوی بە مردوەکانیشەوە.

إثقال: جعل الشيء ثقيلاً/ (قورس. گران) کردن.

إثقال كاهل كذا: إرهاق/ بارگران کردن.

إثقال على: إزعاج ومضايَقَة/ (بێزار. وەڕس. بۆڕ. جەرگاوس) کردن.

أثقبَ النارَ: أوقدها/ ئاگری کردەوە.

أثقلَ الشيءَ: جعله ثقيلاً/ (قورس. گران)ی کرد.

أثقلَ كاهلَهُ: أرهقهُ/ باری گران کرد.

أثقلَ على: أزعج. ضايقَ/ (بێزار. وەڕس. بۆڕ. جەرگاوس)ی کرد.

أثقلَهُ المرض: إشتدَّ عليه/ نەخۆشیەکەی قورس بوو. لێی قورس کرد. لێی پیس کرد.

أثقلَت المرأة: دنا وضع الحمل/ کاتی منداڵ بوونی هات. کاتی خۆیەتی.

أثكل الأم ولـدها وأثكـل الولـد أمه: أفقـدها إيـاه وأماتـه عنهـا/ ڕۆڵـەی مـرد. جـەرگی سـووتا. جوانەمەرگ بوو.

أثُل: تـأصّل. كان راسخاً/ بنجی داکوتا.

أثُل: كان كريم المَحتَد. أصيلاً/ (خانەدان. ڕەسەن. وەجاخزادە) بوو.

أثَـل المـال: ربـح. كـسب/ دروای دەسـتکەوت. قازانجی کرد.

أثل: شجر/ درەختی دارگەز.

أثلب. إثلِب: دبش. الحجارة الصغيرة/ وردە بەرد.

أثلث القـوم: صـاروا ثلاثـة/ بوون بە (سیان. سێ کەس).

أثلج الصدرَ أو النفسَ: إنشرح. إبتهج/ دڵی خۆش بوو. دڵخۆش بوو. دڵی کرایەوە.

أثلجت السماءُ: نزل الثلج/ بەفرباری.

اثلج ماء البئر: إنقطعَ/ ئاوی بیرەکە وشکی کرد.

أثلجت عنه الحمَى: تركَتهُ/ تاکەی (سووکی کرد. بەری دا. ڕەویەوە).

أثلوث: فـترة ثلاثـة أشهر مـن الـسنة/ وەرز. سـێ مانگ. چوارێکی ساڵ.

أثِـمَ: إرتكـب إثمـاً؛ أذنـب/ گونـاهی کـرد. تـاوانی کرد.

أثِمَ: إتُّهِمَ بالإثم/ گوناهبار کرا. تاوانبار کرا.

آثم. أثِم. مُذنب/ گوناهبار. تاوانبار.

آثـم: أثـيم. شـرِّير/ پیـاوخراپ. خراپـەکار. بەدڕەفتار. نەگریس.

إثم: ذنب/ گوناه. تاوان.

إثم: شرّ/ خراپە. بەدی. نەگریس.

إثمار: إنتاج الثمر/ بەرگرتن. هاتنەبەر.

أثمر: طلع الثمر/ بەری گرت. هاتەبەر.

أثمَلَ: أسكر/ (مەست. سەرخۆش. کەیل)ی کرد.

أثنى على: أطرى. مدح/ پیاهەڵدا. هەڵێنا.

إثنى: إنثنى: إنعطف. إنطوى/ نوشتایەوە. دووقەد بوو.

إثْنى: إنثـى عنـهُ: تخلّى. إنـصرف/ وازی لێهێنـا. دەستی لێهەڵگرت.

أثنـاء. في أثنـاء: خـلال/ لـە کاتی. لـە ماوەی. بە درێژایی. لەوکاتەدا.

إثناعـشر. إثنتـا عـشر: ١٢/ دوازدە. دوانـزە. دوانگزە.

إثنا عشري: عفج. أول الامعاء بعد المعدة/ ڕیخۆڵـەی دوانگزەگرێ.

إثنان: إثنتان/ دوو.

إثنان: زوجان/ دووان. جووت.

الإثـنين: يـوم الإثـنين/ ڕۆژی دووشـەممە. دووشەمو. دووشەممە.

أثـوى (بــ. في): سـكَن. اقـام/ نیـشتەجێ بـوو. مایەوە. تیاژیا.

أثْول: أحمق/ گێل. گەمژە. حۆل. کەودەن. کەر. دەبەنگ. حەپۆلە. سەپۆلە. گێژ. لاژ.

أثوى: أنزَلَ: أضاف/ میوانداری (ئەکا. کرد).

أثيث. أثّ/ وافر. غزير/ زۆر. فرە.

أثير: مُفضّل. مُكرَم/ بەڕێز. پایەبەرز. شکۆمەند. خاوەن. شکۆ. گەورە. پەسەند.

أثيل: راسخ/ بنج داکوتاو. قایم.

أثيـل: كـريم المَحتَـد/ خانـەدان. وەجـاخزادە. ڕەسەن.

أثيم: مُذنب/ گوناهبار. تاوانبار.

أثـيم: شـرِّير/ پیـاوخراپ. خراپەکار. بەدڕەفتار. نەگریس.

أجّ: إضطرم. إلتهب/گڕی گرت. كڵپەی سەند. گەش بووەوە. قڵەی هات.

أجّ الماءُ: صار ملحاً مُرّاً/سوێر بوو. سوێرخوێ بوو.

أجاء بـ: جاء بـه. أحضر/هێنای. هاوردی. ئامادەی کرد.

أجاب: ردّ. جاوب/وەڵامی دایەوە. وەرامی دایەوە. بە دەنگیەوە چوو.

أجابَ طلباً. أجابَهُ الى حاجته. لبّى طلبهُ/ داواکەی بەجێ هێنا. بە قسەی کرد.

أجاب عن تُهمة أو زعم: دافع. إحتجّ/بەرگری کرد. بەرچی دایەوە. پاکانەی کرد.

إجابة: ردّ. جواب/وەڵام. وەرام. وەڵامدانەوە. وەرامدانەوە. پاسوخ.

إجابة: تَلبِيَة/بەقسەکردن. بەدەنگەوە چوون.

إجابة عن تهمة أو زعم: دفاع وإحتجاج/بەرگری. پاکانە.

إجابة لطلبكم: ردّاً لطلبكم/لە وەڵامی (پرسیارەکەتانا. داواکەتانا. خواستەکەتانا).

أجّاج: مُضطرِم. مُلتهِب/گڕگرتوو. بە کپڵە. گەش.

أجّاج: مُرّ. مالح. ماء أجّاج/ئاوی سوێر. تل و خوێ.

أجّاج: يُلهِب الفمَ/زۆر گەرم. دەم ئەسوتێنێ.

أجّاج: سمك مُملّح/ماسی (سوێرخوێ. خوێکراو).

أجاح: إجتاح: غزا. إكتسح/هێرشی برد. پەلاماری دا. چوە سەریان.

أجاح: إجتاح: دمّر. أهلك. أباد/لەناوی برد. بەربادی کرد. فەوتانی. قڕی تێخست.

إجاحة: إجتاح: غزو. إكتساح/هێرش بردن. پەلامار. چوونەسەر.

إجاحة: إجتياح. تدمير. إهلاك. إبادة/لەناوبردن. بەربادکردن. فەوتانن. قڕتێخستن.

إجادة: إبداع. إتقان/وەستایی لە کاردا. کاری پوخت و ناياب.

أجاد: أبدع. أتقن/وەستایی لە کاردا. کاری پوخت و نایاب.

أجار: ألجأ. حمى/پەنای دا. داڵدەی دا. پاراستی.

أجار: أغاث. أنقذ. أعان/چوو بە هاواریەوە. دەستی یارمەتی بۆ درێژ کرد. یارمەتی دا. ڕزگاری کرد.

أجارة: إيجار/کرێ. کرێ موڵك. کرێ خانوو.

أجاز: سَمَحَ. اباحَ. أذنَ/ڕێی دا. هێشتی. هێڵای ماوەی دا.

أجاز: أقرّ/بڕیاری دا. قایل بوو.

أجاز: خوّل/دەسەڵاتی دایە. دەسەڵاتی پێدا.

أجاز: عَبرَ. سَلكَ/پەڕیەوە. تێپەڕی. ڕابورد.

إجازة: سماح. إباحة/ڕێدان. هێشتن. هێڵان.

إجازة: إقرار/بڕیاردان. قایلبوون.

إجازة: إذن. ترخيص/ڕێدان. مۆڵەت.

إجازة: رُخصة. تصريح. إجازة عمل/نامەی کارکردن. مۆڵەت.

إجازة: إذن بالغياب. إجازة إعتيادية/پشووی ئاسایی. وچانی ئاسایی.

إجازة: عُطلة/پشوو. وچان.

إجازة: شهادة عالية ليسانس)/بڕوانامەی باڵا.

إجازة سوق: رُخصة قيادة/مۆڵەتی شۆفێری.

إجازة مَرضية/پشووی نەخۆشی. وچانی نەخۆشی. مۆڵەتی نەخۆشی.

أجّاص: كُمّثرى/هەرمێ.

أجاعَ: جوّعَ/برسی کرد.

ألِفَهُ. لأَلِفَهُ: أنس به وأحبَهُ/ خۆشی ویست. هۆگری بوو. لەگەڵی ڕاهات.

أَلِفَ. آلَفَ المكانَ: تَعَوَّدَهُ واستأنس به/ شوێنەکەی بەدڵ بوو. پێوەی ڕاهات.ی بەدڵ بوو. پێوەی ڕاهات.

آلَفَ. عوَّدَ/ ڕایهێنا. کەوی کرد. ماڵی کرد.

أَلَّفَ: أنشأ. شَكَّلَ. كوَّنَ/ دروستی کرد. پێکی هێنا.

أَلَّفَ كتاباً: جَمَعَهُ. وَضَعَهُ/ کتێب و نووسینی دروست کرد. داینا.

أَلَّفَ لحناً: وَضَعَهُ/ ئاوازی دانا.

أَلَّفَ بينهم: وفَّقَ. سوَّى. أوقع الألفةَ/ ڕێکی خستن. كۆکی کردن. یەکی خستن. ئاشتی خستە ناویان.

أَلَّفَ حيواناً: صيَّرَهُ أليفاً/ (ماڵی. کەوی. دەستەمۆ. هۆگر)ی کرد. ڕایهێنا.

ألف: عدد. رقم (١٠٠٠)/ هەزار (١٠٠٠).

إلف: وَليف. صَديق حَميم/ هاوڕێ. برادەر. هاوەڵ. هەڤاڵ. هاودەم.

أَلفَى: وَجَدَ/ دۆزییەوە.

ألفباء: حروف الكتابة/ ئەلفوبێ.

اَلْفَتَ. لَفَتَ/ لای کردەوە.

أُلْفَة: مؤانسة/ خۆشەویستی. هۆگربوون. دەساوێژی.

أُلْفَة: صداقة. مَوَدَّة. وِفاق. وِئام/ هاوڕێیەتی. برادەرایەتی. ئاشنایەتی. ڕێکێتی.

أُلْفَة: إتحاد/ یەکگرتن. یەکبوون. یەکێتی.

أُلْفَة (في الكيمياء)/ هۆگرێتی. هۆگرێتی.

ألفي: ألف سَنَة/ هەزار ساڵ.

عيد الألفي: الذكرى الألفية/ یاد و بیرەوەری و تێپەڕبوونی هەزار ساڵ.

القصيدة الألفيَّة: قصيدة من ألف بَيت/ هۆنراوەیەکی هەزار دێڕ.

أَلَقَ: لَمَعَ. سَطَعَ. أضاء/ (شەوق. ڕووناك. تیشك)ی دایەوە. درەوشایەوە.

أَلْق: لمعان. سُطوع. اضاءة/ ڕووناکی. شەوقدانەوە. درەوشانەوە.

أَلِقَ: كَذَبَ/ درۆی کرد.

أُلِقَ: جُنَّ. أصيب بالجنون/ شێتبوو.

ألحَدَ: لحَدَ: دفَنَ/ ناشتی. خستیە چاڵەوە.

ألحد: لحد: حفر قبراً/ گۆڕی هەڵکەن.

أَلْحَدَ: إلتَحَدَ عن الدينِ. إرتَدَّ عن الدينِ. مالَ وحادَ/ لە ئاینی لایدا. هەڵگەڕایەوە. گومڕا بوو.

أَلحَفَ: أَلَحَّ. أصَرَّ/ هەتەربوو. پێی داگرت. سوور بوو. لەسەری ڕۆی. هەتەربوو. پێی داگرت. سوور بوو. لەسەری ڕۆی.

ألحَق به ضرَراً: سبَّبَ وأحدثَ له ضرراً/ زیانی پێگەیان. تووشی زیانیکرد.

ألحق كذا بكذا: أوصَلَهُ/ پیاگەیان. فریایخست.

ألحَقَ: أضافَ أو ضَمَّ/ خستیە سەر. خستیەپاڵ.

ألحَقَهُ: أدركَهُ/ پێی گەیی. گەیشتە سەری. فریای کەوت.

ألحَمَ: ألصَقَ/ پێوەی نووسان. بەیەکیەوە نووسان. پیالکان. پنجی کرد. لەحیمی کرد.

إلَخ: إلى آخره/ تا، هەتا دوایی.

أَلخَنَ: نَتَنَ. مَنتَنَ/ بۆگەن. بۆنکردوو.

الَّذي: إسم موصول للمذكر المفرد/ ئەوەی. ئەو کەسەی (بۆ نێر).

اللذان: اللَّذَينِ إسم موصول للمذكر المثنى/ ئەوان. ئەوانەی (بۆ نێر).

اللَّذين. اللذون إسم موصول للمذكر الجمع/ ئەوان. ئەوانەی (بۆ نێر).

اللتي: اسم موصول للمؤنث المفرد. ئەوەی. ئەوکەسەی (بۆ مێ).

اللتان. اللتين: اسم موصول للمؤنث المثنى. ئەوان. ئەوانەی (بۆ مێ)

اللواتي. اللاتي: اسم موصول للمؤنث الجمع. ئەوان. ئەوانەی (بۆ مێ)

الز: لز الشيء بالشيء: شده والصقه. بە یەکیەوە (نوسان. لکان). پێوەی نووسان.

الزام: اجبار. ارغام. زۆرلێکردن. بەزۆر پێکردن. تەوزیم.

الزام: فرض. ایجاب. سەپاندن.

الزامي: اجباري. زۆرەملە.

الزق: لزق. پێوەی (نووسان. لکان).

الزم بـ: اجبر على. ارغم على. زۆری لێکرد. ناچاری کرد. بەزۆر پێی کرد.

الس: خان وغش. فێڵی کرد. دەستپڕی کرد.

ألس: اختلط عقله. شێتبوو. تێکچوو.

الس: خيانة. فێڵ. تەڵەکەبازی. دەستپڕین.

ألس: جنون. شێتی. کەللەیی.

الزم: فرض على. اوجب على. سەپاندی بەسەریا.

الس: فصيح. بليغ. زمان پاراو. قسەزان.

الصق: الزق. پێوەی (نووسان. لکان). نووسانی. لکانی.

الصق به تهمة او قضية: اتهمه. تاوان و کارێکی شوێن خست. خستیە ملی. تووشی کرد.

العب: جعله يلعب. هێنایە گەمە. خستیە یاری. یاری پێکرد. وای لێکرد یاری بکا.

العب: لعب. لها. عبث. یاری کرد. گەمەی کرد. وازی کرد.

العب: سال لعابه. دەمی لیکی کرد. ئاوی کرد. لیک بە دەمیا هاتە خوارێ

العبان: كثير اللعب. يحب اللعب. هەر خەریکی یاری و گەمەیە. یاریکەر. گزیکەر. فێڵباز.

العق: جعله يلعق. لحس. پێی لستەوە.

القى: رمى. قذف. فڕێیدا. هەڵیدا. تووڕیدا. هاویشتی.

القى: تلى. سمع. وتی. وتیەوە. خوێندیەوە.

القى اليه بالا: إكترث واستمع له. بایەخی پێدا. بە تەنگیەوە هات. گوێی پێدا.

القى إليه السمع: اصغى. گوێی (لێگرت. بۆ شلکرد. گرت).

القى اليه او عليه القول او بالقول: اعلمه اياه. پێی ڕاگەیان. پێی وت.

ألقى بنفسه في: وضع أو رمى بنفسه. خۆی (تێخست. تێفڕێدا. تووشکرد).

ألقى بياناً: أعلن. نشر. اذاع. ئاگاداری بڵاوکردنەوە. ڕایگەیان.

القى البيض: باضت. وضعت البيض. هێلکەی کرد.

ألقى الحجز على المال او الشيء: حجز. دەستی بەسەراگرت.

القى تحية أو سلاماً: سلم. سڵاوی کرد.

القى الحمل على ظهره: وضعه على كتفه. دای بە کۆڵیا. خستیە بەرپشتی.

القى له الحبل على الغارب: اعطاه الحرية. جڵەوی بۆ شلکرد. دای بە دەمیەوە. بەرەڵای کرد.

ألقى خطاباً أو كلمة: خطب. وتاری دا. وتاری خوێندەوە.

ألقى السلاح: رماه. چەکی دانا. خۆی چەك کرد.

القى الضوء أو الأضواء على: حدد ونور. تیشکی خستە سەر. ڕوونی کردەوە. تیشکی خستە سەر. ڕوونی کردەوە.

**ألقى على عاتقه:** وضع على كتفه/ دای بە كۆڵیا. خستیە سەرپشتی.

**ألقى على عاتقه. ألقى عليه المسؤولية. حمّلهُ المسؤولية/** بەرپرسیاری كرد. سەپانی بەسەریا. خستیە ئەستۆیەوە

**ألقى عليه سؤالاً:** سأله/ پرسیاری لێكرد.

**ألقى عليه درساً:** أعطاه/ فێری كرد. تەمێی كرد. دەرسی دادا

**ألقى عليه اللوم:** لامه. عاتبه/ گلەیی لێكرد. سەرزەنشتی كرد. لۆمەی كرد.

**ألقى عليه القول:** أملاه. لقّنهُ/ پێی وتەوە. فێری كرد. پێی وت وابڵێ

**ألقى عنه الشيء:** طرحهُ/ لە كۆڵی كردەوە. لێی دوورخستەوە

**ألقى فيه الشيء:** طرحهُ/ تێی خست. خستیە ناوی.

**ألقى القبض على:** أوقفهُ/ گرتی. بەندی كرد.

**ألقى قُرعةً:** سحب القرعة/ پشكی (خست. فرێدا).

**ألقى القنابل على:** قصف/ بۆردمانی كرد.

**ألقى مُحاضرة:** تلاها. قرأها/ وتاری دا. وتاری خوێندەوە.

**ألقى المسؤولية على:** وضع المسؤولية/ بەرپرسیاری كرد. خستیە ملی.

**ألقى الرعب (في قلبه. في نفسه):** أرعبَ/ ترسانی. ترسی خستە دڵەوە. تۆقانی.

**ألقى الكلام على عواهنه:** رمى الكلام. تكلم كيفما إتّفق/ قسەی فرێدا. قسەی بێسەروپێی كرد.

**ألقى الدرس:** تلى الدرس/ وانەی وتەوە.

**إلقاء:** طرح. رمي. قذف/ هەڵدان. فرێدان. هاویشتن. تووڕدان.

**إلقاء:** تلاوة. تسميع/ خوێندنەوە.

**إلقاء:** طريقة الإلقاء. كيفية إلقاء الكلام/ چۆنیەتی وتن و دووان و ئاخاوتن و وتارخوێندنەوە.

**ألقحَ:** لقّحَ. أخصبَ/ چاكی كرد. تۆوی نێرەی كرد بەسەر مێیەدا.

**ألقحَ:** لقّحَ. طعّمَ. زرقَ/ كوتای. دەرزی كوتانی لێدا.

**ألقمَ:** لقّمَ. أطعمَ/ پاروی (بۆ كرد. كرد بە دەمیەوە). خواردنی پێدا.

**ألقمهُ الحجرَ:** أسكتهُ/ بێدەنگی كرد. دای بە دەمیا.

**ألقيةُ:** أحجيةٌ. حزورةٌ/ مەتەڵ

**ألكترود:** قُطب/ جەمسەر.

**ألكتروليت:** المُنحل بالكهرباء. محلول كهربائي/ كارەباگەێن. ئەلەكترۆن.

**إلكترون:** كهرب سالب الشحنة/ ئەلەكترۆن.

**العقل أو الدماغ الألكتروني.** حاسوب/ كۆمپیوتەر

**ألكَعُ:** لئيم/ بەد. زمان بەد.

**ألكَعُ:** أحمق/ گێل. گەوج. كەودەن. كەر. سەپۆلە.

**ألكَنُ:** ثقيل اللسان/ تور. زمان قورس. پس. لاڵەپەتە.

**الله:** ربّ. خالق/ خوا.

**بالله عليك:** أرجوك/ توخوا. تكایە.

**اللهم:** ياالله/ خوایە. یاخوا.

**والله. تالله. بالله/** بەخوا.

**إنشاءالله/** خوا بیكا.

**الحمدلله/** سوپاس بۆ خوا.

**لله درُّهُ:** مرحى/ ئافەرین.

**أَلِمَ:** تألّمَ. توجّعَ/ (ئازار. ئێش)ی پێگەیشت. (ئازار. ئێش)ی هەبوو.

ألم: أوجع/ ئێشانی. ئازاری هەبوو. ئێش و ئازاری پێگەیان.

ألمَ بـ: عرف. إطّلع على/ زانی. سەری لێدەرکرد. لێی ئەزانی. زانیاری هەبوو.

ألمّ بـ: أصاب. حل بـ: بەسەری هات. تووشی بوو. گرفتار بوو.

ألمّ بـ: إرتكب. إقترف/ کردی. کاری خراپی کرد. تاوانی کرد

ألمّ بـ أو على: زار/ سەری دا. دیدەنی کرد. چوو بۆ لای.

ألمّ به مرض: أصيب/ نەخۆش کەوت. تووشی نەخۆشی بوو

ألمّ بالطعام: لم يسرف في أكله/ زۆری نەخوارد.

ألمّ يفعل كذا: كاد أن يفعل/ وەختەبوو بیکا. ئەوەندەی نەمابوو.

ألم: أوجع/ ئێشانی. ئێشی پێگەیان. ئازاری دا.

ألم: وجع. عذاب. كرب/ ئێش. ئازار. ئەندێشە. سزا. سوێ. گاشە. ژوار. ژان. سانجور.

ألم؟. ألم. أولم أقل لك/ ئایا پێم نەوتی؟ بۆچی پێم نەوتی؟

ألم؟. ألم. أولم يكن/ ئایا نەبوو. بۆچی نەبوو؟

ألم: متألم/ ئێشی هەیە. ئازاری هەیە.

ألماس. ماس/ ئەلماس.

ألماظه: نبات/ سیپك.

إلمام بـ: دراية. معرفة/ شارەزایی. زانین. زانیاری. سەرلێدەرکردن. دەستبوون.

ألمح الشيء: لمح. ابصر/ بینی. چاوی پێکەوت.

ألمح إلى: لمح إلى. أشار الى. تطرّق/ ئاماژی کرد. پەنجەی بۆ درێژکرد. هێمای بۆ کرد. شتێکی لێوت.

ألمح: لامح. إختلس النظر إلى/ بە تیلایی چاو (بینی. سەیری کرد. تێی ڕوانی).

ألمع إلى: لمح. اشار/ ئاماژەی کرد. پەنجەی بۆ درێژ کرد.

ألمع: ألمعي: ذكي. شديد الذكاء. متوقد/ زیرەك. دانا. ژیر.

ألمعية. ذكاء/ زیرەکی. دانایی. ژیری.

ألّه: رفع الى منزلة الألهة/ کردی بە خوا. پەرستی. بەرزی کردەوە بێرادە.

إله: إلاه. ربّ الكون. خالق. معبود/ خوا. یەزدان. خوای پەروەردگار.

إله البحر: نبتون. خوای دەریا. نەبتۆن.

إله التجارة: ميركري. هرمز/ خوای بازرگانی. مێرکوری. هورمز.

إله الحب: كيوبيد/ خوای (دڵداری. خۆشەویستی). کیوبید.

إله الحرب: مارس/ خوای (جەنگ. شەڕ). مارس.

إلاهة الحكمة: منرفا/ خوای ژیریی. منێرڤا.

إلاهة الجمال والعشق: فينوس. زهرة/ خوای جوانی و دڵداری. ڤینۆس. زەهرە.

ألهى بـ: سلى بـ/ ڕایبوارد. پێوەی خەریك. پێی ڕابوارد. خۆی پێوە خەریك کرد.

ألهى عن: شغل عن/ لەبیر خۆی بردەوە. خستیە پشتگوێ. خۆی لێ کەڕ کرد.

إلهاء: تسلية. لهو. لعب/ یاری. گەمە. خەریك (بوون. کردن). خۆخەڵافاندن.

إلهاب: إشعال/ داگیرساندن. هەڵگیرساندن. کردنەوە.

إلهاب: إثارة/ وروژاندن. ئاگرخۆشکردن.

إلهام: وحي إلاهي/ سرووشی خوایی. ئەوەی خوا ئەیخاتە دڵەوە.
ألهبَ: أشعل/ دایگیرسان. هەڵیگیرسان.
ألهبَ: أثار. هَيّجَ/ وروژانی. هانیدا. هەژانی. هەڵیگیرسان.
ألهب ظَهرهُ بالسوط. جَلَدهُ. ضربهُ/ بە قامچی دایگرتەوە. کێشای بە پشتیا.
ألهجَ. لَهِجَ/ شێوەزار گۆڕی.
ألهمَ الشيء: أبلَعَهُ إياه. جَعَلَهُ يبلَعهُ/ پێی قووت دا. کردی بە قوڕگیا.
ألهَمَ: أوحى إلى/ سرووشی بۆ هات.
ألهُوَّة. ألهيَة. ألعوبة. لُعبَة/ یاری. گەمە شتومەکی یاری. بووك.
إلهي: رباني/ خوایی.
الإلهيات: علم الإلهيات. علم يَبحَث عن العقائد المتعلقة بالله/ ئاینی زانی. ئاینی گەری.
ألوىَ بيده: أشار/ دەستی (درێژ کرد. ڕاوەشان).
ألوىَ اللواء: رَفَعَهُ/ ئاڵای هەڵکرد. بەرزی کردەوە.
ألوىَ بهِ الدهرُ: أهلَكَهُ/ ڕۆژگار سەری لێشێوان. پەرێشانی کرد. تووشی کارەسات بوو.
ألوىَ بِحَقه: جَحَدَهُ. أنكَرهُ/ لاری بوو لێی. نەچووە ژێری. ئینکاری کرد. نوکوڵی کرد.
ألوف: أليف: كثير الأُلفَة/ زوو ڕادێت و هۆگر ئەبێت. ڕاهاتوو.
ألوف. أليف: حَميم. مُحِب. وَدود/ خۆشەویست. گیانی بە گیانی.
ألوَم: أكثر إستحقاقاً للَوم/ شایانی گلەیی و سەرزەنشتە.
ألومنيوم/ فافۆن. ئەلەمنیۆم.
ألوهَة: ألوهيَة/ خواپەرستی. خوایی. خوایەتی.
آلي: ميكانيكي/ خۆکار. میکانیك. ئامێرساز.

إلي: ألَى. نِعمَة/ ئازو نیعمەت. ڕۆزی.
ألية: ذَيل الغَنَم/ دووگ.
ألية: عَجز. عَجيزة. كَفَل/ سمت و کەفەڵ.
أليف: أنيس. لطيف/ ڕووخۆش. ڕام. ڕاهاتوو. ماڵی.
أليف: حميم/ خۆشەویست.
أليف: إلف. صَديق حميم/ هاوڕێ. هاوەڵ. برادەر. هەڤاڵ. هاودەم. هاوڕێی گیانی.
أليم: مُؤلم. مُوجِع/ بەئێش. بەئازار. بەسوێ بەژان. ئێشدار. ژاندار.
أليم: مُؤلِم. مُحزن/ بەخەم. بەپەژارە.
آمَ الرَجلُ من زوجَته: فَقَدها. تَرمَّلَ/ بوو بە بێوەپیاو. ڕەبەن کەوت. ژنەکەی مرد.
آمَت المرأةُ من زَوجِها: فَقَدَته. تَرَمَّلَت/ بوو بە بێوەژن. بێوەژن کەوت. مێردەکەی مرد.
أمَّ: قَصَدَ. تَوَجَّهَ/ بۆی چوو. ڕووی تێکرد. مەبەستی بوو. نیازی بوو.
أمَّ القَومَ إمامَةً أو إماماً: تَقَدّمَهُم وصلّى بِهِم إماماً/ پێشنوێژی کردن. بوو بە (پێشنوێژیان. ئیمامیان).
أمَّت المرأةُ: صارت أمّاً/ بوو بە دایك.
أم: أو/ یا. یان. یاخود.
أمّ: مَصدَر. أصل/ سەرچاوە.
أمّ: قالب/ قاڵب.
أمّ: والدَة/ دایك. دایە. ئامە. دالك. دێ.
أمّ أدراص: حيوان اليَربوع/ گۆڕەمەڵکەنە. گۆڕەمەڵتەکێنە.
أم أربع وأربعين: حَريش. حَشَرة/ هەزارپێ.
أم أوَيق: بوم. بومة. طائر/ کونەپەپوو.
أم حُباب: دُنيا/ گێتی.

أم خباحب: حَشَرة مُشعَة في الليل/ كولەئەستێرە. پەپوولە ئەستێرە.

أم الحبر: حبَار. من الأسماك/ جۆرێکە لە ماسی.

أم جابر: هريسة/ کەشکەك. گەنمەکوتاو. هەریسە.

أم رسال: ضبع. حيوان/ کەمتیار. قەمتار.

أم زوبعة: الريح الشيطانية/ گێژەڵووکە.

أم ساهر: عقرب/ دووپشك. دەمارەکۆڵ.

أم الشعور: الصفصاف الباكي/ شۆڕەبی.

أم القرى: عاصمة البلاد/ پایتەخت.

أم القرى: مكة المكرمة/ شاری مەکە.

أم القرى: النار/ ئاگر.

أم قشعم: الحرب/ جەنگ.

أم عامر: ضبع/ کەمتیار. قەمتار.

أم عجلان: هزاز الذنب/ كلك هەڵتەکێنە.

أم عريط. ام العريط: عقرب/ دووپشك. دەمارەکۆڵ.

أم ليلى: الخمر السوداء/ مەی. شەراب.

أم هبيرة: أنثى الضفدع/ دەڵەبۆق. بۆقی مێیە.

أم الوليد: دجاجة/ مر. مامر. مریشك.

رأى بأم عينه. رأى بنفسه/ بە چاوی خۆی دی.

عيد الأم: يوم الأم/ جەژنی دایك.

لغة الأم: لغة أو لسان المولد/ زمانی زکماکی.

الأم الحافية: الغشاء الخارجي للمخ والنخاع الشوكي/ پێستی مۆخ.

أما: لكن/ بەڵام.

إما: أو- إما هذا أو ذاك/ یان. یا. یاخود- یان ئەم یان ئەو.

أمات: موت. جعله يموت/ مرانی. کوشتی. مرداری کردەوە.

أمات الشهوات: قهرها/ ئارەزوو و حەزی مران. دایمرکانەوە.

أمات نفسه: إنتحر/ خۆی کوشت.

أمات غضبه: سكنه/ دایمرکانەوە. هێواشی کردەوە. هێدی کردەوە.

أماته: كان سبب موته/ بوو بە هۆی مردن و کوشتنی.

أماته جوعاً/ برسی کرد. بە برسێتی (هێشتیەوە. کوشتی).

إماتة: قتل/ کوشتن. مراندن. تۆپاندن.

إماتة الحسد أو الشهوات أو الغضب: قهر. إسكان/ دامرکانەوە. هێواشکردنەوە. کپکردن

أمار عياله: أتاهم بالطعام/ خۆراك و ئازوخەی دابین کرد.

أمارت الريح التراب: أثارته/ با خۆڵی هەڵسان. کردی بە تەپوتۆز. بوو بە خۆڵەپەتانی.

أمار الصوف: نفشه/ خوری شیکردەوە.

أمار: كثير الأمر/ داوای زۆرە. بە فەرمانە.

أمار: المغري على الشر/ ئاژاوەگێڕ ئاگری بنکا.

أمارة: علاقة/ نیشانە.

إمارة: دولة يحكمها أمير/ هەرێم. ناوچە. وڵات. میرنشین.

إمارة: منصب أو مركز والأمير/ میر. میرنشین. میرمکایەتی.

أماز الشيء: ميز. فرزه عن غيره/ جیایکردەوە. هەڵیبژارد.

أماط عن: تنحى. إبتعد/ کشایەوە. دوورکەوتەوە. وازی هێنا. خۆی لادا. گەڕایەوە.

أماطه: نحاه وأبعده/ دووری خستەوە. کشانیەوە. گەڕانیەوە.

أماط اللثام عن: كشفَ: أظهرَ/ خستیەڕوو. دەریخست. ئاشكرای كرد. پەردەی هەڵدایەوە.

إماطة اللثام: كشف. تعريَة/ خستنەڕوو. دەرخستن. ئاشكراكردن.

أماع: أذابَ. أسالَ/ توانیەوە.

أماع: ميَّعَ. ليَّنَ/ (شل. نەرم. خاو)ی كردەوە.

إماعة: تمييع. إذابَة/ توانەوە (شل. نەرم. خاو) كردنەوە.

أمال: حَنى. حرَفَ/ (خوار. لار)ی كردەوە. چەمانیەوە. نوشتانیەوە.

أمالَهُ عن: نَفرَهُ من. صرَفَهُ عن. ثَناهُ عن/ لێی دوورخستەوە. لەبەرچاوی خست. وازی پێ لێهێنا.

أمالت المرأة: أزالت القناعَ/ پەچەی لادا. ڕووی دەرخست.

إمالة: حَني/ (خوار. لار) كردنەوە. چەماندنەوە. نوشتاندنەوە.

أمام: قدَامَ/ پێشەوە. پێش. بەردەم. بەرو. نووا.

أمام: تِجاه/ بەرامبەر. ڕووبەڕوو.

أمام: في حَضرةَ/ لەبەردەم.

أمام عينيه: في وجوده/ لەبەر چاویا.

إلى الأمام: نحو الأمام. نحو القُدام/ بۆ پێشەوە.

إمام: قائد. زعيم/ پێشەوا. پێشەنگ.

إمام: دليل. معيار. شيء يُهتدى به/ نیشانە.

إمام الجامع. إمام عند المسلمين/ پێشنوێژ. بەرنوێژ. ئیمامی مزگەوت.

إمام الشيعة/ ئاخوون.

إمامة: رئاسَة/ پێشەوایی. پێشنوێژی.

أمانة: وفاء. إخلاص. وَلاء. إحترام/ دەستپاكی. سەرڕاستی. دڵسۆزی. ڕێز.

أمانة: وَديعَة/ سپاردە. دانراوە. ڕاسپارە. ئەمانەت.

أمانة: حراسَة. إشراف. ثِقَة/ سەرەوكاریەكی دڵسۆزانە. ئاگالێبوون. دەستپاكی. متمانەكردن.

الأمانة العامة/ ئەمینداریتی گشتی.

خيانة الأمانة: إساءَة الأمانة/ ناپاكی. خیانەتكردن.

أماه الشيء: صَبّ فيه الماءَ: خفف. رقق/ ئاوی (تێكرد. تێوەدا). تێكەڵ بە ئاوی كرد. ڕوونی كردەوە.

أماه الشيء بالشيء: خلطَهُ/ تێكەڵی كرد. تێكەڵاوی كرد.

أماه السكين: سَقى شفرَتَهُ/ زاخاوی دایەوە. ئاوی دا.

أماهة (في الكيمياء): خلطه بالماء/ ئاواندن. یەككگرتن لەگەڵ ئاودا.

أماهة (في الكيمياء): عملية الاتحاد بالماء/ ئاواندن. یەككگرتن لەگەڵ ئاودا.

أمبير: وحدة لقياس قوة التيار الكهربائي/ ئەمپێر.

أمة: مملوكة. عبدة. خادمة/ كارەكەر. كۆیلەی ئافرەت.

أمة: شعب. جيل/ گەل. نەوە.

مجلس الأمة: مجلس الشعب/ ئەنجومەنی گەل.

إمتاحَ الماءَ: إغترفَهُ/ بەچنك ئاوی هەڵگرت. چنگی پیاكرد.

إمتاح: طَلَب فضلَهُ. إلتمس/ داوای چاكە و پیاوەتی و یارمەتی لێكرد.

إمتارَ لعياله أو لنفسه: جمع الطعام والمونه/ خواردن و ئازوخەی پەسمندە كرد. زەخیرەی خست.

إمتاز بـ: إختصّ بـ. إنفرد بـ. فاضَل/ جياوازى هەبوو. جيابوو. تايبەت بوو. خاڵێكى تايبەتى تيابوو.

إمتاز عن أو على: فاقَ/ لێهاتووتر بوو. لەو باشتر بوو.

إمتثال: طاعة. تقيُّد/ گوێڕايەڵى. بەقسەكردن. پابەندبوون.

أمتثل: أطاع. تقيَّدَ/ گوێڕايەڵى كرد. بە قسەى كرد. پابەند بوو.

إمتثلَ الشيء: عمل تعلى مثاله/ لاسايى كردەوە. وەكو ئەوى كرد.

إمتثلَ الطريقة: إتّبعها. إحتذى/ پەيرەوى كرد. ڕێ و شوێنەكەى گرت.

إمتحى الشيء: محى. إمّحى. ذهب أثرهُ. تلاش واضمحلَ/ سڕايەوە. كوژايەوە. نەما. شوێنى نەما.

إمتحان: إختبار. تجربة/ تاقيكردنەوە. ئەزموون.

إمتحقَ: إنمحق. إضمحل وامحى/ توايەوە. ئاوابوو. لەناوچوو. نەما. فەوتا. كەمبووەوە.

إمتحنَ: جرّبَ واختبر/ تاقيكردەوە.

إمتخطَ: مخط. تمخّطَ. أخرج المخاط من انفه/ چڵمى لە لووتى دەرهێنا. فنگى كرد. لووتى سڕى.

إمتدَّ: إنبسطَ. تمدَّدَ/ كشا. درێژبووەوە. فراوان بوو.

إمتد في مشيته: تبختر/ خۆى بائەدا. بە تەروفيز ئەڕوا.

إمتداد: مدى/ ماوە.

إمتداد: طول/ درێژى. فراوانى. درێژە.

إمتدح: مدح. أحسنَ الثناء عليه/ ستايشى كرد. هەڵيدا. پياهەڵدا. مەدحى كرد.

إمترى في الأمر: شكَّ/ گومانى (لێ) كرد. دوودڵ بوو لێى. دڵى لێ پيس كرد.

إمتزَّ: إلتصقَ واندمج/ پرووەژيو. پێوەى نووساو. تێكەڵى بوو.

إمتزاج: إختلاط. تێكەڵبوون. تێكەڵاوبوون. ئاوێتەبوون.

إمتزاز: إلتصاق جزئيات بسطح مواد أخرى واندماجها بە/ پرووەژبوون. پێوەنووسان و تێكەڵبوون.

إمتزج: إختلط. (تێكەڵ. تێكەڵاو. ئاوێتە) بوو.

إمتشط: مشطَ وسرحَ الشعر. قژى داهێنا. شانەى كرد.

إمتشق: إختلس/ دزى كرد. ئاخونەكى دا لێى هەڵگرت.

إمتشق: خطف. إختطف. پرى پياكرد. هەڵى بچڕوقان. فڕانى.

إمتشقَ: إستلَ. جرَدَ/ هەڵيكێشا. دەريهێنا.

إمتصَّ: تشرَّبَ/ ئاوى خواردەوە. تێرئاو بوو. هەڵيچنى.

إمتص: تمصمص. رشف/ هەڵيمژى. هەڵيلووشى.

إمتصاص: تشرُّب/ ئاوخواردنەوە. مژين. هەڵمژين. هەڵچنين.

إمتصاص الدماء/ خوێن مژين. خوێن ڕشتن. پياوخراپى.

إمتصاص الأموال: إبتزاز/ دزى. جەردەيى. ڕاووڕووت.

شريط الإمتصاص/ تيرۆژوى مژين.

إمتطى: ركبَ/ سواربوو. سەركەوت. هەڵزنا.

إمتطاء: ركوب/ سواربوون. سەركەوتن. هەڵزنان.

أمتع: جعلَه يَتَمتَّع أو يستمتع/ ڕايبوارد. كەيفى كرد. واى لێكرد ڕابوێرێ. لەخۆشيا بێ.

أمتعَ بـ: تمتّع بـ. تهنأ/ خێروخۆشی لێبینی. لەگەڵی ڕابیوارد.

إمتعاض: إستياء. غيظ/ بێزاری. وەڕسبوون. جاڕسبوون.

أمتعة: متاع. ممتلكات. شتومەك. کەلوپەل

إمتعضَ: إشمأز. إستاء. غضب/ (بێزار. تووڕە. وەڕس. جاڕس) بوو.

إمتقاع: تغيُّر اللون. شحوب/ ڕەنگ (پەڕین. گۆڕان هەڵبزڕکان).

إمتلّ مِلّةً: دَخل فيها. تَمَلّل. إعتَنَقَ/ چووە (ناویان. سەریان. سەر ئاین و باوەڕیان) بیروباوەڕیانی وەرگرت.

إمتلأ بـ أو من: صار مليئاً/ پڕبوو. لێوان بوو.

إمتلاء: مَلْوءة. ضد التفريغ/ پڕبوون. لێوان بوون.

إمتلاء الجسم: بدانة/ قەڵەوی. گۆشتنی. تێکسمڕاوی.

إمتلاك. حيازة. تملّك/ ساماندارێتی. بوون. دەستکەوتن. بوون بە خاوەنی سامان و دارایی.

إمتلَجَ الطفل مافي الثدي: مَلَجَ. مَصّهُ/ مژی. مەمکی مژی. شیری خوارد.

إمتَلك. مَلَكَ/ بووە خاوەنی. بووە مڵکی. کردیە موڵکی خۆی.

إمتنّ عليه بما صَنَعَ: مَنّ عليه بما صَنَعَ. ذَكَرَهُ وقطّعَهُ بمعروفه/ منەتی کرد بە سەریا. چی لەگەڵ کردبوو دایەوە بە ڕوویدا.

إمتنّ عليه بـ: أنعَم عليه بـ/ چاکەی لەگەڵ کرد. پێی بەخشی. دەستی گرت.

إمتناع عن: كفّ. إحجام/ واز (لێ) هێنان. دەست (لێ) هەڵگرتن.

إمتناع عن: رَفض. ضد قَبول/ نەکردن. قایل نەبوون. نەویستن.

إمتناع: تعذُّر. عَدَم الإمكان/ نەشیاوی. قەدەغە. نەگونجان.

إمتنان: شُكر. عرفان بالجميل/ پێزانین. سوپاس. سوپاسگوزاری.

إمتنَعَ عن: كَفّ. امسك. أحجم/ وازی هێنا. دەستی هەڵگرت.

إمتنَعَ عن: رَفض. أبَى/ قایل نەبوو. نەیویست. نەیکرد.

إمتنَعَ الشيء: تَعذَّر حُصُوله/ دەستنەکەوت. نەبوو شتەکە نیە. دەست ناکەوێ.

إمتنَع عن التصويت: رَفض التصويت/ دەنگی نەدا.

إمتنَعَ بـ: إحتمى وتقوّى بـ/ خۆی (پێ) پاراست. ئازاکرد).

إمتهان: إحتقار. إزدراء/ ڕسوابوون. سووکبوون. ئابڕووچوون. شکاندن.

إمتهان: تحقير. إذلال/ ڕسواکردن. سووک کردن. ئابڕووبردن. شکاندن.

إمتهان: إحتراف/ کردن بە پیشە.

إمتهان: إبتذال/ بەکارهێنان. پەڕپووت کردن. لەکەڵک خستن. بەربادکردن.

إمتهَنَ: إحتقَر/ ڕسوابوو. ئابڕووی چوو. شکا.

إمتهَنَ: حَقَر/ ڕسوای کرد. ئابڕووی برد. شکانی. سووکی کرد.

إمتهَنَ: إبتذَل/ بەکارهات. پەڕپووت بوو. لەکەڵک کەوت. بەرباد بوو.

إمتهَنَ مهنةً: إحترف/ پیشەیەکی گرت. کردی بە پیشە.

إمتهَنَ شخصاً: إستعمله للخدمة الحقيرة/ بۆ مەبەستی خراپ هەڵیسووڕان و ئیشی پێکرد.

إمتياز: تفوُّق/ سەرکەوتن. پێشکەوتن. زۆرباشی.

إمتياز: درجة إمتياز. درجة شرف/ پلەی شانازی.
إمتياز: حق خاص/ مافێکی تایبەتی. تایبەماف. تازیاری.
إمتياز: رخصة رسمية لمزاولة عمل/ کارماف. مافی کارکردن.
إمتياز: فرق/ جیاوازی. جیایی.
بإمتياز: بتفوق/ بەسەرکەوتنانە. بە پلەی شانازییەوە.
صاحب امتياز: صاحب الحق والرخصة/ خاوەن ماف. خاوەن کار.
أمثل: أفضل. كمال/ باشتر. چاکتر. تەواوتر.
رجل امثل. امرأة مثلى/ پیاو یا ئافرەتی بێهاوتا.
أمثولة: مثل. نموذج. درس/ نمونە. پەند. ئامۆژگاری.
أمجد: مجد. عظم/ گەورەی کرد. بەرزی کردەوە. ڕێزی لێنا. هەڵیدا. پیاهەڵدا.
أمجد: أكثر مجداً/ شکۆدارتر. لێهاتوو. بەسەلیقە. چاومار.
إمحى: تلاشى. إضمحل/ سڕایەوە. کوژایەوە. شوێنەواری نەما.
إمحاء: إزالة/ سڕینەوە. کوژاندنەوە. لابردن.
أمحص: ظهر من جديد/ دەرکەوتەوە. سەری هەڵدایەوە.
أمحص من المرض: برىء/ چاکبووەوە. هەڵسایەوە.
أمحضه الود أو الحديث: صدقه/ بڕوای (پێ) کرد. بە دڵی بوو.
أمحق المال: هلك/ ماڵ و دارایی نەما. فەوتا. بەفیڕۆ چوو. لەناوچوو.
أمحق القمر: دخل في المحاق/ مانگ (کەلی گرت. چووەکەلەوە. ونبوو).

أمحق: إنمحق. إضمحل وامحى/ لەناوچوو. نەما. فەوتا. کەم بووەوە. توایەوە.
أمحك: محك/ نازع في الكلام/ بە ناخۆشی و توورەیی و ناشیرینییەوە گفتوگۆی کرد. شەڕی لێنەبووەوە.
أمحك: محك: تمادى في اللجاجة/ (سوور. هەتەر. کەللەڕەق. لەوچە. ترۆ) بوو.
أمحل: محل: أجدب/ (ڕووت. گڕوێ. ڕووتەن) بوو. هچی تیانەما.
أمحل المطر: إنحبس/ باران بڕا. نەباری. بوو بە بێ بارانی.
امحل الأرض: جعلها محلة/ (ڕووت. گڕوی. ڕووتەن)ی کرد. هیچی تیانەهێشت.
أمحوضة: نصيحة خالصة/ ئامۆژگاری دڵسۆزانە.
أمد بـ: زود بـ. جهز/ بۆی نارد. شتومەکی پێدا.
أمد: أعان. ساعد/ یارمەتی دا. دەستی یارمەتی بۆ درێژکرد. پشتگیری کرد.
أمد الجند أو الجيش: عزز. قوى/ لەشکری بەهێزکرد. هێز و پێویستی تری بۆ نارد.
أمد: أمهل. أجل/ مۆڵەتی دا. دوایخست.
أمد الجرح: تقيح/ برینەکە کێمی. کێم و زوخی تێزا.
أمد الله عمره أو في عمره: أطال عمره/ خوا تەمەنی درێژی پێدا.
أمد: غاية. نهاية/ مەبەست. ئەنجام. کۆتایی.
أمد: فترة. وقت/ ماوە. کات.
طويل الأمد: أجل بعيد/ ماوەی درێژ.
قصير الأمد/ أجل قصير/ ماوەی کورت.
منذ أمد بعيد: منذ وقت بعيد/ دەمێکە. لە دەمێکەوە. لە زووەوە.

امدى: أمهل. ماوەی پێدا. مۆڵەتی دا. دوای
خست. حاپولکی دا. حاپولی دا.
إمداد: تزويد/ ناردن. بۆناردن. بەهێزکردن.
إمداد: معونة/ یارمەتی. پشتگیری کردن.
دەستگرتن.
إمداد: نَجدة/ بەهاناوەچوون. فراکەوتن.
أمر: طَلَبَ فعلَ شيء/ فەرمانی دا. پێی سپارد.
أمّرَ: امر: صار اميرا/ بوو بە میر
أمَرَ: شاوَرَ/ راوێژی کرد. پرسی کرد
أمرهُ: كلفهُ/ رایسپارد. پێی سپارد. فەرمانی
پێدا
أمرَّ: جعلهُ يمرُ/ تێپەڕان. هێشتی تێپەڕی. ڕێیدا
تێپەڕێ.
أمرَّ يدهُ على الشيء: جعلها تمرُ/ دەستی (پیاهێنا.
لێخشان).
أمرّ الشيءُ: صيّرهُ مُرّاً/ تاڵی کرد.
أمرّ الشيءُ: صار مُرّاً/ تاڵ بوو.
أمرّ: أكثر مرارةً/ تاڵتر.
أمرّ: أقوى/ بەهێزتر. بەتواناتر.
قاسى أو ذاقَ الأمرّين: كابدَ وعانى الشرَّ
والشقاء/ دەردو ناخۆشی چەشت. بەڵای
بەسەرهات.
أمّرَ: جعلهُ أو عيّنهُ أميراً/ کردی بە میر. بە میر
دایمەزران.
أمّرَ: فوّض. ولّى. أعطى السلطة/ دەسەڵاتی پێدا.
أمر: فرض. تعليمات/ فەرمان.
أمر: سُلطة/ دەسەلات. هێز. زەبروزۆنگ.
أمر: تفويض/ دەسەلات پێدان. ڕێپێدان.
متمانەپێکردن.
أمر: شأن. مسألة/ کێشە. کار. فرمان. ئیش.
کردار.

امر: حال/ چۆنیەتی. بارودۆخ.
أمر: شيء/ شت. شتومەك.
امر: صيغة الأمر في النحو/ کرداری فەرمانی
أمر إداري/ فەرمانی کارگێڕی.
أمر رسمي/ فەرمانی میری.
امر عال. مرسوم/ بالأفەرمان.
أمر محقق او واقعي: منتبه/ فەرمانی کۆتایی
پێهاتوو.
امر بديهي/ فەرمانی بەڵگەنەویست. بێگومان
امر معروف/ کارێکی دیار و ئاشکرا.
أمرٌ ما: شيءٌ ما/ فرمانێك. کارێك. کردارێك
شتێك.
لأمرٍ: له/ بۆ ئەو.
تحت أمرك: طوع أمرك/ بفەرموو. لەژێر
فەرمانتایە.
في أول الأمر: في باديء الأمر/ هەر لە سەرەتاوە.
لەسەرەتای کارەوە.
قضي الأمر: إنتهى الأمر/ کارتێپەڕی. کار لە کار
ترازا. بەسەرچوو.
مهما كلّف الأمر: مهماكان/ چی ئەبێ ببێ.
هەرچەندی تێبچێ.
مهما يكن من أمر: مايحدث فليحدث/ چی ئەبێ
باببێ.
صاحب الأمر/ خاوەن فەرمان و دەسەلات.
ولي الأمر/ المسؤول عن المكلف بالاشراف والاعالة/
خاوەن. بەخێوکەر. بەرپرسیار. گەورە.
أُلوالأمر: رؤساء وعلماء/ کاربەدەست و زانایان.
بەرپرسیاران.
هو بين أمرين: بين خيارين/ دوو (ڕێ. بڕیار.
ئەنجام)ێ لەبەردەمایە. دارێکی بە دەستەوەیە
هەردوو سەری درکاویە.

آمر: صاحب الآمر. حاكم. قائد/ فەرماندە. فەرمانڕەوا. خاوەن فەرمان. بەڕێوەبەر.

آمر: مُتآمر. مُستبد. غطريس. مُسيطر/ زۆردار. کەللەڕەق.

الآمر الناهي: المُستبد. الحاكم المطلق/ دیکتاتۆر. زۆردار. فەرماندەی زۆردار.

إمَر. إمَرة. امَر: غبي. ضفيف الرأي/ گێل. گەوج. گەمژە. هیچنەزان.

امرء: رجُل. شخص. پیاو. کەس.

إمرأة: مرأة (الجمع نسوة. نساء)/ ژن. ئافرەت.

إمرار: تمرير. إجتياز. عُبور/ تێپەڕاندن. گوزەرکردن. تێخستن. پیاکردن.

إمرة: سُلطان. سطوة. نُفوذ. دەسەلات. گەورەیەتی. زەبروزەنگ.

أمرد: للحية له. کۆسته.

أمرد: عليم الشعر. أجرد. أصلع/ پرووتاوە. سەر بێ تووک.

أمرض: أسقم. جعله مرضا سقيماً/ نەخۆشی خست.

أمرط: لاريش عليه/ بێپەڕ. تووڵەك.

أمرط: لاشعر له: أجرد. أصلع/ پرووتاوە. سەر بێتووك.

أمرغ: سالَ لعابهُ أثناء النوم/ کەف و لیك بەدەمیا هاتە خوارێ. دەمی ئاوی لێهات. لە کاتی نوستندا.

أمرغ مرضهُ: مرّغ عرضهُ. دنّسهُ/ ناموسی شکان. ئابڕووی برد.

أمرغ العجين: أكثر ماءهُ حتّى رقّ/ ئاوی (کردە هەویرەکەوە. تێوەدا). شلی کردەوە.

امروغة: أرض خصيبة/ زەوی بە پیت و فەڕ.

أمس: البارحة/ دوێ. دوێنێ. دوێك. دۆنی.

أمس: يوم من الأيام الماضية/ ڕۆژێك لەمەوبەر.

أمس: بالأمس. مؤخراً/ لەم (چەنانەدا. ڕۆژانەدا. دواییەدا).

أمس الأول. يوم قبل البارحة/ پێرێ.

مساء أمس. البارحة مساءً/ دوێنێ ئێوارە.

أمَس: أمَس الحاجة. في حاجة مُلحة/ زۆر پێویستی. ناچاری.

امسى: دَخَل في المساء/ بوو بە ئێوارە. ئێوارە هات.

أمسى: صار/ بوو. بوو بە.

امساك: مسك. قبض/ گرتن.

إمساك: تقشّف. إمتناع/ واز (لێ) هێنان. دەست (لێ) هەڵگرتن.

إمساك: بُخل/ ڕژدی. دەست قوچاوەیی. چکۆسی. پیسکەیی.

إمساك: قبض البطن والأمعاء/ قەبزیوون. گرفت. سك دەرنەچوون.

إمساك عن: كفّ. إمتناع عن بعض الأكل/ دەم گرتنەوە. پارێزکردن. خواردن کەمکردن.

إمساك في رمضان: إنقطاع عن الأكل والشرب. إبتداء الصيام/ وەستان لە خواردن. بەڕۆژووبوون.

إمساكية: تقويم الصوم/ ڕۆژنامەی (بەڕۆژوبوون. ڕەمەزان).

أمسكَ بـ: قَبَضَ/ گرتی.

أمسكَ عَن: كفّ عَن. إمتَنَع عن/ وازی (لێ) هێنا. دەستی (لێ) هەڵگرت.

أمسكَ البطنَ أو الأمعاء: قبض/ قەبز بوو. گرفتی کرد. سکی دەرنەچوو.

أمسكَ بـ: تَمَسَّك بـ. تَعَلَّقَ أو تَشَبَّثَ بـ/ پێوەی نوسا. تێوەی ئاڵا. پیالکا.

أمسَكَ الشيءَ على نفسه: حَبَسهُ/ لە خۆی (گرتەوە. کەم کردەوە).

أمسك عن الكلام. أمسك لسانهُ: صمتَ/ بێدەنگ بوو. قسەی نەکرد.

أمسية: خلاف صُبحية/ ئێوارە. سەر لە ئێوارە.

أمشى: جعلهُ يمشى/ بردى بەڕێوە. وای لێکرد. بڕوا. ڕوانی.

أمشى البطنَ. أمشاه الدواء: أطلق بطنه و أسهلهُ/ سکی دەرچوان. ڕەوانی کرد. بەلەفیرەی پێخست.

أمشقهُ بالسوط: ضربهُ/ بە قامچی (لێی دا. دایگرتەوە). قامچی پیاکێشا.

أمضَّ: آلم. عذَّب. أوجع/ ئێشانی. (ئێش. ئازار)ی هەبوو. ئازاری دا

أمضى وقتاً: قضى. صرفَ/ کاتی بردەسەر. کاتی زۆری ویست.

أمضى الأمر: أنفذهُ. أنجزهُ/ جێبەجێی کرد. ڕایپەڕان. بەجێی هێنا. بردیە سەر.

أمضى: وقَّع/ ئیمزای کرد. شەقڵی (لێدا. کرد).

إمضاء. إمضاءة: توقيع/ ئیمزا. شەقڵ.

إمضاء: إتمام: إنجاز/ جێبەجێکردن. ڕاپەڕاندن. بەجێهێنان. بردنەسەر.

أمطى: إمتطى. ركب/ سواربوو. سەرکەوت. هەڵزنا.

أمطرَت السماءُ: نزَل مطرها/ باران باری. دایکردە باران. باری. ڤاری.

أمطرتهم السماءُ: أصابتهم بالمطر/ باران لێی دان. بارانیان لێ باری.

أمطرهُ بوابل: أنزل عليه بغزارة/ بەسەریا داباری. دایباران. ڕژا بەسەریا.

إمَّع. إمَّعة. رجل المُوافقة. مُراء/ دووڕوو. بەوپیاوە ئەڵێن کە هەر ئەڵێ (بەڵێ وایە)

إمعان: تمادٍ. إفراط. تطرُّف/ زیادەڕەوی. زۆرلێکۆڵینەوە.

إمعان النظر: تمعُّن. تروٍّ. تفحُّص/ تێڕوانین. بیرلێکردنەوە. دیقەت لێکردن.

إمعان في العمل. تصرُّف بحزم وهمَّة ومثابرة. جدّ/ بەدڵ (ئیش کردن. تێکۆشان). کرداری چاك. کۆڵنەدان.

امعط: لاشعر لهُ/ ڕووتاوە. بێتووك. کۆستە توولەك.

أمعن في: تمادى. افرطَ. بالغَ/ زۆر لێی کۆڵیەوە. زیادەڕەوی کرد.

أمعن في: تصرف بحزم وبهمَّة. جدّ. كدّ. واظب/ توندوچابووکانەکار کرداری کرد.

أمعن النظر في: تمعَّن فيه. تفحص فيه. تروَّى بفكر/ تێبینی کرد. تێڕوانی. بیری لێکردەوە. دیقەتی لێکرد.

أمغر: خمري/ ڕەنگی شەرابی. سووری دێز.

أمغض: سبَّب له مغصاً/ سکی هێنایە ئێش. لێی بوو بە ژان.

إمكان: إستطاعة. قُدرة. مقدرة/ توانین. توانست. هێز. تین.

إمكان: إمكانية. إحتمال/ شیان. گونجان. ڕێتێچوون. لووان.

عند الإمكان/ بە گوێرەی توانا. ئەگەر توانرا.

قدر الإمكان. على قدر أو بقدر الإمكان: على قدر المستطاع/ بە گوێرەی توانا.

في إمكانية أن: يُمكنُه أن. أمكنه/ ئەتوانی بیکا. لە توانایا هەیە. پێی ئەکرێ. بۆی ئەکرێ.

أفكر: مكر بـ. خدع/ (فێڵ. كزی)ی کرد. خەڵەتانی. هەڵیخەڵەتان.

أمكنهُ الأمر: يُمكنه أن. إستطاع/ تواني بيكا. پێی کرا. بۆی کرا.

إذا أمكن: إن إمكن. اذا في المستطاع/ ئەگەر ئەکرێ.

يُمكن: رُبَّما/ رەنگە. لەوانەیە. ئەگونجێ. ئەشێ. رێی تێئەچێ

لايُمكن: مستحيل. غير مُمكن/ نابێ. ناشێ. ناگونجێ. رێی تێناچێ.

اقلّ مايُمكن/ کەمترین (گونجان. شیان توانست) چەند لە توانادا بێ.

اكثر مايمكن/ زۆرترین (گونجان. شیان. توانین).

امل: أمَلَ: رجا. تَرَقَّب/ بە هیوا بوو. بەتەما بوو چاوەڕوان بوو

أمَّلَ: جَعلهُ يأمل/ بە تەمای کرد. هیوای نەبڕی.

أمِلَّ: أضجرَ/ بێزاری کرد. وەڕسی کرد. بێتاقەتی کرد. کۆڵی پێدا.

أمَلَّهُ (أو عليه) الكتاب: أملاه. ألقاهُ عليه يكتُبهُ/ پێی نووسیەوە.

أمل: رجاء مُطمع/ هیوا. هێڤی. ئامانج. ئاوات. تەما. بەتەمابوون. داخوازی. ویستن. هومێد. ئومێد. کام. کاو.

خيَّبَ املَهُ أو آمالَهُ: أحبط سعاهُ/ هیوای بڕی. نائومێدی کرد.

خيبة أمل: إحباط. خبوط المسعى. قطع الرجاء/ هیوابڕین. نائومێدی.

فقد أو قطع الأمل: قطع الرجاءَ: يأس/ دەستی لێشت. هیوای نەما. بەتەما نەما.

آمل: مُرتَجٍ. مُتَرَقِّب/ هیوادار. بەتەما. بە ئومێد. ئومێدەوار.

أملى على: لَقَّنَهُ. إستكتبهُ/ پێی وتەوە. پێی نووسیەوە. فێری کرد.

أملى الله عمره: أطاله ومتَّعهُ به/ خوا تەمەنی درێژکا و خێر و خۆشی ببینێ.

أملى له: أرخى له. امهله/ جڵەوی بۆ شلکرد. دای بە دەمیەوە.

املاء: إستكتاب. تلقين/ پێوتنەوە. پێنووسینەوە فێرکردن. ئیملا

املاح: جمع ملح/ سوێرەمەنی.

املاسَ: صار املس/ سافبوو. لووسبوو

املاس من الأمر: تملّص. افلت وتخلّص/ دەرپەڕی. رایکرد. ڕزگار بوو. خۆی ڕزگارکرد.

املاق: فقر مُدقع/ نەبوونی. هەژاری.

أملح: مَلَح. صار مالحاً/ سوێر بوو. خوێیاوی بوو.

أملح: أسود يعلوهُ البياض/ رەش و سپی. رەش دێز.

أملد. أُملود: غُصنٌ غض. طري/ توول. شوول. شوولك.

إملس: ناعم. زُلق/ ساف. لووس. سالووس. خز. تاس. خلیسك.

إملس: إنملَسَ. تملّص: أفلت وتخلّص. تهرّب/ دەرپەڕی. رایکرد. ڕزگار بوو. خۆی ڕزگار کرد.

أملط: لاشعر له. أملس/ بێ تووك. كۆستە. تووڵەك.

أملطت الحامل جنينها: أسقطته لغير تمام/ منداڵەکەی لەبارچوو. بە نەبەکامی فڕێیدا.

أملق: إفتقر/ هەژارکەوت.

أملكهُ الشيء: جعله مُلكاً له/ دای پێی. کردی بە (هی ئەو. موڵکی ئەو).

أملكهُ عليهم: صيرهُ ملكاً/ کردی بە (پاشا. شا).

أملوحة: مُلحة. طُرفة. حديث لذيذ/ قسەی خۆش. نوکتە.

أملود: أملد. الناعم اللين من الناس/ ئاسکۆڵە. شلەپەتە. زەلامی شلەپەتە.

امّ الشيء: جعله مَلكاً للأمة/ دەستی بەسەراگرت. داگیری کرد. گەلاندی. خۆماڵی کرد.

أمم: جمع أمة: شعوب. گەلان. نەتەوەکان.

الأمم المتحدة/ نەتەوەیەکگرتووەکان.

أممي نەتەوە پەرست.

وثني بت پەرست

أممية: اشتراكية. سۆشیالیزم

امن امن: إئتمن. وثق بـ. باوەڕی کرد. دڵنیابوو. متمانەی (پێ) کرد.

أمن: كان امينا. دەستپاك بوو. پازگر بوو. ئەمین بوو

أمن: إطمأن. دڵنیابوو.

أمن بـ: إعتقد بـ. صدق/ بڕوای پێکرد.

آمن بـ: وثق بـ/ باوەڕی کرد. دڵنیابوو. متمانەی (پێ)کرد.

أمن: أضعف/ بێهێزی کرد. هێزی لێبڕی.

أمّن: طمأن/ دڵنیای کرد.

أمّن (على أو ضد): ضمن/ بیمەی کرد. دەستەبەری کرد. تەئمینی کرد.

أمّن: ضمن. كفل/ زامنی سەند. بارمتەی (بۆ دانا. بۆ وەرگرت).

أمّن: حقق. وفر/ دابینی کرد.

أمن: طمأنينة. سلام/ دڵنیایی. ئاسایش. ئاشتی. ئاسوودەیی.

أمن: أمان. ضد خطر/ دڵنیایی. بێوەیی. بێزیانی.

الأمن العام/ ئاسایشی گشتی.

مجلس الأمن/ ئەنجومەنی ئاسایش

الإخلال بالأمن/ ئاژاوەنانەوە.

المحافظة على الأمن/ پاراستنی ئاسایش.

دائرة الأمن/ ئاسایش. فەرمانگەی ئاسایش.

آمن: مأمون. مؤتمن. يأمن به الناس/ جێی باوەڕ. باوەڕی پێ نەکرێ.

آمن: مطمئن/ دڵنیا.

آمن: غير خائف/ بێ ترس. ناترسی. چاو قایم.

امنى: قذف المني/ ئاوی هاتەوە.

أمنى الدم: أراقه/ خوێنی ڕشت.

امناء: قذف المني/ ئاوهاتنەوە. ئاوهێنانەوە.

امنة: يثق بكل الناس/ ساویلکە. بەسزمان. خۆشباوەڕ. باوەڕی بەهەموان هەیە

أمنة: موثوق به/ باوەڕپێکراو. جێباوەڕ.

امني: خاص بالأمن/ پەیوەندی دار بە ئاسایشەوە.

أمنية: بغية. مرام. مايتمنى/ داخواز. داخوازی. داوا. مەبەست. ئاوات.

إمهال: إعطاء. مهلة. إرجاء. تأخير/ ماوە (پێ)دان. هەل پێدان. دواخستن.

أمهر المرأة: جعل لها مهرا/ مارەیی (دایە بۆبڕیەوە).

أمهر المرأة: زوجها/ دای بەشوو. مارەی کرد. مارەی بڕی.

أمهق: شديد البياض. أبيض البشرة والشعر/ زۆر سپی. لەش و مووسپی.

أمهل: أرجا. أخر/ مۆڵەتی دا. دوایخست. کاتی تری پێدا.

الله يمهل ولايهمل/ خوا مۆڵەت ئەدا. فەرامۆش ناکا.

أموأ الهر: ماء/ پشیلە میاوانی وتی میاو.

أموال: جمع مال/ ماڵ و دارایی.

اموال منقولة: أمتعة وممتلكات متحركة/ زیندەماڵ. ئەوماڵەی توانای گواستنەوەی هەیە.

أموال غير منقولة: عقارات واملاك/ مرده مالْ. خانوبەرە كەناتوانرێت بگوێزرێتەوە.

أمومة/ دايكايەتی.

الأمومة والطفولة/ دايكايەتی و منداڵێتی.

أمونيا: غاز/ نەوشادر.

أمونيوم/ ئەمۆنيۆم.

أمي: غير متعلم/ نەخوێندەوار.

أمي: جاهل/ نەزان. نەفام. دواكەوتوو.

أمي: مختص بالأم/ دايكانە. پەيوەنديدار بە دايكەوە.

أميبا: وحيدة الخلية/ ئەميبا.

أمية: جهل القراءة والكتابة/ نەخوێندەواری.

أمية: أمومة. صفة الأم/ دايكايەتی.

أمير: سليل الملوك والأمراء/ شازادە. میركوڕ. بەرەی پاشايان.

أمير: رئيس/ سەرۆك. فەرماندە. فەرمانڕەوا. سەرگەورە. سەرەك.

أمير المؤمنين: عمر بن الخطاب/ عومەری كوڕی خەتاب.

أميرة: زوجة أو إبنة الأمير/ میركچ. شاژن. خاتوون. قەراڵيچە.

الأميرة الحمراء: فراشة/ پەپوولە سوورە. پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگ.

أميري: حكومي. تملكه الدولة/ میری.

أمين: موثوق مستقيم/ جێ باوەڕ. باوەڕپێكراو. ڕاستاڵ.

أمين: وفي/ دڵسۆز. بەوەفا.

أمين: ضد خائن/ سەرڕاست. پاك.

أمين: مأمون. غير خطر/ بێترس. مەترسی لێ ناكرێ.

أمين: غير مؤذ/ بێوەی. بێزيان.

أمين السر/ ڕازگر. ڕازدار.

أمين المخزن/ كەنجينەوان.

أمين المكتبة/ بەڕێوەبەری كتێبخانە.

أمين العاصمة/ سەرۆكی شارەوانی پايتەخت.

أمين الصندوق/ ماشێر. خەزنەدار.

أمين عام/ ئەميندارى گشتى. سەرڕاستى گشتى.

غير أمين: خائن. غير موثوق/ ناپاك. باوەڕی پێناكرێ.

أمين: فليكن/ ئامين. ياخوا. باوابێ.

آن: حان. دنا/ كاتێتی. وەختێتی.

آن الأوان: حان الوقت/ كاتی هاتوە. وەختی هاتوە. كاتێتی.

أنّ: تأوه/ نركانی. ناڵانی. ئاخی هەڵكێشا.

آن: وقت. حين/ كات. جار.

الآن: حالياً. في الوقت الحاضر/ لەم كاتەدا. هەر ئێستە. ئێستە. نووكە. نهۆ. هەنووكە. نوها.

ليس الآن: وقت آخر/ جارێ. ئێستەنا. كاتێكی تر. دەمێكی تر.

حتى الآن. الى الآن. للآن. لغاية الآن/ تا ئێستە. تا ئەم كاتە.

في آن واحد. في آن معاً. في آن/ لەيەك كاتدا.

قبل الآن: سابقاً. آنفاً/ پێش ئێستە. لەمەوپێش.

آناً بعد آن: بالتدريج/ وردەوردە.

من آن لآخر. مابين آن وآخر. آناً بعد آن: من وقت لآخر/ ناوبەناو. جار لە دوای جار. جاروبار.

من الآن فصاعداً. بعد الآن. منذ الآن/ لە ئێستەبەدواوە. لەم كاتە بەدواوە. لەمەولا. لێرەوپاش.

أن/ ئامرازی دڵنياكردن (تەئكيد)

أن لا: ألا/ بۆئەوەی. نەوەكو.

الا أن: غیر أن/ ئەگەرچی.

الی أن:: ریثما. حتی/ تا. هەتا. هەتاکو.

علی أن: بشرط أن. علی شرط أن/ بەو مەرجەی.

ان: إذا. لو/ ئەگەر.

ان لم: مالم. تاکو. ئەگینا.

انما: لکن/ بەلام. ئەوەندە هەیە.

ان شاءالله: شاء/ خوابیکا.

أنّ

بما انّ: لأنّ. لەبەرئەوەی. بەوەی کە

علی انّ: مع انّ. حیث/ کەچی. لەکاتێکدا. لەگەلّ ئەوەی.

لأنّ: چونکە. لەبەرئەوەی.

أنّی: تمهّل/ شێنەیی بوو. لەسەرخۆ بوو.

أنی: أنَی: دنی وقرب. حان/ کاتی هات. نزیك بووەوە.

أنی: أنَی: تأخر. أبطأ/ دواکەوت.

أنی: أنَی: أخر. بطأ/ دوایخست.

أنا: ضمیر المتکلم/ من. ئەز.

الأنا: الذات. النفس/ خۆ.

أنّی. ظرف زمان: متی/ کەی.

أنّی. ظرف مکان: أین/ لەکویّ.

أنّی. إستفهامیة: کیف/ چۆن.

أنأی: أبعد. بعد/ دووری خستەوە.

أنأی: أبعد. أکثر بُعداً/ دوورتر.

أناءهُ الحمل: ناء به الحمل. أثقل کاهلة/ بارەکەی گرانبوو. بە بارەکەیەوە نالأندی. شانی داخست.

إناء (الجمع آنیة وأوان) وعاء. ماعون/ قاپ. قاپ و قاچاخ. دەفر. جام.

أوان خزفیة: فخاریة/ گلّێنە.

أوان زُجاجیة: مصنوعة من الزجاج/ شووشەمەنی.

أوان معدنیة: مصنوعة المعادن. مس و فافۆن.

أناب: وکّل. فوّض/ لەجێی خۆی داینا. کردی بە نوێنەری خۆی. پێی سپارد.

أناب الی: رجع مرة بعد مرة. زۆرجار گەرایەوە. چەند جار سەری دا و ئامشۆی کرد.

اناب إلی الله: اقبل وتاب. روویکردە خوا. تۆبەی کرد.

إناب: تفویض. توکیل. لەجێدانان. کردن بە نوێنەر. پێسپاردن. دەسەلات پێدان.

إنابة قضائیة: إستنابة قضائیة. بریکارێتی لە دادگادا.

أنابیب (جمع أنبوب) لوولە. بۆری.

الأنابیب المستطرقة/ بۆریە پێچپێچەکان.

أناة: تأنّ. حلم. صبر. تمهّل/ ئارام. حەوسەلە. لەسەرخۆیی. پەلەنەکردن.

طول الأناة: صبر. جلد. ئارامگرتن. بوونی حەوسەلە و لەسەرخۆیی.

طویل الأناة: طویل البال والرّوح. صبور. مُتأن/ بە ئارام. لەسەرخۆ. ڕیخۆلەبەکێش. خۆڕاگر. خوددار.

أناخ الجمل: أبرکهُ/ وشترەکەی یخدا. چۆکی پێدادا.

أناخ بالمکان: أقام بە/ لە جێگەکەدا مایەوە. هەلّیدا. دایکوتا.

آنئذ: حینئذ. عندئذ/ ئەوکاتە. لەوکاتەدا.

أنار: أضاء/ رووناکی کردەوە. رووناکی تێخست.

أنار المسألة: أوضحها/ روونیکردەوە. راڤەی کرد. لێکی دایەوە.

أثار العقل: ثقّفَ/ هۆش و بیری ڕۆشنکردەوە. پەروەردەی کرد.

إثارة: تنوير. إشاعة. ڕووناک کردنەوە.

إثارة العقول: تثقيف/ پەروەردەکردن. تێگەیاندن. فێرکردن.

أثاس: حرك. ذبذب/ جووڵانی. لەرانیەوە.

أُناس: ناس. بشر. انسان/ مرۆ. مرۆڤ. خەڵک. مەردوم. کەس. پیاو.

أناط بـ: فوّض. خوّل. عهد الى/ پێی سپارد ڕایسپارد.

اناط: علّق/ هەڵیواسی. بەستی پێیەوە. بەستیەوە.

أناط عليه الأمر: علقهُ عليه/ کارەکەی پێوەبەست. بەستیەوە.

إناطة: تفويض. تخويل. تكليف/ پێسپاردن. ڕاسپاردن. دەسەڵات پێدان.

أناف على: أشرف. أطلّ/ ئەیڕوانی. بەسەریا ئەڕوانێ.

أناف على: زادَ/ (زۆرتر. زیاتر. پتر) بوو. تێپەڕی.

أناف: إرتفع/ بەرزبووەوە. بەرزبوو.

أناقة: كياسة. ظرافة. حسن/ ڕێك و پێكی. جوانپۆشی. کەشخەیەتی. تەرپۆشی.

أنال: أعطى/ دایە. پێی دا. دایە دەستێ.

أنال: حصّل. أحرز/ دەستی کەوت. بەدەستی هێنا.

أنام.. نُوِّم/ دەخەوێت. خەواندی.

الأنام. الأنام: إنسان. بشر. الجنس البشري/ مرۆڤ. ئادەمیزاد.

أناناس: من الفواكه/ ئەناناس.

أناني: مُحِبّ نفسهُ. لايهتمّ إلا بأمر نفسه/ خۆ (پەرست. خۆشەویست). تەن پەروەر.

أناني: وَصولي. أثر/ هەلپەرست. بێویژدان.

أنانية: حبّ الذات. آثر/ خۆپەرستی. تەن پەروەری. هەلپەرستی. منی.

أنّب: وبّخ. لامَ/ سەرزەنشتی کرد. تانووتی لێدا.

أنّبهُ ضميرهُ: شعر بالندم/ دەروونی سەرزەنشتی کرد. پەشیمان بووەوە. هۆشی هاتەوە.

أنبأ بـ: اخبر بـ: اعلن. بلغ الخبر/ هەواڵی گەیان. بڵاویکردەوە. ڕایگەیان.

أنباء: اخبار/ هەواڵ. دەنگوباس

نشرة انباء/ دەنگوباس. هەواڵەکان.

وكالة انباء/ ئاژانس. پەیامنێر. ئاژانسی دەنگوباس.

إنباء: إخبار/ ڕاگەیاندن. بڵاوکردنەوە.

إنباء: طرد من المركز/ دەرپەڕاندن.

أنبار: مخزن/ عەمار. گەنجینە. کۆگە.

أنبار (جمع نبر): ذباب الخيل والغنم/ مێشەکەرانە. مێشەسەگانە. سێ.

إنباع: بيع/ فرۆشرا.

أنبت الغلامُ: بلغ مبلغ الرجال/ بوو بە پیاو. پێگەیی. بلوق بوو.

أنبت الزرعُ: نبتَ/ ڕووەك ڕووا. دەرهات. سەوز بوو.

إنبتّ: حسم. قرّر/ بڕێنرایەوە. بڕیاردرا. کۆتایی هێنرا. یەکلایی بووەوە.

إنبتّ: إنقطع. قطع/ بڕرا. قرتێنرا. لێی کرایەوە.

إنبتر: بتر. قُطعَ/ بڕرا. قرتێنرا. لێی کرایەوە.

إنبثّ: نُشر. إنتشر/ بڵاو (بووەوە. کرایەوە). ڕاگەیەنرا.

إنبثّ: فُرّق. تفرّق/ بڵاوبووەوە. بڵاوەی (پێکرا. لێکرا). پەرش بوو.

إنبثّ في الراديو والتلفزيون: أُذيع/ بڵاوكرايەوە. ڕاگەیەنرا.

انبثاق: خروج. تدفق. فيض/ دەرپەڕین. فیچقەکردن. هەڵقوڵان. هەڵسان.

إنبثاق الفجر: بزوغ تبلّج/ شەبەقدان. ڕۆژبوونەوە.

إنبثق: إنفجر وفاض. هەڵقوڵی. بنچقەی کرد. دەرپەڕی. هاتەدەرێ. ئاوهەڵسا.

إنبثق الفجر: تبلج. بزغ. ظهر الفجر/ شەبەقی دا. ڕۆژبووەوە.

إنبجاس: تدفق. إنفجار. فيضان/ هەڵقوڵان. دەرپەڕین. فیچقەکردن. ئاوهەڵسان.

أنبجس الماءُ: إنفجر. تدفق/ هەڵقوڵا. دەرپەڕی. فیچقەی کرد. ئاوهەڵسا.

أنبذ: طرد من المركز/ دەرپەڕان.

إنبرى لـ: تصدى. إعترض/ بەرووبا هەڵگەڕایەوە. لەڕوویا وەستا. بەرپەرچی دایەوە. ئاکسیبەچە بوو. سپڵە بوو.

إنبرى لـ: تولّى. باشر. تعهد. أخذ على عاتقه/ گرتیە ئەستۆی خۆی. دەستی پێکرد.

إنبرى: بُري. بلي بالحك. تآكل/ خورا. داخورا. سووا.

إنبرم: أقرّ. صار مبرماً/ بڕیاری لەسەر درا.

إنبرم. عُقد/ بەسترا. گیرا. پێکهات.

إنبرم: فُتل/ بادرایەوە. ڕێسرا.

إنبساط: إمتداد. تمدد/ کشان. فراوانبوون. تەختبوون.

إنبساط: سرور. مرح/ پێخۆشحاڵی. شادمانی. دڵخۆشبوون.

إنبسط: إمتدّ/ کشا. درێژبوو. فراوان بوو. تەخت بوو.

إنبسط: سُرّ. مرح. إنشرح/ پێخۆشحاڵ بوو. شادمان بوو. دڵخۆش بوو. خۆشنود بوو.

أنبط الماء أو البئر. نبط. إستخرج الماء/ ئاوی (دەرهێنا. دەردا). هەڵیهێنجا.

إنبطاح: تبطّح. إستلقاء/ لەپەڕووکەوتن. لەسەرشتکەوتن. ڕاکشان.

إنبطح: تبطّح. إستلقى. پاڵکەوت. ڕاکشا. درێژ بوو.

إنبعاث: نهضة. إستعادة النشاط والقوة/ هەڵسانەوە. بووژانەوە. ئاه پیاهاتنەوە.

إنبعاث: قيامة/ زیندووبوونەوە. ژیانەوە. قەژاندن.

إنبعاث: إنبثاق/ دەرپەڕین. هاتنەدەر. پەیابوون.

إنبعث من: إنبثق. خرج نبّح/ دەرپەڕی. هاتەدەر. پەیابوو.

إنبعث: أرسل/ نێررا. ناردیان.

إنبعث: نشط من جديد. إستعاد نشاطه أو قوته/ هەڵسایەوە. بووژایەوە. ئاهی پیاهاتەوە.

إنبعث من الموت: جدد الحياة/ زیندووبووەوە. ژیایەوە.

إنبغى: وجب. أصبح لازماً ضرورياً/ پێویست (بوو. وابوو) ئەبوایە.

إنبغى: كان مرغوباً فيه مستحباً مناسباً/ ئەویسترا. گونجاو بوو. لەبار بوو.

إنبغى له أو عليه أن. يجب. يلزم/ پێویست بوو لەسەری. لەسەریەتی کە.

كما ينبغي. كما يقتضي. كما يجب/ چۆن ئەکونجێ. وەك پێویست.

لاينبغي لك أن تفعل ذلك. لايتيسّر/ بۆت نیە بیکەی. نابێ.

إنبلاج الفجر أو الصبح. بزوغ الفجر. طلوع النهار/ ڕۆژبوونەوە. ڕووناکبوونەوە. شەبەقدان.

إنبلج الصبحُ او الفجر. أشرق وأضاء/ ڕۆژبووەوە. دنیا ڕووناکبووەوە. شەبەقی دا.

انبه: نبهَ. ايقظ/ هەڵیسان. ڕاپەڕان. ئاگاداری کردەوە

انبهت: بُهت. دهش. تحيّر/ سەرسام ما. سەری سوڕما

انبهر: إنقطع نفسهُ/ هەناسەی سواربوو. هەناسەبڕکێی پێکەوت

انبهر بصرهُ: سدر بصرهُ/ بەشەوارە کەوت. ئاوی چاوی داهات. چاو ڕێشکەوپێشکەی کرد

أنبوب: ماسورة/ لوولە. بۆری. قامیش. جووزەلە. دووزەلە.

أنبوب: مابين العقدتين من القصب/ لوولەی قامیش.

أنبوب الإختبار/ (لوولە. شووشە)ی تاقیکردنەوە.

أنبوب شعري/ مولوولە. لوولەموو. دەزوولە.

أنبوب الماء/ سۆندەی ئاو.

أنبوبي: مجوف/ ناوبەتاڵ لوولەیی. ناوکلۆر.

أنت. أنتِ/ تۆ.

أنَّهَ: أنين. تأوه/ نرکەوناڵە. ناڵەناڵ نرکەنرک. نووزەنووز. ناڵین. ناڵ.

أنتأ: أبرز/ ئاوسانی. دەرپەڕان. هەڵتۆقان. بڵقی کرد.

إنتأى عن: نأى عن. بعُد/ دوورکەوتەوە.

إنتأى عن: تنأى عن. إبتعد/ دوورکەوتەوە.

إنتاء: إبراز/ ئاوساندن. دەرپەڕاندن. هەڵتۆقاندن. بڵقپێکردن.

إنتابهُ أمرٌ: أصاب. حدث له. حلّ به/ تووشی بوو. بەسەری هات.

إنتاب مكاناً: قصد اليه/ بۆی چوو. سەری لیدا. جاری تر بۆی چووەوە.

إنتابهُ أفكار: جاءتهُ/ (بیر. بیرۆکە. بۆچوون)ی بۆهات. هات بەبیریا

إنتاج (مصدر انتج): صنع/ دروستکردن. دەرهێنان. وەبەرهانین. بەرهەمهێنان.

إنتاج: محصول. غلة/ بەر. بەرهەم. بەروبووم. دەسکەوت. هاڵ

إنتاش: إنبات/ چەکەرەکردن. دەرهاتن. سەردەرهێنان.

إنتان: تعفّن/ بۆنکردن. بۆگەنکردن. خراپبوون.

إنتباه: إلتفات. إصغاء. يقظة/ وریایی. تێبینی. ئاگاداری. وشیاری. هۆشیاری. سەرنجدان.

إنتبذ: تنحى/ لاچوو. دوورکەوتەوە.

إنتبذ النبيذ: عملهُ/ (مەی. شەراب)ی درستکرد.

إنتبذ العنبُ أو التمرُ: صار نبيذاً/ بوو بە مەی. شەراب.

إنتبر: تورّم وارتفع/ ئاوسا. بڵقی کرد. هەڵتۆقی.

انتبر الخطيبُ: إرتفع فوق المنبر/ وتاربێژ سەرکەوتە سەر دوانگە.

إنتبش. نبش/ هەڵیدری. هەڵیدایەوە.

إنتبه: حذر. فطن/ ئاگادار بوو. وشیار بووەوە. هەستی پێکرد. تێبینی کرد.

إنتثر: تناثر. تبعثر/ بڵاوبووەوە. پەرتبوو. پەرشوبڵاو بوو.

إنتثر بانفه: إستنثر/ هەڵیمژی. کردی بە لووتیا

إنتج: أثمر. أعطى ثمرةً/ هاتەبەر. بەریهێنا. دانەوێڵەی دا.

أنتجَ: أوجد/ دۆزیەوە. دەریهێنا. دروستیکرد.

**انتجت البهيمة: ولدت/** ئاژەڵ (زا. ترەکی. بەریدا بەچکەی بوو).

**انتجى: تناجى. تحاور/** دووا. وتووێژی کرد. گفتوگۆی کرد. ڕازوگلەیی کرد.

**إنتجاب: إختيار. إنتقاء/** هەڵبژاردن جیاکردنەوە.

**إنتجب: إختار. إنتقى/** هەڵیبژارد.

**إنتجع: لجأ الى/** پەنای بردە بەر.

**إنتجع: نشد. طلب/** داوایکرد. داوای یارمەتی کرد.

**إنتحى: قصد/** بۆی چوو. مەبەستی بوو.

**إنتحى على: إعتمد على/** پشتی پێبەست.

**إنتحاب: نحيب. نُواح. عويل/** گریان. شیوەن. شیوەن و زاری. لاواندنەوە.

**إنتحار: قتل الذات أو النفس/** خۆکوشتن خۆکوژی.

**إنتحال صفة الغير أو شخصيته: تمثيل شخص. إدّعاء شخصية الغير/** خۆکردن. بە یەکێکی تر.

**إنتحال آراء مؤلف أو كتابته: سرقة التاليف والرأي/** دزینی نووسین و بەرهەمی یەکێکی تر.

**إنتحال: إدّعاء ملكية شيء. تطاول. إدّعاء بغير حقّ/** دەستدرێژی. دەستبەسەراگرتنی نارەوا. داگیرکردنی نارەوا.

**إنتحال: إعتناق/** چوونەسەر بیروباوەڕ.

**إنتحب: نحب. رفع صوته بالبكاء/** گریا. شیوەنی کرد. لاواندیەوە.

**إنتحر: قتل نفسه/** خۆی کوشت.

**إنتحل صفة الغير أو شخصيته: إدّعى شخصية الغير/** خۆی کرد بە یەکێکی تر.

**إنتحل آراء مؤلف أو كتاباته: سرقها. إغتصبها/** نوسوراو و بەرهەمی یەکێکی کەی داگیرکرد و کردیی بە هۆی خۆی.

**إنتحل لنفسه: تطاول على حال الغير بغير حق/** دەستبەسەراگرتن و داگیرکردنی نارەوا

**إنتحل مذهباً أو ديناً: إعتنق.** چووە سەر بیروباوەڕ و ئاینێکی تر.

**إنتخاب: إختيار. إنتقاء/** هەڵبژاردن.

**إنتخب: إختار. انتقى.** هەڵیبژارد.

**إنتخب: صوّت. إقترع.** دەنگی دا بۆ هەڵبژاردن.

**إنتخل الشيء: صفّاه. نخله/** لە هێڵەکی دا. پاڵاوتی. پوختەکەی وەرگرت. بێژایەوە.

**إنتدى: إجتمع/** کۆبووەوە. کۆبوونەوەی کرد.

**إنتدى: نال/** دەستی کەوت. بەدەستی هێنا.

**إنتداب: إنابة. إرسال مبعوث/** ناردن. نوێنەر ناردن. ئەرک پێدان.

**إنتداب دولة على بلد أو إقليم أو مستعمرة: إنتداب سياسي/** چاودێری و دەستبەسارگرتنی وڵاتێك بەسەر وڵاتێکی ترا. خستنەژێر بەڕێوەبردن.

**إنتدب لـ. بعث. أناب. وكّل/** نوێنەری نارد.

**إنتزاع: إقتلاع/** هەڵکەندن. لێکردنەوە.

**إنتزاع: إختطاف/** لێ فڕاندن. پڕپیاکردن. فڕاندن. ڕفاندن.

**إنتزاع: إغتصاب/** داگیرکردن. دەستدرێژی نارەوا. بەزۆر (بردن. سەندن).

**إنتزع عن دياره: إبتعد. إغترب. رحل/** لە وڵاتی دوورکەوتەوە.

**إنتزع. إقتلع/** هەڵیکەن. هەڵکەنرا. دەریهێنا. دەرکێشرا. هەڵکێشرا.

**إنتزع: إختطف/** فڕانی. ڕفانی. پڕی پیاکرد. هەڵیپچڕوقان.

إنتزَع: إغتصب/ داگيرى كرد. بەزۆر (بردى. سەندى).

إنتساب: إرتباط. صلة/ پەيوەندى. چوونەناو. لەگەڵبوون.

إنتسب الى: إنتمى إلى/ پەيوەندى هەبوو لەگەڵ لەو خێزان و بنەماڵەيە بوو. ئەچووەوە سەريان.

إنتسب إلى: إنظمَ الى. إلتحق/ پەيوەندى پێوەكردن. چوو لەگەڵيان. چووە ناويان

إنتسج: نُسج. حيك/ چنرا

إنتسخ: . نسخ/ لەبەرى گرتەوە.

إنتسق: تناسق. تنسَق. ترتَب. إنتظم/ ڕێكبوو. ڕێكوپێكبوو.

إنتسل النسيجُ: تنسَل. إنحلَ. تفكَك/ شيبووەوە. هەڵوەشا.

أنتش: نبت. أنبت/ ڕووا. چەكەرەى كرد. سەرى دەرهێنا. سەوز بوو.

إنتشى: نشي. سكر/ مەست بوو. سەرخۆش بوو.

إنتشى: شمَ. تنشَق/ بۆنى (پێوە) كرد.

إنتشار: توزيع وتفريق/ بڵاوبوونەوە. تەشەنەكردن. بەلاڤبون. تەنينەوە.

إنتشار المرض: تفشي/ نەخۆشى داكەوتن. بڵاوبوونەوە. تەشەنەكردن.

إنتشرَ الخبرُ: ذاعَ وفَشا/ هەواڵ بڵاوبووەوە. ڕاگەيەنرا.

إنتشر الشيءُ: إنبسطَ. تَفرَق/ بڵاوبووەوە.

إنتشرَ: تطاير. تَفرَق/ چوو بە هەوادا. بڵاوبووەوە.

إنتشقَ الماءَ في أنفه: صبَهُ فيه/ ئاوى كرد بە لووتيا.

إنتشلَ: رَفَعَ. خَلَصَ. أنقذَ/ ڕزگارى كرد. فرياى كەوت. چوو بە هانايەوە.

إنتِشل: إنتزع. إختطف/ پڕوى پياكرد. فڕانى. بردى. ڕاپيسكان.

إنتصاب: وقوف. قيام/ هەڵسان. ڕەپبوون.

إنتصار: نصر. غلبة. ظفر. فوز/ سەركەوتن. دەستكەوتن. تێهێنان. بردنەوە.

إنتصار: مُناصرة. مُساعدة. معونة. نجدة/ يارمەتى. فرياكەوتن. فرياگوزارى.

إنتصب: قام/ هەڵسا. ڕەپ بوو. قنج بووەوە. قيت بووەوە.

إنتصت لـ: أنصت لـ. أصاغ السمع. إستمع/ گوێى (لێ) گرت.

إنتصح: قبِلَ النصيحة/ ئامۆژگارى وەرگرت.

إنتصر: فازَ بالنصر. حقَق إنتصارا. فازَ/ سەركەوت بردييەوە.

إنتصرَ مِن عَدُوه: إنتقمَ منه/ تۆڵەى لە دوشمن كردەوە.

إنتصرَ على: غَلبهُ/ بردييەوە. لێىبردەوە. بەسەريا سەركەوت. زاڵبوو. شكانى.

إنتصر لـ: ناصرَ. أعانَ. أيَدَ. دافَعَ عنْ/ يارمەتى دا. پشتى گرت. پشتگيرىكرد. بەرگرى لێكرد.

إنتصَفَ الشيءُ: بلَغَ نصفَهُ/ نيوەيى بوو. لەتبوو. كەرتبوو. گەيشتە (نيوەى. ناوەڕاست).

إنتصفَ من: طلب الانصاف/ داواى لێكرد بە داد بێ.

إنتصَفَ من: إنتقَم/ تۆڵەى (لێ) كردەوە.

إنتضَى السيفَ: أخرجَهُ مِن غمده/ شمشێرى (لەكالان) هەڵكێشا.

إنتضَى الثوبَ: أبلاهُ/ شڕى كرد. كۆنى كرد. بەكارى هێنا. لەكەڵكى خست.

إنتضاح (كيمياء): تَناضُح باطني/ ئاودادان. ئاوەدادان.

إنتطح: نطح (أحدهما الآخر. كل منهما الآخر)/ شەرەقۆچیان کرد. یەکتریان دایە بەر (قۆچ. کەللە).

إنتطق: تمنطق. تحزّم/ پشتێنی بەست.

إنتطق: تكلم. تعاطى المنطق/ دووا. قسەی کرد. هاتە قسە. قسەی ڕێك و بەجێی کرد.

إنتظار: ترقّب/ چاوەڕوانی. چاوەڕێ. چاوەنواڕی. چاوەچاو. چاقنێری.

إنتظار: توقّع/ بەتەمابوون. هیوابوون. چاوەڕوان.

على غير إنتظار: غير متوقع/ لەناکاو. لەپڕ. چاوەڕوان نەکراو.

غرفة الانتظار/ ژووری چاوەڕوانی.

إنتظام: نظامية. إطّراد/ ڕێکوپێکی. ڕێکی. ڕێکخوازی.

بإنتظام: بترتيب. بإطّراد/ بەڕێکوپێکی. بەڕێکی.

إنتظر: ترقّب/ چاوەڕێی کرد. چاوی لەڕێوە بوو.

إنتظر: توقّع/ بەتەما بوو. هیوادار بوو. چاوەڕوان بوو. پێشبینی کرد.

إنتظر: تأنّى على. صبر/ لەسەرخۆ بوو. بەئارام بوو. ئارامی گرت. دانی بە خۆیاگرت. توێتکەی خوارد.

إنتظم: ترتّب/ ڕێکبوو. ڕێکخرا.

إنتظم: إطّرد. إستقام/ پێکهات. دامەزرا. جێگیربوو.

إنتظم: إحتوى. شمل/ بریتی بوو لە. تیابوو.

إنتظم الخرز: تألّفت في سلك/ هۆنرایەوە. کرا بە پەتەوە.

إنتعاش: إسترداد الصحّة/ بووژانەوە. هێز پیاهاتنەوە. خوزتێگەڕان. گەشانەوە.

إنتعاظ: إنعاظ. إنتصاب/ ڕەپبوون. قوتبوونەوە. هەڵسان.

إنتعش: نشط. قام/ هەڵسایەوە. بووژایەوە. فراژێ بوو. کەوتەوە چووڵەو گەڕ. خوزی تێگەڕا.

إنتعش من مرض: شُفي/ چاکبووەوە. هەڵسایەوە

إنتعظ القضيب: إنتصب/ ڕەپ بوو. هەڵسا.

إنتعل: لبس النعل/ (سۆڵ. پێڵاو)ی لەپێکرد

إنتفى: أُبعد. طُرد/ دوورخرایەوە. دەرکرا. شاربەدەر کرا.

إنتفى: أُنكر. كُذّب/ بە درۆخرایەوە. حاشای لێکرا.

إنتفى. إنتفت الحاجة. ضد ثبت/ نەویسترا. پێویست (نەبوو. ناکا).

إنتفى الشعر: تساقط/ قژ وەری. ڕووتایەوە. هەڵوەری. تووڵەك بوو.

إنتفاء: إنعدام. فقدان/ نەمان. نەبوون.

إنتفاخ: تضخّم. تورّم/ ئاوسان. کیسکردن. خەمبابوون. هەڵتۆقین. پەڵمان.

إنتفاخ البطن: إمتلاء/ سك باکردن. باژەڵە.

إنتفاخ: إمتلاء بالهواء/ با تێچوون. پڕبوون لە با. کفکردن. پفبوون.

إنتفاض: إرتجاف. إرتعاش/ لەرزین. لەرینەوە.

إنتفاضة: رعشة. إختلاجة/ لەرزین. ڕاچڵەکین.

إنتفاضة شعبية: وثبة/ ڕاپەڕین.

إنتفاع بـ أو من: إستفادة/ (کەڵك. سوود) وەرگرتن. خێرلێبینین.

إنتفاع: ربح. مكسب/ دەستکەوت. قازانج.

إنتفج: نفخ. وثب وعدا/ بازی دا. قونەی کرد. دەرپەڕی. فجوقی کرد.

إنتفخ: نفخ. فخر بما ليس عنده/ بەشتی خەڵکەوە نازی و خۆی هەڵکێشا.

إنتفخ: تضخم. تورم/ ئاوسا. هەڵاوسا. هەڵتۆقی. بەرزبووەوە. کیسی کرد.

إنتفخ: امتلأ بالهواء/ پڕبوو لەبا. بای تێچوو. فووی تێچوو. کفی کرد

إنتفخ: تكبر. نفخ شرقيه/ خۆی گیف کردەوە. خۆی بە زل گرت.

انتفش القطُّ: نفش صوفهُ/ پشیلە خۆی گیف کردەوە. خۆی ڕیچ کردەوە.

انتفش القُطنُ: ندفُ/ لۆکە شیبووەوە. هەلاجی کرا.

إنتفض: إرتجف. إرتعش. إختلج/ لەرزی. لەریەوە.

إنتفع بـ أو من: حصل على منفعة منه/ (کەڵك. سوود)ی لێوەرگرت.

إنتقل: تنقل. تحول/ جوولا. شوێنی گۆڕی. گواستیەوە. گوێزایەوە.

إنتقل الى رحمة الله: مات/ مرد. کۆچی (دوایی) کرد

إنتقى: إختار. إنتخب/ هەڵبژارد.

إنتقاء: إختيار/ هەڵبژاردن. چنینەوە. دەستبژێرکردن.

إنتقائي: إختياري. إنتخابي/ بە هەڵبژاردە.

إنتقاد: تنديد. ضد إستحسان/ ڕەخنە. تانوت. بەرهەڵستی.

إنتقاد هزلي: تهكم/ گاڵتە. لاقرتێ. گاڵتەپێکردن. تیزپێکردن.

إنتقادي: تنديدي. مولع بالإنتقاد. كثير الإنتقاد/ ڕەخنەگر. گاڵتەپێکەر.

إنتقاض (أحياء): أيض هدمي. إنحلال/ ڕووکانەوە. ڕووخاندن. داڕووخان.

إنتقال: تنقل. حركة. تحرك/ جوونە. بزووتن. هاتوچۆ. گواستنەوە. گوێزانەوە. جێگەگۆڕین.

إنتقال: تحول من حال الى حال/ بارودۆخ گۆڕان.

إنتقال: وفاة/ مردن. کۆچکردن. کۆچی دوایی.

حكومة إنتقالية. حكومة وقتية مؤقتة/ حکومەتێکی کاتی. ئەبێ بگۆڕێ.

فترة إنتقال. مرحلة إنتقال/ ماوەی بارودۆخ گۆڕان.

إنتقام: ثأر. الأخذ بالثأر/ تۆڵە. تۆڵەکردن. تۆڵەسەندنەوە.

إنتقبت المرأة: تنقبت. لبست النقاب/ پەچەی گرتەوە. پەچەی پۆشی. سەری داپۆشی.

إنتقد: نقد. لام. وبخ. عذل/ بەرهەڵستی کرد.

إنتقد الكلام: ظهر مابه من العيوب والمحاسن/ ڕەخنەی گرت.

إنتقد الثمن: قبضهُ نقداً/ بە دەستی نرخەکەی وەرگرت.

إنتقص من قدره أو مكانته أو قيمته: عابهُ. ذمهُ. قلل من قيمته/ گاڵتەی پێکرد. لاقرتێی پێکرد. بایەخی پێنەدا. سووکی کرد. ئابڕووی برد.

إنتقص الشيء: أنقصهُ. قلّلهُ/ کەمی کردەوە.

إنتقص الشيءُ: نقص. قلّ/ کەمی کرد. کەمی هێنا. کورتی هێنا. کەم بووەوە.

إنتقص حقهُ. نقصهُ حقهُ/ لێی بڕی. مافی خوارد. لێی کەم کردەوە.

إنتقض: فسخ. ألغي/ هەڵوەشایەوە.

إنتقض: بطل/ بەتاڵ بووەوە. کاری پێناکرێ.

إنتقض: خرق. أنتهك. أخل/ پێشێل کرا.

إنتقض: إنحل. تفكك/ هەڵوەشایەوە. شیبووەوە. ڕزی پووکایەوە.

إنتقض الجرحُ بعد برئه: تکس/ برینەکەی هەڵیدایەوە.

إنتقض على: ثار/ لەرویا هەڵگەڕایەوە. لێی یەلەسە بوو. عاسی بوو.

إنتقض: تهدَّم/ رووخا. داڕووخا. هەڵوەشا.

إنتقل الى رحمت الله: مات/ مرد. کۆچی (دوایی) کرد.

إنتقل إلى: آل/ گۆڕا. تێکشا. تیاچوو

إنتقل الشيءُ من يد الى يد: تناقلته الأيادي/ کەوتە بەردەست. دەستاودەستی کرد. زۆر دەستی کرد.

إنتقل المرض: إنتقلت العدوى. إنتشر/ نەخۆشی داکەوت. بڵاوبووەوە. یەك لە یەکەوە گرتی.

إنتقل من مكان الى آخر: تحوَّل/ جێگەی گۆڕی. گواستیەوە. گوێزایەوە.

إنتقلت الأخبار أو الإشاعات: تناقلته الألسن/ هەواڵ و قسە کەوتە سەرزار. دەماودەم کەوت.

إنتقم من: ثأر من/ تۆڵەی لێکردەوە. تۆڵەی سەند.

إنتقم لنفسه من: عاقبة. أخذ ثأره/ تۆڵەی خۆی (سەندەوە. کردەوە).

إنتقهَ: نقهَ. نقهَ. تماثل للشفاء/ چاکبووەوە. هەڵسایەوە. بووژایەوە.

إنتكاس. إنتكاسة. إرتداد. العودة الى سابق الحال/ گەڕانەوە بۆ بارودۆخی پێشوو. کەوتنەوە.

إنتكس: إرتدَّ. عاد الى سابق حاله/ وەکو خۆی لێهاتەوە. گەڕایەوە بۆ بارودۆخی پێشووی.

إنتكس المريض: عاودهُ المرض/ نەخۆشیەکەی گرتەوە. بۆی گەڕایەوە. سەری هەڵدایەوە. کەوتەوە.

أنتم: حضرتكم. ضمير المخاطب/ ئێوە (بۆ نێر). هەردووکتان. هەمووتان.

أنتما: حضرتكما. ضمير المخاطب/ هەردووکتان. هەمووتان.

إنتمى الى: إنتسبَ الى/ پەیوەندی هەبوو لەگەڵ لەو خێزان و بنەماڵەیە بوو. ئەچووەوە سەریان.

إنتمى الى: إنضمَّ إلى/ پەیوەندی پێوەکرد. چوو لەگەڵیان. چووە ناویان.

إنتماء: إنضمام/ چوونە پاڵ. چوون لەگەڵ پەیوەندی کردن. بوون بە یەك.

إنتنَ: خبُثت رائحتهُ/ بۆنی کرد. بۆگەنی کرد.

إنتُنَّ: حضرتكُنَّ/ ئێوە (بۆ مێ).

إنتهى: تمَّ/ تەواو. تەواوبوو. دوایی هات. کۆتایی پێهات. بڕا. نەما.

إنتهى: إنقضى/ تێپەڕی. گوزەشت. ڕابورد. بەسەرچوو.

إنتهى الى: صار الى. خلُصَ الى. وصل الى/ گەیشتە ئەوە. ئاوای لێهات. ئەوە ئەنجام و کۆتایی بوو. ئاوا کۆتایی هات.

إنتهى اليه الخبر: تناهى إليه الخبر. تناهى الى سمعه/ بەرگوێی کەوت. بیستی. بیستیەوە.

إنتهى الأمرُ: إنقضى/ کارلەکار ترازا.

إنتهى الأملُ أو الموعد: إنقضى/ کات بەسەرچوو. هیوابڕا.

إنتهى عن: كفَّ/ وایهێنا. دەستی (لێ) هەڵگرت.

إنتهى من: أنهى. أتمَّ/ تەواوی کرد. کۆتایی هێنا. لێبووەوە.

إنتهاء: آخر. نهاية. طرَف/ پەڕ. سەر. دوایی. پایان.

إنتهاء: إنقضاء/ بەسەرچوون. تێپەڕبوون. بڕانەوە. کۆتایی.

**تَشَبَّثَ بـ:** تَعَلَّقَ بـ/ خۆی پیاهەڵواسی. پێوەی نوسا. پیالکا.

**تَشَبُّث:** تَمَسُّك. تَعَلُّق/ پێوەنوسان. پیالکان. تێوەئالان.

**تَشَبُّث:** توسط/ داوالکردن. واستەکردن. پەنابردنە بەر.

**تَشَبَّعَ:** تَشَرَّبَ/ ئاوی خواردەوە. تێرئاو بوو.

**تَشَبَّعَ:** اظهر انه شبعان/ خۆی تێر پیشاندا.

**تَشَبَّعَ:** اكل كثيراً/ زۆری خوارد. تێری خوارد. مڕ بوو.

**تَشَبَّعَ بِرَأيٍ او فِكرَةٍ:** تَأثَّرَ/ مێشکی پڕ بوو. کاری تێکرا. بیروباوەڕێك بوو بە مێشکیا.

**تَشَبُّع:** إشباع. تَشَرُّب. تَقَع/ تێربوون. مڕبوون. پڕبوون.

**تَشَبَّكَ:** تشابَكَ/ چوو بەناویەکدا. ئاڵۆزا.

**تَشَبُّك:** تشابُك/ چوون بەناویەکدا. ئاڵۆزکان.

**تَشَبَّهَ بە:** ماثَلَهُ وجاراه. قَلَّدَهُ/ لەو ئەچوو. وەك ئەو بوو. وەك ئەوی کرد. لاسایی کردەوە.

**تَشَبُّه:** مُماثَلَة/ لەیەك چوون. وەك یەك بوون.

**تَشبیب:** شعر غزلي/ هۆنراوەی دڵداریانە. ئارەزووهەڵسێن.

**تشبیع:** إشباع. إملاء/ تێرکردن. مڕکردن.

**تشبیع:** تمثیل/ لێکچواندن. بەراوردکردن.

**تَشَتّى:** شَتا. شَتَى: اقام شتاءً في المكان/ زستان مایەوە. زستانی تیا بردە سەر.

**تَشَتَّتَ:** تَفَرَّقَ. تَبَدَّدَ/ بڵاوبووەوە. پەرش بوو. توانا بوو. جیابووەوە. تەفروتونا بوو.

**تَشَتَّتَ الشملُ:** تَفَرَّقَ/ پەرەوازە بوون. بڵاوبوونەوە. هەریەك بە لایەکدا.

**تَشَتُّت:** تَفَرُّق/ بڵاوبوونەوە. بڵاوەلێکردن. تەفروتونابوون.

**تَشَتُّتُ الفِكر:** ذهول. شرود الذهن والفكر/ هۆش و بیر تێکچوون. وڕبوون. دەمەق بوون. سەرلێتێکچوون.

**تَشتیت:** تفریق. تبدید/ بڵاوکردنەوە. پەرشکردن. تەفروتوناکردن. پەرەوازەکردن.

**تَشَجَّرَ:** شُجِّرَ. حُرِّجَ/ دارودرەخت ڕوێنرا. دارستان دروستکرا. بوو بە دارستان.

**تَشَجَّعَ:** تَكَلَّفَ الشجاعَةَ. تَجَرَّأ/ غیرەت گرتی. ئازا بوو. غیرەتی هەڵسا.

**تَشجیر:** تحریج. زراعة الأشجار/ دار ڕواندن. دارستان دروستکردن.

**یوم التَشجیر:** یوم زراعة الأشجار/ ڕۆژی دارودرەخت.

**تَشجیع:** تحریض. تقویة الأمل/ هاندان. زات دانەبەر. غیرەت پێدان. بەهێزکردن.

**تَشحیل:** تقلیم. تشذیب. قضب/ هەڵپاچین. مێوبڕین.

**تَشحیم:** تزییت. تدهین/ چەورکردن. گریس کردن.

**تَشَخَّصَ المرضُ:** شُخِّصَ. تَعَيَّنَ/ نەخۆشیەکە دۆزرایەوە. زانرا.

**تَشَخَّصَ لە:** تَراءَى لە/ وای بینی. وا هاتە پێشچاوی.

**تَشخیص:** تعیین/ دیاریکردن. ناسینەوە. زانین.

**تَشخیص المرض:** مَعرِفَتِه/ دۆزینەوەی نەخۆشی. دەرخزانین.

**تَشَدَّخَ:** إنكَسَرَ. تَكَسَّرَ. إنشدخ/ شکا. قرنجا.

**تَشَدَّدَ:** تَقَوّى/ بەهێزبوو. گەرمبوو. زەبری سەند. غیرەت گرتی.

**تَشَدَّدَ في اموره:** تَصَلَّبَ/ توندوتیژ بوو. ڕەق بوو.

**تَشَدَّدَ في:** كان قاسياً صارماً/ دڵرەق و بێبەزەیی بوو.

**تَشَدُّد:** تَصَلُّب/ توندوتیژی.

**تَشَدُّد:** قسوة. صرامة/ دڵرەقی. بێبەزەییەتی.

**تَشَدَّقَ:** إستهزأ بالناس بلوي شدقه/ گاڵتە بە خەڵك ئەكا بە دەم پانكردنەوە و لچ هەڵقورچان.

**تَشَدَّقَ بالكلام وفي الكلام:** تَوَسَّعَ/ دەمی پان ئەكاتەوە لە قسەكردنا.

**تَشَدُّق:** لَوي الشِدق/ دەم پانكردنەوە. دەم خوارکردنەوە.

**تشديد على:** تأكيد. تركيز. إبراز/ دەرخستن.

**تشديد على:** تضييق. ضغط. تقييد/ پەستان. پەستاوتن. تێگیركردن.

**تشديد على:** قسوة. صرامة/ دڵرەقی. بێبەزەییەتی.

**تشديد في أو على:** إلحاح. إصرار/ سووربوون. هەتەربوون. پێداگرتن. لەسەرپۆیین. پركێشی. شێتگیری.

**تشديد:** تقوية. زيادة حِدة/ تیژكردن. بەهێزكردن. هاندان.

**تشديد الصوت:** نبر الصوت/ قەبەكردن و گڕكردنی دەنگ.

**تَشَذَّرَ/** تفرّق. تبدّد/ بڵاوبووەوە. پەرش بوو.

**تشذيب:** إزالة الزوائد/ هەڵپاچین. لقوپۆپ كردن.

**تَشَرَّبَكَ شرب.** إمتص/ هەڵیمژی. تێرئاو بوو.

**تَشَرُّب:** إمتصاص/ هەڵمژین. تێرئاوبوون.

**تَشَرَّدَ:** عار/ بەلەسە بوو. بەرەڵا بوو. پەرەوازە بوو. سەری لێ تێكچوو. دەربەدەر بوو.

**تَشَرُّد:** عَير/ پەرەوازەبوون. دەربەدەربوون. سەرلێتێكچوون. خوێڕێتی. ئاوارەیی. ئاوەكی بوون.

**تَشَرْقَرَ:** تَشَقَّن/ دان دان بوو. زبر بوو.

**تَشَرَّطَ:** فَرَض شروطاً/ مەرجی دانا. مەرجی خستە سەر.

**تَشَرَّطَ في عَمَلِه:** تَأنَّق/ بە پوختی كاری كرد. مەرجی بردە سەر. سەرڕاست بوو.

**تَشَرَّفَ بكذا:** نالَ شَرفاً. عَدَّهُ شرفاً/ پێی گەورە بوو. رێزی لێنرا. پایە و شكۆی وەرگرت. شكۆمەند كرا.

**تَشَرَّفَ المكانَ:** علاه/ سەركەوت. چووە سەرەوە.

**تَشَرَّفَ اليه:** تَطَلَّعَ إليه/ تێڕوانی. سەرنجی لێدا.

**تَشَرَّفَ على الشيء:** أطلع عليه من فَوق/ بەسەریا ئەیڕوانی.

**تَشَرَّفنا:** أعطيتنا الشرف/ گەورەت كردین. رێزت لێناین.

**تَشَرَّمَ:** تَشَقَّقَ. إنشقّ/ قڵیشا. درزی برد. درزی تێبوو.

**تشريح:** تسريح. الخياطة المتباعدة/ كۆك كرتن. تەقەڵی زل زل.

**تشريح اللحم:** قَطعه قِطَعاً طِوال. تقطيع بشكل شرائح/ توێكردنەوە.

**تشريح الجثة:** المعرفة او تحديد سبب الوفاة/ لاشە هەڵدڕین بۆ زانینی هۆی كردن.

**تشريح:** تفسير. توضيح/ شیكاری. توێژینەوە. ڕاڤەكردن. لێكدانەوە.

**علم التشريح/** توێكاری. زانینی توێكاری.

**تشريد:** إزاحة. زحزحة. إخراج قسراً. طرد. نفي/ دەربەدەركردن. ئاوارەكردن. شاربەدەر.

**تشريع:** إشتراع. سَنّ القوانين/ یاسادەركردن. یاسادانان.

**تشريع:** قانون/ یاسا.

سُلطة التشريع: السلطة التشريعية/ دەسەڵاتی یاسادانان. دەسەڵاتداری یاسا.

تشريف: تكريم/ ڕێزلێنان.

تشريفاتي: رئيس الحفلات/ پێشوازی. پێشوازیار. بەڕێوەبەری کۆڕ و ئاهەنگ.

تشرين الأول: الشهر العاشر الميلادي/ مانگی تشرینی یەکەم.

تشرين الثاني: الشهر الحادي عشر الميلادي/ مانگی تشرینی دووەم.

تَشَظَّى: تَطايَرَ شَظايا/ پارچە پەڕی. تەڵەزم پەڕی. پارچە و تەڵەزمی لێبووەوە.

تَشْظِيَة: تَطايُر شَظايا. إنقسام الى أجزاء صغيرة/ پارچەپارچە بوون. پارچە و تەڵەزم لێبوونەوە. لێپەڕین.

تَشَعَّبَ الزرعُ: صار ذا شُعَب/ لق و پۆپی دەرکرد. بڵاوکردەوە). پەلی هاویشت.

تَشَعَّبَ النَهرَ: تَفَرَّقَت منه أنهار/ چەم و ڕووباری وردەی لێ جیابووەوە.

تَشَعَّبَ عَنه: تباعَدَ/ لێی دووركەوتەوە.

تَشَعَّبَ القومُ: تَفَرَّقُوا/ بڵاوبوونەوە. بڵاوەیان لێکرد.

تَشَعَّبَهُم الفِتنَة: فَرَّقَتهم/ ئاژاوە و ناکۆکی لێکی جیاکردنەوە. لەیەك دووركەوتنەوە. دووبەرەكێتیان تێکەوت.

تَشَعَّبَت الآراء: إختلفت/ دەنگ زۆر بوو. بیروباوەڕ زۆر بوو.

تَشَعُّب: تَفَرُّع/ پەلهاویشتن. پەلبڵاوكردنەوە. لێکجیابوونەوە.

تَشَعَّبَ الشيء: إنصَلَحَ/ چاکبوو. چاکبووەوە.

تَشَعَّثَ الشعرُ: تَفَرَّقَ وتَشَوَّشَ/ قژ ژیژبووەوە. ئاڵۆز ئاڵۆزکا. تێکئاڵا.

تَشَعْشَعَ: أشعَ. نُورَ/ تیشکی دایەوە. بریسکایەوە.

تَشَعْشُع: إشراق. إشعاع/ تیشکدانەوە. بریسکانەوە.

تَشَغَّل: إنشَغَلَ. صار مشغولاً/ خەریکبوو. دەستی گیرابوو.

تَشْغيل: إستخدام/ دامەزراندن. ئیشپێکردن. بەکارهێنان.

تَشْغيل: تَدوير. تَسيير/ خستنەگەڕ. کارپێکردن. ئیشپێکردن. خستنەگەڕ.

تَشَفَّى: إستشفى. نال الشفاء. شُفِيَ بِه/ پێی چاکبووەوە. چاکبووەوە.

تَشَفَّى من غَيظِه: شَفى غليله. بَرِئَ منه/ دڵی ئاوی خواردەوە. هێمن بووەوە.

تَشَفَّعَ لَه او بِه: شَفَعَ او بِه: شَفَعَ. تَوَسَّطَ. طلب منه أن يعاونه/ ڕووی لێنا. داوای یارمەتی بۆ کرد. تکای بۆ کرد. بۆی پاڕایەوە. پاکانەی بۆ کرد. پۆزشتی بۆ هێنایەوە.

تَشَفُّع: تَوَسُّط. وِساطَة/ ڕوولێنان. تکابۆکردن. بۆپاڕانەوە. داوای یارمەتی کردن.

تَشَقَّقَ الجلدُ: شُرِخَ الجلد/ پێست قڵیشا. درزی برد. درزی تێبوو. دەمی کردەوە.

تَشَقُّق: إنشطار. إنفلاق. إنشقاق/ درزبردن. درزتێبوون. قڵیشان. دەمکردنەوە.

تَشَقُّق: فَلَع. شَق. صَدع/ درز. قڵیش.

تَشَقلَبَ: وَثَبَ او إنقلب في الهواء/ سەرمەوقولاتی دا. خۆی هەڵگێڕایەوە.

تَشَكٍّ: التَشَكّي. تَظَلُّم/ سکاڵاکردن. شکاتکردن. کوڕوزانەوە.

تَشَكّى. شَكا. تَظَلَّمَ/ سکاڵای کرد. شکاتی کرد. کوڕوزایەوە.

تَشَكَّرَ: شَكَرَ. حَمَدَ/ سوپاسی کرد.

تَشَكّر: شكر: حَمد/ سوپاس.

تَشَكّكَ في: شكَّ في. إرتاب/گومانى ليكرد. ليى به گومان بوو. دوودلْ بوو. دلّى لىّ پيس كرد.

تَشَكُّك: شكّ. ريب/گومان. دوودلّى.

تَشكّلَ تألّفَ. تكوّنَ. تخَلّقَ/ پيكهات. دامەزرا. دروستبوو.

تَشكّلَ العنب: أخذ في النضج/ پيگەيى. ترێكە پيگەيى.

تَشَكّل: تأليف. تأسيس. إنشاء/ پيكهاتن. دامەزراندن. دروستبوون.

تَشكيك: شكّ. خلاف اليقين/گومان. دوودلّى. دلّپيسكردن. دلّ كرميبوون. خانەگومانى.

تَشكيل: صَوغ. صياغة. تصوير. تكوين. تأليف/ دروستكردن. دانان. دروستبوون. دارشتن. پيكهينان.

تَشكيل: تحريك الحروف والكلمات/ سەروبۆر بۆكردن.

تشكيل: تنويع/ بابەت زۆرى. هەمەچەشنە.

تشكيل: تشكيلة: مجموعة/ چەند بابەتيك.

تشكيل: دَلال المرأة وغنجها/ نازكردن. ناز و نووز.

تَشكيل: قَيد/ پالكيكردن. پاوەستاندن. پيوەنووساندن.

تشكيلي: فنون تشكيلية/ هونەرى شيوەكارى.

تَشليح: تعرية/ رووتكردنەوە. رووتبوونەوە. جلپيداكەندن.

تشليح: سَلب/ جەردەيى. رووتكردنەوە.

تَشَمّرَ للأمر: شمّرَ للأمر. تَهَيَّأ له. إهتم به/ بەگەرم گرتى. بەتەنگ كارەكەوە هات. خۆى بۆ ئامادە كرد. چاكى ليكرد بە لادا.

تَشَمّس: تدفّأ في الشمس/ لەبەر خۆر خۆى هەلّخست. چووە بەر هەتاو.

تَشَمَّع: شمَعَ/ ميوكرا. مۆركرا. لۆك كرا.

تَشمّع في الطب: تَلَيُّف. تَحَجُّر. تَصَلّب/ وشكبوونەوە. رەقبوون. كرژبوون.

تَشمّل بـ: تَلَفّفَ بـ/ خۆى پيچايەوە.

تَشمّم: شمّ. تَنَشّقَ الرائحة/ بۆنى كرد.

تَشمّم الأخبار: جمعها/ وردە هەوالّى بيست.

تَشميس: تعريض للشمس/ هەلّخستن. خستنە بەرخۆر.

تَشَنّجَ: تَقَبّضَ. تَقَلّصَ/ كرژبوو. جەمام بوو. بەگير وەستا. دەمار گرتى.

تَشَنُّج: تَقَبُّض. تَقَلُّص/ كرژبوون. دەمارگرتن. جەمامبوون. دەمارگيرى. رەقبوون.

تَشَنّفت المرأة: لَبِسَت الشَنف (قُرط. حَلى) گوارەى كردە گويى. گوارەى لەگوىّ كرد.

تَشنيع على: ذمّ. تَشهير بـ/ قسەپيوتن. ناوزراندن. قسەى ناشيرين شوينخستن.

تَشنيع: تشويه. تبشيع/ناشيرين كردن. شيوەگۆرين. شيواندن.

تَشَهّىَ: إشتهىَ. تاقَ إلى. رَغِبَ في. أراد. إبتغى/ ئارەزووى كرد. دلّى تيى چوو. حەزى ليكرد.

تَشَهّد المُسلم: قرأ الشهادة/ شايەتمانى هينا.

تَشهير بـ: قَذف. ذم. فَضح/ ناوزراندن. قسەپيوتن. قسەشوينخستن.

تَشَوّش: إضطراب/ شپرزەبوو. شلّەژا. سەرى لىّ تيكچوو.

تَشَوّش عليه الأمر: إختلط/ سەرى لىّ چەواشە بوو. كار ليى شيوا.

تَشَوّش: حيرة. إرتباك. إختلاط/ شلّەژان. سەرليشيوان. چەواشەبوون.

تَشَوّقَ إلى: تطلّع. طَمَعَ الى/ سەيرى كرد. تەماشاى كرد. تيروانى. سەرنجى ليدا.

تَشَوَّفَ الى: تَطَلَّعَ الى/ سەیرکردن. تێڕوانین. تەماشاکردن. سەرنجلێدان.

تَشَوَّفَ: تَزَيَّنَ/ ڕازایەوە. ساف و لووسی بوو.

تَشَوَّقَ إلى: إشتاقَ/ ئارەزووی کرد. بیری کرد. بۆی بە پەرۆش بوو.

تَشَوُّق: شَوق. إشتیاق. رغبة. حنین/ ئارەزوو. بیرکردن. تامەزرۆیبوون. پەرۆشی. تاسە.

تَشَوَّهَ الشكل: تَغَيَّرَ. قَبُحَ/ تێکچوو. شێوا. ناشیرین بوو.

تَشَوَّهَ المعنى أو الحقیقة: حُرِّفَ. أفسدَ وتَحَرَّفَ المعنى/ لە مەبەست لاچوو. مانا گۆڕا.

تَشَوُّه الشكل أو الجسم او الوجه: حدوث عیب أوعاهة/ تێکچوونی ئەندام و لەش. کەم ئەندامێتی.

تَشَوُّه المعنى أو لاالحقیقة: حَرف/ تێکچوونی مانا و مەبەست.

تَشويش: خَلط. إرتباك. إختلاط/ شێرزەبوون. شڵەژان. سەرلێشێوان.

تشويق: ترغيب. حَث. تحريض/ هاندان. لاشیرین کردن.

تشويه الشكل أو الجسم أو الوجه: إفساد وتغيير/ شێوەگۆڕین. ناشیرین کردن. کەلکردن.

تَشويه الحقيقة أو المعنى: تحريف/ مانا و مەبەست گۆڕین.

تشويه السُمعَة او الحيث: سَبّ. شتم. مهاترة/ قسەپێوتن. ناوزڕاندن. قسەدواخستن.

تَشَيَّطَ: شاطَ. إحترق/ سووتا. سووزیا.

تَشَيَّطَ دَمُهُ: إستشاط غضباً/ ڕقی هەڵسا. تووڕە بوو. ئاگری ئەکردەوە.

تَشَيطَنَ: تَعَفرَتَ. فَعَل فعل الشيطان/ بوو بە شەیتان. کرداری شەیتانانە ئەکا. فێڵ و ساختەی کرد.

تَشَيَّعَ لـ: تَحَزَّبَ/ لایەنی گرت. چووە پاڵی. کۆمەکی کرد.

تَشَيَّعَ: إدَّعى دَعوَةَ الشيعَة. صار شيعياً/ داوای شیعەگەرێتی کرد. بوو بە شیعە.

تَشَيَّعَهُ الغَضَبُ: إضطرم في قلبه/ تووڕە بوو. ڕقی هەڵسا. پیشی خواردەوە.

تَشايَعوا على أمر: توافَقوا عليه/ تووڕە بوو. ڕقی هەڵسا. پیشی خواردەوە.

تَشَيُّع: مُشايَعَة/ لایەنگری.

تَشييد: بناء. إقامة/ دروستکردن. دامەزراندن. بەرزکردنەوە.

تشييع: توديع. مُرافَقَة/ بەڕێکردن.

تَصابَى: فَعَل فِعل الصبيان/ کردەوەی گەنجانەی ئەنواند. تەڕیەری ئەنواند.

تَصابى: مال الى اللهو واللعب/ خۆی منداڵ ئەکردەوە. هەوای هەرزەکاری لێیدا.

تصابَى المرأة: خدعها وفتنها/ دەستی ئافرەتەکەی بڕی. هەڵی خەڵەتان. خۆی وا پیشاندا خۆشی ئەوێ.

تصاحب: تصادَقَ. ترافَقَ/ هاوەڵیی کرد. بوو بە هاوڕێی. لەگەڵیا بوو.

تَصاحُب: مُصاحَبَة. مُصادَقَة/ لەگەڵبوون. هاوەڵێتی. یاوەری. هاوڕێیەتی.

تَصادَفَ: صادَفَ: التقى مُصادَفَةً/ بەڕێکەوت. یەکیانگرت. واڕێکەوت.

تَصادُف: مصادَفَة/ ڕێکەوت.

تصادُفي: طارىء. عَرَضي. بالمصادَفَة/ بەڕێکەوت.

تصادَقَ؛ تصاحَبَ. ترافَقَ/ هاوڕێی کرد. بوو بە هاوڕێی. لەگەڵیابوو.

تصادُق؛ مُصاحَبَة. مُصادَقَة و. مُرافَقَة/ هاوڕێی کردن. هاوڕێیتی. لەگەڵبوون. هاوڕێیەتی.

تصادَقا؛ تصاحَبا/ بوون بە هاوڕێی یەکتری.

تصادَقا الحديث والمَودَّة؛ صَدَّقَ أحدهما الآخر/ باوەڕیان بە یەکتری کرد.

تصادَمَ.. إصطَدَمَ/ بەریەککەوتن.

تصادُم.. إصطدام/ پێکدادان

تصارَعَ. تصارَعا؛ حاولا أيُّهُما يَصرَعَ الآخر/ زۆریان گرت.

تصارُع.. صِراع/ ململانێ

تصاريف الدَّهر؛ نوائبُه وحدثاته/ هەڵسوکەوتی زەمانە.

تصاعَبَ؛ ضِد تساهَلَ/ ڕەق بوو لە کرداریا.

تصاعَدَ من؛ إنبَعَثَ من/ لێیەوە دەرپەڕی. دەرهات. بەرزبووەوە.

تصاعُد؛ إرتفاع/ بەرزبوونەوە. سەرکەوتن.

تصاعُد؛ إنبعاث/ دەرپەڕین. دەرهاتن.

تصاعُدي؛ متدرج/ بەرزبوونەوە بە پلە.

ضريبة تصاعُدِيَّة/ باجی بەرزبوونەوەی بە پلە.

تصاغَرَ تحاقَرَ. خَضَعَ. إمتَثَلَ/ خۆی (سووکردن. ڕسوا کرد. بچووک پیشاندا).

تصاغُر؛ ذلّ. خضوع/ ملکەچی. سەرشۆڕی. خۆسووک کردن.

تصافَّ؛ إصطَفَّ. وقف أو إنتظم في صَفٍّ/ ڕیزی گرت. بە ڕیز وەستا. چووە ڕیزەوە.

تصافَى. تصافَى القوم؛ أخلَصَ الوِدَّ بعضهم البعض/ یەکتریان خۆشویست. دڵسۆزی یەکتربوون.

تصافَحَ؛ صافَحَ/ دەستی گوشی. تەوقەی کرد.

تصافُح؛ صافَحَ/ دەست گوشین. تەوقەکردن.

تصافَقَ البائع والمشتري؛ تبايَعَ/ پێکهاتن لەسەر کڕین و فرۆشتنێک.

تصالَحَ؛ ضِد تخاصَمَ/ ڕێککەوت. ئاشتبووەوە. پێکهات.

تصالُح؛ صُلح. وِئام/ ئاشتی. ڕێکی.

تصامَّ عن الحديث؛ تظاهَرَ أنَّهُ أصَمّ/ خۆی کەڕکرد. خۆی لە قسەکە کەڕکرد.

تصانيف (المفرد تصنيف)؛ مؤلفات/ بەرهەم. نوسین و دانراو.

تصاهَرَ؛ تقارَبَ/ بوو بە خزم.

تصاهُر؛ مُصاهَرَة. قرابَة زواج/ خزمایەتی. ژن و ژنخوازی.

تصاوَنَ من؛ إتَّقَى من. حَفِظَ نفسه من/ خۆی لێ پاراست.

تصاوير (المفرد تصويره)؛ تمثال/ پەیکەر. بت.

تصايَحَ؛ صاح. تصايَحوا. صاح بعضهم بعضا/ بانگی یەکتریان کرد.

تَصَبَّة.. تصابِي/ ڕژان. ڕژایەخوارەوە.

تَصَبَّبَ؛ إنصَبَّ. إنحَدَرَ/ هاتەخوارێ. سەرەوخوار بووەوە.

تَصَبَّبَ عَرَقاً؛ نَزَّ. نَضَحَ/ ئارەقی کردەوە. ئارەقی دەردا. شێی هێنایەوە.

تَصَبَّحَ؛ تَعَلَّلَ بأكل قليل إلى أن يحضر الطعام/ بەرکولی کرد.

تَصَبَّحَ بِهِ؛ لَقِيَهُ صباحاً/ بەیانی. سەرلەبەیانی بینی. تووشی بوو بە تووشەوە.

تَصَبَّرَ على؛ صَبَرَ. تَجَلَّدَ/ ئارامی گرت. بە حەوسەڵە بوو. خۆی ڕاگرت. خۆی بۆ گیرا. دڵنی بە خۆیا گرت.

تَصَبَّرَت الجثّة؛ تَحَنَّطَت/ مۆمیاکرا.

تـصَبَّـر: جَلَـدَ. صَـبَرَ/ پـەروا. ئـارام. حەوسـەڵە. خۆداری. دانبەخۆداگرتن.

تَصَبَّنَ: تَحَوَّلَ إلى صابون/ بوو بە سابوون.

تَصبير الحيوانات أو الطيور: تحنيط/ مۆمیاکردن.

تَـصبيرة: وَجبَـةٌ خفيفـةٌ/ بـەرکول. ئـاوگیر. خواردنێکی کەم.

تَصَحَّفَ: أخطأ في القراءة/ لە خوێندنەوەدا هەڵەی کرد. بەهەڵە خوێندیەوە.

تَصحيح: تصويب/ ڕاستکردنەوە. پیاچوونەوە.

تـصحيح المطبوعـات: تـصويب/ هەڵەچـنی. ڕاستکردنەوەی هەڵە.

تصحيح دفاتر الامتحانات/ سەحکردنی دەفتەری قوتابیان.

تصحيف: خطأ في القراءة. خطأ في التهجي/ بەهەڵە خوێندنەوەو و حونجەکردن.

تـصَدّ التـصَدّي: مُجابَهَـة. مواجَهَـة/ بەرهەڵستی. بەرهەڵستی کردن. لە ڕووداوەستان. ڕێپێگرتن.

تَصَدّى لـ: جابَهَ. واجَهَ/ بەرهەڵستی کرد. لە ڕووی (وەستا. هەڵگەڕایەوە).

تَـصَدَّرَ: كـان في الـصَدارة/ پێـشەنگ بـوو. لـە پێشیانەوە بوو. سەرگەورە بوو. بەڕێوەبەر بوو. سەرۆک بوو.

تَصَدَّعَ: إنشَقَّ/ درزی برد. قڵیشا. شەق بوو.

تَصَدَّعَ القومُ: تَفرَّقوا/ دووبەرەکییان تێکەوت. بڵاوەیان لێکرد. بڵاوبوونەوە.

تـصَدُّع: شـقّ. صَـدع/ درزبـردن. قڵیـشان. شەقبوون.

تَصَدُّع: إنشقاق/ دووبەرەکیتی.

تَـصَدَّفَ عـن: صَـدَفَ. أعـرضَ عـن/ وازی لێهێنـا. دەستی لێهەڵگرت.

تـصَدَّقَ علـى: أعطـى صَدَقَة. أحسَنَ/ خێری کرد. بەخشی.

تَـصَدُّق: إعطـاء الـصَدَقَة. إحسان/ خێرکـردن. بەخشین. یارمەتیدان.

تَصدير: مُقدِمَة. فاتِحَة/ پێشەکی. سەرەتا.

تصدير السلع الى الخارج: إرسال/ ناردن. ناردنی شتومەک بۆ دەرەوەی وڵات.

تَـصديق: تَوثيـق. إقـرار. إبـرام/ سـەلماندن. چەسپاندن. دانپیانان. بڕوادان. بڕواکردن.

تـصديق: قَبـول/ قـایلبوون. سـەلماندن. پەسەندکردن.

سريع التصديق: ساذج. ميقان/ خۆشباوەڕ.

تَصَرَّفَ: سَلَكَ/ ڕەفتاری کرد. کردی.

تَصَرَّفَ: مارَسَ حَقَّ التَصَرُّف/ دەسەڵاتی بەکارهێنا.

تَـصَرُّف: سـلوك/ ڕەوشت. ڕەفتـار. ڕەوشـت و خوو.

تَـصَرُّف: تَـدبير/ ڕاپەڕانـدن. بـەڕێوەبردن. ڕامیاری.

تَـصَرُّف: حَـق التـصرف. سلطة التَصَرُّف/ مـافی ڕاپەڕاندن. دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن.

تَـصَرُّف في الأدب والفـن: تبـديل. تغـيير/ دەستکاری. گۆڕین.

بتَصَرُّف: بِحُرِّيَة/ سەربەستانە.

بتصرف: غَير حَرفي/ بەدەستکارییەوە.

تحـت تـصرفه: تحـت أمـره أو طلبـه/ لـەژێر ڕکێفەیدا.

حق التصرف. سلطة التصرف/ مافی بەکارهێنانی دەسەڵات.

مطلـق التـصرف/ دەسـەڵاتی تـەواو. مـافی ڕاپەڕاندن و بەڕێوەبردن.

تَصَرَّمَ: إنصَرَمَ. تَقَطَّعَ/ پچڕا. بڕا.

تَـصَرَّمَ: إنـصـرم. إنقـضى/ تێپـەڕی. گوزەشـت. کۆتایی هات.

تصریح: بیان. تقریر. إعلان/ ڕاگەیاندن.

تَصریح: إجازة. رُخصَة. إذن/ ڕێدان.

تـصریح: إقـرار. إعـتراف/ درکانـدن. پێلێنـان. دانپیانان. وتن.

تصریف: تَنفیس/ فشکردنەوە. بادەرهێنان.

تَصریف: صِرافة. صَیرَفة. تبدیل عملة/ دراوکاری. دراوگۆڕینەوە.

تَصریف البضائع: بَیع. ترویج/ کەلوپەل فرۆشتن. دەستپێوەنان.

تَصریف الأعمال أو الشؤون او الأمور. تـدبیر. إدارة. سیاسة/ بەڕێوەبردن. ڕامیاری.

تـصریف في اللغـة: إشـتقاق کلمـة مـن کلمـة/ وشەسازی. وشەداڕشتن.

تَـصَعَّدَ: زاد حِـدّةً. شِـدَّةً. قَـسوَةً/ تووڕە بوو. ڕقی هەڵسا.

تَصَعَّدَ: صَعِدَ. إرتقى/ سەرکەوت. بەرزبووەوە.

تَصَعَّدَ: تَبَخَّرَ/ بوو بە هەڵم.

تَـصَعُّد: إزدیـاد الحِـدّة/ تووڕەبـوونی زۆر. ڕق هەڵسان.

تَصَعُّد: تَبَخُّر/ بوون بە هەڵم.

تصعید: تبخیر/ هەڵماندن.

تصعید: تَسامٍ. تمجید/ بەرزکردنـەوە. ڕێزلێنان. شکۆدارکردن.

تـصغیر: تقلیـل. تنقـیص/ بـچووك کردنـەوە. کەمکردنـەوە. کورتکردنـەوە. بایـەخ کـەم کردنەوە.

إسم تصغیر: مختصر الإسم/ کورتەناو. نازناو.

تَـصَفَّحَ الکتابَـكَ قَـرَأَهُ/ سـەرپێی خوێندیـەوە. پەڕەپەڕەی کرد. پەڕەکانی هەڵدایەوە.

تَصَفَّحَ الأمرَ: تَأَمَّلَهُ ونظر فیه مَلِیاً/ تێیڕوانی. لێی وردبووەوە. بیری لێکردەوە. سەرنجی لێدا.

تَصَفُّح: قراءة سریعة/ چاوپیاخشاندن.

تَصَفُّح الأمر: تَأَمُّلَهُ والنظر فیه ملیاً/ تێڕوانین. لێوردبوونەوە. بیرلێکردنەوە. سەرنجلێدان.

تَـصفیَة: تَنقیَـة. ترویـق. ترشیح/ ڕوونکردنـەوە. خاوێن کردنەوە. پاڵاوتن. پاکردنەوە.

تَصفیة الأمور (الأشغال. الحسابات): تَسویَة. حَسم. إنهـاء/ سـاخکردنەوە. کۆتـایی پێهێنـان. ڕێکەوتن.

تَـصفیح: تَغطیَـة بـصفائح/ ڕووکـەش کـردن. تێگرتن.

تصفیح: تـطبیق. تطریق/ پانکردنەوە. تەنکردن.

تصفیف: رَصف/ بەربەرێژ.

تـصفیف الـشعر: تمـشیط. تـسریح/ قژداهێنان. چاکردن.

تـصفیق بالأیـدي: ضرب الیـد علی الیـد/ چەپڵە. چەپڵەلێدان. چەپڵەڕێزان.

تصفیق السوائل: سکب تـدریجیاً. صَبّ من آنیـة الی أخری/ ڕۆکردن. پاڵاوتن.

تَـصَلَّی النـار وبالنـار: تَـدَفَّأَ. إستدفأ بهـا/ خۆی گەرمکردەوە.

تَـصَلَّبَ: تَـشَدَّدَ تَعَنَّـتَ/ ڕەق بـوو. قیرسـچمە بـوو. پتەو بوو.

تَـصَلُّب: عِنـاد. تَعَنُّـت/ ڕەقیـز قیرسـچمەیی. توندوتیژی.

تَصَلُّب: تَجَمُّد/ ڕەقبوون. پتەوبوون. ڕەقهەڵاتن.

تَصَلصَلَ: صَوَّتَ/ دەنگی هات. خرنگەی هات.

تَصَلَّفَ: صَلِفَ. تَبَجَّحَ. تَمَدَّحَ بما لیس فیه/ خۆی هەڵکێشا. لەخۆی بایی بوو.

تَصَلَّف: تَمَلَّق/ریایی کرد. مەرایی کرد. ماستاوی کرد.

تَصَلَّف: صَلَف. تَبَجُّح. غُرور/خۆهەڵکێشان. لەخۆبایی بوون. ڕیایی. مامەحەمەیی.

تَصليح: إصلاح. تَقويم. تَهذيب/چاکردن. چاکردنەوە.

تَصميم: عَزم. ثَبات/سووربوون. کۆڵنەدان. لەسەر ڕۆیینو دڕێخی نەکردن.

تصميم: وَضع التصاميم/نەخشەدانان. پلاندانان.

تصميم خِطَّة: تخطيط/ نەخشە. پلان. مەبەست. پرۆژە.

سَبق التصميم: سبق الإصرار. تَعَمُّد. تَدَبُّر/ پێشەکی ئامادەکردن. ئەنقەس. هەوەس.

تَصَنَّعَ: تَكَلَّفَ. تظاهَرَ أظهر عن نفسه ماليس فيه/ خۆی بە جۆرێکی تایبەتی نەبینی.

تَصَنَّع البَلَدُ: صار صناعياً/وڵات بوو بە وڵاتی پیشەسازی.

تَصَنَّعت المرأةُ: تَبَهرَجَت وتَزَيَّنَت/ خۆی ڕازاندەوە. ئارایشتی خۆی دا.

تَصَنُّع: تَكَلُّف. تَظاهُر/ڕواڵەت. هەر بە دەم و بە دیمەن.

تَصَنَّفَ: صُنِّفَ. بُوِّبَ/کرا بە چەند جۆر و بابەتێك.

تَصَنَّفَ الكتابُ: أُلِّفَ. جُمِعَ/ دانرا. کۆکرایەوە. کرا بە کتێب.

تَصنيع: تَحويل الى عَمَل صِناعي/دروستکردن.

تَصنيف: تَبويب. ترتيب. تَنسيق/ڕێکخستن. جیاکردنەوە. بابەت بابەت کردن.

تَصنيف: جَمع. تأليف/دانان. کۆکردنەوە. پێکهێنان. دروستکردن.

عِلم التصنيف: فَنّ تنسيق وتقسيم الأحياء/ زانیاری دابەشکردنی زیندەوەر.

تَصَوَّرَ: تَخَيَّلَ. ظَنَّ/وای دانا. وایزانی. خەیاڵی کردەوە.

تَصَوَّرَكَ سَقَطَ. مال للسقوط/کەوت. لاربووەوە. وەختەبوو بکەوێ.

تَصَوَّرَ: إستخرج نُسخة طبق الأصل/وێنەی گرتەوە. لەبەری گرتەوە.

تَصَوُّر: تَخَيُّل/بیرلێکردنەوە. بەبیرهاتن. وابینین.

تَصَوُّر: مَفهوم/چەمك. مەبەست. بۆچوون. تێگەیشتن.

تَصَوُّري: تَخَيُّلي. خيالي/خەیاڵیی هەر بە خەیاڵ. بەبیرلێکردنەوە.

تَصَوَّفَ: صار صوفياً/بوو بە سۆفی.

تَصَوُّف: صوفِيَّة. الصوفية الإسلامية. العلم الروحاني/سۆفیگەرێتی.

تَصَوَّنَ: حَفِظَ نفسه/خۆی پاراست.

تَصَوَّنَت المرأةُ: كانت عفيفة طاهرة/ڕووسوور و داوێن پاك بوو.

تَصويب: إستصواب. إستحسان. قبول. رضا/ باشی. چاکە. قایلی. پەسەندکردن.

تَصويب: تسديد. توجيه/ئاڕاستەکردن. تێگرتن.

تَصويب: تَصحيح. إصلاح/ڕاستکردنەوە. چاکردنەوە.

تَصويت: إقتراع. إعطاء الصوت في الانتخاب/ دەنگدان.

تَصويت: نُطق. لَفظ. إخراج الصَوت/دەنگ. قسەکردن. دەنگەدەنگ.

تَصويت برفع الأيدي/دەستبەرزکردنەوە.

تصوير: رَسم/ وێنەکردن. وێنەکێشان. وێنەگەری. وێناکردن.
تصوير: إيضاح بالرسم/ پروێنە.
تصويرك وصف. تعريف. بيان/ باسکردن. لێدوان.
تصوير بالأشعة: تصوير شعاعي/ وێنەی تیشک.
تصوير شمسي/ وێنەی بەرخۆر. خۆر وێنە.
تصوير المستندات: إستنساخ/ فۆتۆکۆپی. لەبەرگرتنەوە.
آلة التصوير: جهاز التصوير/ کامێرا. وێنەکار.
تصويرة: تمثال/ پەیکەر. بت.
تصويرة: صُورَة/ وێنە.
تصويل: غَسل. تَنقِيَة. إخراج شالوائب/ بەربەشۆر. شتنەوە.
تَصَيَّدَ: صادَ/ ڕاویکرد. نێچیری گرت.
تَصَيُّد: صَيد/ ڕاوکردن. نێچیرگرتن.
تَصَيَّفَ: إصطاف. أقام في الصيف/ چوو بۆ هاوینەهەوار. چوو بۆ لەیلاخ. هاوین گەشتی کرد.
تَصيُّف. تصييف. سُبات الصيف. إقامة في الصيف/ هاوینەهەوارکردن. چوون بۆ گەشت بۆ هاوینەهەوار.
تضاءَل: ضَمُرَ. نَقَصَ. تَناقَصَ/ بووکایەوە. کرژبوو. هاتەومیەک.
تضاؤل: تناقُص. تصاغُر. ضُمور/ بووکانەوە. کرژبوون. هاتنەومیەک. کەمبوونەوە.
تضاحَكَ: ضَحِكَ/ پێکەنی. خەنی. کەنی.
تضاحَكَ: تَكَلُّفَ الضَحِك/ بەدرۆ پێکەنی.
تَضادَّ: تَخالَفَ. تَناقَضَ. تَعارَضَ/ بەربەرەکانی کرد. قەبەرایەتی کرد. دژ بوو.
تَضادَّا: تَخالَفا/ تێکچوون. ڕێکنەکەوتن. ناکۆکیان تێکەوت. دژایەتی یەکتریان کرد. پێچەوانەی یەکتر بوون.
تَضادّ: مُخالَفَة. معارَضَة. ضِدِيَّة/ دژایەتی. ناکۆکی. بەربەرەکانی.
تَضارَبَ: إشتَبَكَ. تَشاجَرَ/ شەڕی کرد. یەخەی کرد. چوو بە گژیا. ناوقەدی بوو.
تَضارَبَ تعارَضَ. تناقَضَ. إختَلَفَ/ ڕێکنەکەوتن. شەڕفرۆشتن. چوون بە گژا. ناوقەدبوون.
تَضارُب: تعارُض. تناقُض/ دووبەرەکێتی. دژێتی. ڕێکنەکەوتن. لەیەکنەچوون.
تضاريس الارض: ما بَرَزَ عليها/ بەرز و نزمی. هەڵەت.
تَضاعَفَ: صار ضِعفاً/ بوو بە دوو ئەوەندە. دووجا بوو.
تَضاعَفَ: إزدواج/ دووجابوون. بوون بە دوو ئەوەندە.
تضاعيف: محتويان. مَضمُون/ ناوکرۆک. ناوەکەی. نهێنیەکانی. ناوەرۆک.
في تضاعيفه: في داخله. ضِمن/ لەناویا. لەناوەرۆکیا.
تَضاغَنَ: تَحاقَدَ/ ڕقی لێهەڵگرت. کینەی لێکرد. ڕقی لێکێشا.
تَضافَرَ: تعاوَنَ/ یارمەتی دا. کۆمەکی کرد. پشتگیری کرد.
تَضافُر: تَعاوُن. مُعاوَنَة/ یارمەتی. کۆمەکی کردن. پشتگیری کرد.
تَضامَ: تَراص/ چوومیەک. سفت بوو. لەپاڵ یەکدا بوو.
تَضامَ القَوم: إتَّحَدُوا/ یەکیان گرت. چوونە پاڵ یەک. پشتگیری یەکتریان کرد. بوون بە.

تَضامّ: تَراصّ. إحكام. رسوخ. متانة/ سفتی. قایمی. لە پاڵ یەكدابوون. یەكگرتن.

تَضامَنَ: تكافَلَ/ پشتی گرت. بوو بە زامنی.

تَضامَنَ القَومُ علی أمر: إتَّحَدُوا متفقين عليه/ ڕێكەوتن. پێكهاتن. یەكیانگرت.

تَضامُن: تماسُك. إتِّحاد/ یەكگرتن. پێكهاتن. ڕێكەوت. هاوكاری. پشتگیری. دەسەبەری.

تَضايَقَ: إنزَعَجَ وتكَدَّر/ (بێزار. پەست. وەڕس. هەراس) بوو.

تَضايَقَ مالياً: تَدَهوَرَت أموره المالية/ تێشكا. دارایی نەما. دارایی تێكچوو. دەستی كورتبوو.

تَضايُق: كَدَر. مُضايَقَة. ضَجَر/ تێشكان. بێزاری. پەستی. وەڕسبوون.، هەراسبوون.

تَضَجَّرَ مِن: ضَجِر من. قَلِقَ وتَبَرَّم/ نارامی لەبەربڕاز بێزاربوو. جاڕس بوو. پەست بوو. تاقەتی چوو.

تَضَحضَحَ الأمرُ: تَبَيَّنَ/ ئاشكرابوو. دەركەوت. پێزانرا. ڕوونبووەوە.

تَضَحضَحَ السَرابُ (الكذب والخداع): تَرَقرَقَ. إتَّضَحَ/ ڕەوییەوە. تەنك بوو. ئاشكرابوو. پێزانرا.

تَضحيَة: بَذل. فِداء/ بەختكردن. هەوڵدان.

تَضحيَة: تقديم ذبيحة أو قربان/ خێركردن. قوربانی كردن.

تَضحيَة بالنفس: فِداء النفس/ خۆبەختكردن.

تَضَخَّمَ: كَبُرَ. إزداد/ گەورە بوو. ئاوسا. قەڵەو بوو.

تَضَخُّم: إزدياد الحجم/ ئاوسان. گەورەبوون. قەڵەوبوون. قەبەیی.

تَضَخُّم مالي: كثرة العملة المطروحة في السوق/ دراو زۆری.

تَضَخُّم في الإنتاج: الانتاج الغزير/ بەرهەم زۆری.

تَضَخُّم في عُضو: نُمو مُفرَط/ ئاوسان. ئاوساوی. هەڵتۆقین.

تَضخيم: تكبير. تجسيم/ گەورەكردن. زلكردن. قەبەكردن.

تَضخيم: مُبالَغَة: إطناب/ درێژكردنەوە. پێوەنان. زیادەڕەوی.

تَضَرَّجَ بالدم: تَلَطَّخَ بالدم/ خوێناوی بوو. خوێنی بەركەوت. تلایەوە لە خوێنا.

تَضَرَّجَ: تَشَقَّقَ. تَفَتَّحَ/ كرایەوە. دەمی كردەوە. درزی برد.

تَضَرَّرَ: أصابَهُ ضَرَر. تأذَّى/ زیانی لێكەوت.

تَضَرَّعَ الى الله: إبتَهَل. تَوَسَّل. التمس/ لەخواپاڕایەوە. لاڵایەوە.

تَضَرَّعَ: تَذَلَّلَ/ ڕسوابوو. سووك بوو. خۆی ڕسوا كرد.

تَضَرُّع: إبتهال. توسل. التماس/ پاڕانەوە. داواكردن. لاڵانەوە.

تَضَرَّمَ: إضطرم: إشتعل/ سووتا. گڕی گرت. داگیرسا. هەڵگیرسا. كلپەی سەند. كلپەی كرد.

تَضريب اللحاف: وضع القطن فيه/ لۆكە و ناوئاخن تێخستن. لێفەدروون.

تَضريب: دَرز/ تەقەڵ. دروومانی تەقەڵی زل. درشت.

تَضريب: خَلط. مَزج/ تێكەڵكردن. ئاوێتەكردن.

تَضَعضَعَ: تَهَدَّم. تَخَرَّبَ/ ڕووخا. تێكچوو.

تَضَعضَعَ: ذَلَّ. خَضَعَ/ ڕسوابوو. سەرشۆڕ بوو.

تَضَعضَعَ ماله: قَلَّ/ تێشكا. دارایی شلۆق بوو.

تَضَعَّفَهُ: إستَضعَفَهُ. رآهُ أو عَدَّهُ ضعيفاً/ بەلاواز و بێهێز و بێبایەخ (دایناً. سەیری كرد).

تَضعيف: مُضاعَفَة. تَثنيَة/ دووبارەكردنەوە. دووجاكردن.

تـضعيف: إضـعاف. ضـد تقويـة/ بێهێزكـردن. لاوازكردن.

تَضَلَّعَ من علمٍ: تمكَّن. أتقنَ. نـال منـه حظّـاً وافـراً/ زۆری خوێند. بوو به زانا و خوێندەوارێكی بالا.

تـضَلُّع مـن علـم: تمكّـن. إتقـان/ زۆر خوێنـدن. تێگەیشتویی. دانایی.

تـضليع: جعـل الـشيء علـى هيئـة الاضـلاع/ پەلدارکردن.

تــضليع: تثنيـــه/ بەمەڵـەبردن. مەڵـەپێكردن.

وێڵكـردن. ونكـردن. سـەرلێتێكدان. پێ لـێ تێكدان.

تــضليل: خـــدع/ خەڵەتانــدن. فێڵلێكــردن. مەڵخەڵەتاندن. دەستبڕین.

تـضليلي: مُـضَلِّل. مُتَيِّـه. مُشَوِّه/ ونكـەر. وێڵكـەر. گومڕاكەر. پێ ونكەر.

تضليلي: مُؤدٍ إلى الضلال. خادِع/ فێڵباز. دەستبڕ. مەڵخەڵەتێن.

تضمَّخ بـالطيب: تطَيَّبَ. تعطَّرَ/ بۆنی لـه خۆی دا. خۆی بۆندار كرد.

تَضَمَّدَ: ضَمَّدَ. شُدَّ بـالضماد/ پێچرایەوە. بەسترا.

تـضَمَّرَ: ضـمَرَ. ضـمُرَ. هـزُلَ/ لـەرولاواز بـووە. پووكايەوە. سیس بوو.

تضمَّنَ الشيءَ: إشتمل عليه. إحتواه/ گرتی. تیابوو. لەناویا بوو. جێی تیابووەوە.

تـضمّن الـشيءَ: إلتزَمـهُ وغرِمَـهُ/ بژاردی. خستیە ئەستۆی خۆیەوە.

تضمُّن: إحتواء. شُمول/ تیابوون. لەناویابوون.

تـضميد: شـدّ بالـضماد/ پێچانەوە. چـارەكردن. تیماركردن. بەستن.

تـضمين: إدراج. إدخــال/ تێخـستن. خـستنەناو. تێهەڵكێشكردن.

تضمين: تغريم/ پێبژاردن.

تضمين: تمارُض/ خۆی (نـەخۆش خـست. كرد بـه نەخۆش).

تَضَوُّء: إمرار ضوء خلال عُضو بُغيَة فحصه/ تیشك پیابردن.

تَـضوَّرَ تلَوّى من جوع أو ألم/ لـه برسـانا. لەتاو ئازار. لەتلایەوە. گینگڵەی ئەدا.

تَـضوَّعَ: فـاحَ. إنتـشرت رائحتـه/ بۆنی هـات. بۆن بڵاوبووەوە.

تَـضوُّع. تَـضيُّع. فوَحــان. إنتــشار. فُــواح/ بـۆن بڵاوبوونەوە.

تَضَيَّفَ: ضافَ. نزلَ ضيفاً/ بوو به میوان.

تَضَيَّقَ: ضاقَ. ضد إتّسَعَ/ تەسك بوو. هاتەوەيەك.

تَضَيَّقَ: ضُيِّقَ/ تەسك كرایەوە.

تضييع: إضاعة/ ونكردن. ونبوون. له كیسچوون. فەوتان. لەدەستچوون. گومبوون.

تضييق: تقليص/ تەسك كردنەوە. جەڕاندن.

تضييق على: حَصر. ضغط/ پەستاندن. جەڕاندن.

تضييق الخناق: ظُلم/ تەنگ پێهەڵچنین. زۆرداری. زۆرلێكردن. لێهەڵپێچان.

تطابَقَ مع: تماثَل. توافَقَ. إتَّفقَ/ لێی چوو. وەكو ئەو بـوو. بـۆی گونجـا. لەگـەڵی گونجا. جـووت بوو.

تطابَقَ القومُ: إتّفقوا/ رێكەوتن. پێكهاتن.

تطابَقَ: تراصف في طبقـات/ چین چین بوو. چین لەسەر چین بوو.

تطـابُقُ الـشكل الهندسي مع شكل آخـر: تماثـل/ جووت بوو. وەك ئەو بوو. لێی ئەچوو.

تطـابُق: تماثـل. توافُـق. إتفـاق/ لەيـەك چوون. گونجان. وەك يەك بوون.

تَطارَحَ: تَبادَلَ تناظر وجاوَبَ في الشعر والكلام/ وەڵامی دایەوە. ئەم ئەیوت ئە ئەیسەندەوە. شەڕ و قسە و شەڕە شیعریان بوو.

تطارَشَ: تظاهَر بالطرش/ خۆی (کەڕکرد. لێ کەڕکرد. کەڕ پیشاندا).

تَطَأطَأ: إنخفض/ تەپی. نەوی. نزم بووەوە. داچوو. چوو بە قوولا.

تطاطأ: تصاغرَ. تَمَسكَنَ/ خۆی بچووک و نزم و کزۆلە پیشان ئەدا.

تطاعَنَ: طَعَنَ بَعضُهُم بَعضاً/ (ئەیانچەقان. ئەیانکرد) بە یەکتریدا.

تطاوَلَ: تَكَبَّرَ وتَرَفَّعَ/ خۆی بە زل دانا. خۆی گەورە کرد. فیزی نواند.

تطاوَلَ: تَمَدّد قائماً لينظر إلى بعيد/ خۆی بەرزکردەوە.

تطاوَلَ طالَ. صار طويلاً/ دریژبوو. دریژبووەوە.

تطاوَلَ: طالَ. دام طويلاً/ زۆر مایەوە. بەتەمەن بوو. زۆری خایەن.

تطاوَلَ على: إعتدى/ دەستدرێژی لێکرد. ناوی زڕان. قسەی ناشیرینی (پێوت. شوێنخت).

تطاوَلَ على: تجاسَرَ. إجترأ/ لەڕوویدا هەڵگەڕایەوە.

تَطايَرَ تفَرّقَ. إنتشرَ. تصاعَدَ/ بڵاوبووەوە. بەرزبووەوە. چوو بە هەوادا.

تطايُر: تفَرُّق. إنتشار. تصاعُد/ بڵاوبوونەوە. بەرزبوونەوە. چون بە هەوادا.

تَطَبَّبَ تداوي/ خۆی تیمارکرد. تیمارکرا. چارەکرا.

تَطَبَّعَ: تأثّرَ. تخلّقَ/ ڕاهات. ڕامبوو. خووی گرت. ڕسکا.

تَطَبَّعَ بِطباعِه: تخلّقَ باخلاقه/ ڕەوشت و خووی ئەوی گرت.

تَطَبَّعَ النَّهرُ: فاضَ/ ئاوهەڵسا. ڕووبار پڕ بوو. سەرڕێژی کرد.

تَطَبُّع: قابلية التكيف/ فێربوون. ڕاهاتن.

تَطَبُّع: إكتساب الشخصية او الأخلاق/ ڕەوشت و خوو وەرگرتن.

تَطَبَّقَ: إنغلَقَ/ داخرا. پێوەدرا. جووت بوو. قەپات بوو.

تَطَبَّقَ: تراصَفَ في طبقات/ چین چین وەستا.

تَطَبُّل البطن بالغازات: إنتفاخ البطن/ باکردن.

تطبيب: تداوي. مُعالَجة/ چارەکردن. دەرمانکردن. تیمارکردن. پزیشک کاری. نووشداری.

تطبيع: جَعل الشيء طِبقاً للقياس والمطلب/ ڕاهێنان. ڕسکاندن. هێنانە ژێربار.

تَطبيق: تنفيذ/ جێبەجێکردن. بەجێهێنان. تاقیکردنەوە. ڕاهێنان.

تطبيقي: عملي. فعلي/ بەکردەوە. کردەکی. کارتیاکردن.

تطبيل: ضَرب الطبل/ تەپڵ لێدان. تەپڵ ژەندن. دەهۆڵ لێدان.

تَطَرَّبَ: طَرِبَ. فَرِحَ. سُرَّ/ دڵی خۆش بوو. دڵشاد بوو. کەیفی کرد.

تَطَرَّبَ: أطرَبَ. جملة على الطَرَب. سَرّهُ/ دڵخۆشی کرد. کەیفی دایە. هێنایە جۆش.

تَطَرَّزَ: طُرِّزَ/ چنراو نەخشێنرا.

تَطَرَّزَ في لِباسه: يلبس الفاخر/ جلی گەشخە و نایاب لەبەر ئەکا. خۆی ئەڕازێنێتەوە.

تَطَرَّفَ: جاوَزَ الاعتدال/ ئاسایی لایدا. لە ڕادە چووە دەرەوە. زیادەڕەوی کرد.

تطرَّفَ: أتى الطرَفَ/ سەرپەڕی گرت. هاتە سەر پەڕ.

تطرُّف: تجاوُز الحدّ. عدم إعتدال/ لە ئاسایی لادان. لە ڕادەبەدەربوون. پەڕگری. زیادەڕەوی. ڕادیکالێتی.

تطرُّفي: مُتطرِّف/ لە ئاسایی لادا و. پەڕگر. زیادەڕەو. ڕادیکالی.

تطرَّقَ الى: سار الى/ بۆی چوو. ڕووی تێکرد.

تطرَّقَ الى الموضوع. لمح أشار إليه. ذكر عنه/ بۆ باسەکە چوو. لێی دوا. باسی لێکرد.

تطرَّقَ اليه الشكُّ: وَسوَسَ/ دڵی پیس کرد. گومانی کرد.

تطريز: شغل الإبرة. توشية/ نەخشاندن. نەخشکردن. چنین.

تطريق: طَرق. ترقيق , تصفيح/ کوتان. لێدان. تەنککردن. پانکردنەوە.

تطعَّمَ: ذاقَ/ تامی کرد. چەژتی. چەشتی. چێژتی. چێشتی.

تطعَّمَ: رُصِّعَ بالصدَف أو الذهب أو الفضة/ تێگیرا. ڕازێنرایەوە. ڕووکەش کرا.

تطعَّمَ: لُقِّحَ. زُرِقَ/ کوترا. دەرزی لێدرا.

تطعَّمَ النباتُ أو الغُصنُ: غُرِزَ/ موتوریە کرا.

تطعيم: ترصيع/ تێگرتن. ڕازاندنەوە. نەخشاندن. ڕووکەشکردن.

تطعيم: تلقيح/ کوتان. دەرزی لێدان.

تطعيم النبات والغصن: غَرز/ موتوریەکردن.

تطفَّلَ: تدخَّلَ في مالايعنيه/ خۆی تێهەڵقوتان.

تطفَّلَ: تخلَّقَ بأخلاق الأطفال/ خۆی منداڵ کردەوە. ڕەوشت و خوی منداڵی گرت.

تطفَّلَ: وَغَلَ. صار طُفيلياً/ بوو بە مشەخۆر. بەمشەخۆری ئەژی.

تطفُّل: تدخُّل في أمور غير معنية/ خۆتێهەڵقوتاندن.

تطفُّل: دَغَل/ مشەخۆری. دیفەلانی. زک لەوەڕاندن.

تطلَّبَ: إقتضى. إستلزم. إحتاج الى/ پێویست بوو. ئەبولیە. وا پێویست بوو.

تطلَّبَ الشيءَ: طلبه مرّةً بعد أخرى/ داوای کردەوە. زوو زوو داوای ئەکردەوە.

تطلَّعَ: إمتلأ. تدفَّق من جوانبه/ پڕبوو. سەرڕێژ بوو. لێی ڕژا.

تطلَّعَ إلى: تشوَّقَ إلى. توقَّعَ بأمل/ بە هیوا و خۆزگەوە سەیری کرد. تێڕوانی. سەرنجی لێدا.

تطلَّعَ إلى: تاقَ إلى. حنَّ إلى/ بیری کرد. خۆزگەی بۆ خواست.

تطلَّعَهُ: أدركَهُ وغلبَهُ/ پێی گەیشت و بەجێی هێشت. بۆڕی دا.

تطلَّعَهُ: أدركَهُ وغلبَهُ/ پێی گەیشت و بەجێی هێشت. بۆڕی دا.

تطلَّعَهُ: علمَهُ/ فێری کرد. بۆی ڕوونکردەوە. پیشانی دا.

تطلَّعَهُ: نظر الى طلعته. نظر اليه/ چاوی پیاخشان. سەیری قەدوباڵای کرد.

تطلُّع: أمل. رجاء. ترقُّب. توقُّع/ هیوا. ئاوات. چاوەڕوانی. شیان.

تطلَّقَ وَجهُهُ: إنطلقَ وجهه. إنبسط/ گەشایەوە. ڕووی کرایەوە. ڕووخۆش بوو.

تطليق: طلاق. تسريح/ تەڵاق. تەڵاقدان. دەستلێهەڵگرتن. دەستبەرداری.

تطهَّرَ: تنزَّهَ عن الأدناس/ خۆی پاکردنەوە لە هەموو کردەوەیەکی خراپ و ناشیاو.

تَطَهَّرَ إغتَسَلَ. تَنَظَّفَ/ خۆی شت. شتی. گڵاوی دەرکرد.

تطهیر: جعل الشيءَ طاهراً/ خاوێنکردن. گڵاوی دەرکردن.

تطهیر: خَتن. خِتان/ خەتەنەکردن. سونەت کردن.

تَطَوّى: تَحَوّى. تَكَوَّرَ/ لوول بوو. کرمۆڵە بوو. بوو بە کلۆڵە.

تطوى الثعبان: تَحَوّى/ مار کرمۆڵە بوو. پەپکەی بەست.

تطواف: طَواف. دَوَران. تَجَوُّل/ سووڕانەوە. گەڕان. گڕخواردن.

تَطَوَّحَ: سَقَطَ/ کەوت. کەوتەخواری. کەوتەناوی.

تَطَوَّحَ: تَرَنَّحَ/ گەڕا. سووڕایەوە. لۆژلۆژ ئەسووڕایەوە. بەملاولادا ئەکەوت.

تَطَوَّحَ: تَجَوَّلَ/ گەڕا. سووڕایەوە.

تَطَوَّرَ تَحَوَّلَ من حالٍ الى حال/ گۆڕا. گەشەی کرد.

تَطَوُّر: تَحَوُّل/ گۆڕان. گەشەکردن. پەرەسەندن. گۆڕانباشی. گۆڕانکاری.

تَطَوَّسَ: تباهى. تَبَختَرَ/ خۆی (کیف کردەوە. فش کردەوە. هەڵکێشا. بادەدا).

تَطَوَّسَت المرأة: تَبَرَّجَت وتَزَيَّنَت/ خۆی ڕازاندەوە.

تَطَوَّعَ بالشيء: تَبَرَّعَ بالشيء/ بەخشی. تەرخانی کرد. باریوکرد.

تَطَوَّعَ في الجندية: إنخرط في الجيش/ خۆی کرد بە سەرباز. چوە ناو سوپاوە.

تَطَوُّع: إنخراط في الجيش إختيارياً/ بوون بە سەرباز. چوونە ناو سوپا.

تَطَوُّعي: طَوعي. إرادي. إختياري/ لەخۆوە. خۆبەخشینی. خۆکرد.

تَطَوَّفَ: طافَ. دار. جالَ/ سووڕایەوە. گڕی خوارد. گەڕا.

تَطَوُّف. طَواف. دوران. تَجَوُّل/ سووڕانەوە. گەڕان. گڕخواردن.

تَطویب: تَطویب عقاري. تَسجیل عقاري/ تاپۆ. تاپۆکردن.

تَطویر: تَغییر. تَحسین/ گۆڕین. گەشەپێدان. پەرەپێدان.

تطویع: إخضاع/ ڕامێنان. ڕامردن. سەرپێشۆڕکردن. هێنانەژێربار.

تطویق: إحاطة/ دەورەدان. دەورەگرتن. بازنەدان. ئابڵوقەدان. تێوروکان.

تطویق: كَبح/ دامرکاندنەوە. دڵبینکردن. دەستبەسەرگرتن. کۆنتڕۆڵ کردن.

تطویل: إطالة/ درێژ (کردن. کردنەوە. پێدان).

تَطَیَّبَ: تَعَطَّرَ/ بۆنی لەخۆی دا. خۆی بۆندار کرد.

تَطَیَّرَ بالشيء أو من الشيء: تَشاءَمَ/ ڕەشبینی لێکرد. دڵی لێ پیس کرد. بە شوم بوو.

تَطَیُّر: تشاؤم/ ڕەشبینی.

تَطییر: جعل الشيء یطیر. تصعید/ هەڵفڕاندن. هەڵدان. بەرزکردنەوە.

تَطیین: تَلَطُّخ بالطین/ قوڕاوی بوون. قوڕگرتن. قوڕبەرکەوتن. قوڕتێهەڵسوون.

تَظاهَرَ: تَعاوَنَ/ یارمەتی دا. کۆمەکی کرد. پشتگیری کرد.

تَظاهُر: تعاوُن. مُعاوَنَة/ یارمەتی. کۆمەکی کردن. پشتگیری کردن.

تَظاهَرَ بـ: إدَّعى/ وتی. وای پیشاندا. خۆی وا پیشان ئەدا.

**تظاهرَ القوم:** تباعَدُوا وتدابروا/ لەیەک دووركەوتنەوە. پشتیان كردە یەكتری.

**تظاهرَ القوم:** تعاونوا. قاموا بمظاهرة/ خۆپیشاندیان كرد. ڕێپێوانیان كرد.

**تظاهُر:** إدِّعاء/ وتن. داواكردن.

**تظاهُر:** قيام بمظاهرة/ خۆپیشاندان. ڕێپێوان. ڕانان.

**تَظَرَّفَ:** تكلف الظرافة/ خۆی (قۆزكرد. ڕازاندەوە. ڕێكوپێك كرد. شۆخ كرد.

**تَظَلَّل بالشيء:** جلس في ظِلِّه/ لە سێبەریا دانیشت. لە پەنایە حەسایەوە.

**تَظَلَّم:** شكا/ سكاڵای كرد. كڕووزایەوە. داد و بێدادی كرد.

**تَظَلَّم:** صَبَر على الظُّلم/ هاوار و فوغانی لەدەست زۆرداری كرد. ئارامی گرت. دڵی بە خۆیا گرت. ملكەچی زۆردار بوو.

**تَظَلُّم:** شكوى/ سكاڵاكردن. كڕووزانەوە. داد و بێدادكردن.

**تَظليل:** إلقاء الظِلّ على/ داپۆشین. شاردنەوە. سێبەر خستنەسەر. تاریككردن.

**تظهير:** تجيير/ جیرۆكردنی چەك.

**تَعاتَبَ:** لام. لام أحدهما الآخر/ سەرزەنشتی یەكتریان كرد. گلەییان لە یەكتری كرد. ڕاز و گلەییان ئەكرد.

**تعاجَلَ:** تسارَعَ/ پەلەكردن. هەڵپەكردن.

**تَعاجُل:** تسارُع/ پەلەكردن. هەڵپەكردن.

**تَعادٍ:** التعادي. عَداء. عِداء. عداوة/ دوژمناتی. دوژمنایەتی. نەیاری. دشمناتی. دوشمنایەتی.

**تَعادى:** عادى بعضهم بَعضا/ دوژمنایەتیان لەگەڵ یەك ئەكرد.

**تعادَى:** تباری/ بۆڕبۆڕێنی كرد. پێشكەوتنی ئەكرد.

**تعادَت النوائب والحوادث:** توالت/ كارەسات و بەڵا بەدوای یەكدا ئەهات و ڕووی ئەدا.

**تعادَلَ:** تساوى/ وەك یەك بوون. هێندەی یەكتری بوون.

**تعادَلَك** توازَنَ/ هاوێشك بوو. لە كێشدا وەك یەك بوون. هاوسەنگ بوون. لە تەرازوودا بوو.

**تعادَلَ:** تحايَدَ/ بێلایەن وەستاز بێلایەنی كرد.

**تعادُل:** تساوٍ/ وەك یەك بوون.

**تعادُل:** توازُن/ هاوكێشی. هاوسەنگی.

**تعادُل:** تحايُد/ بێلایەنی.

**تعاذَلَ:** لام/ گلەیی لێكرد. سەرزەنشتی كرد.

**تعارَضَ:** تخالَفَ. تناقَضَ أظهر الإعتراض/ بەرهەڵستی كرد. ناڕەزایی دەربڕی. دژایەتی كرد.

**تعارُض:** مُخالفة. مُناقَضة/ بەرهەڵستی. ناڕەزایی. دژایەتی.

**تعارَفَ:** عَرَّفَ نفسَهُ وتعرَّفَ عليه/ ناسی. خۆی پێ ناساند.

**تعارَفَ القومُ:** عَرَفَ بَعضُهُم بعضا/ یەكتریان ناسی.

**تعارُف:** حُصول المعرفة/ یەكتری ناسین.

**تعارَكَ:** تقاتَلَ. تشاجَرَ/ جەنگی. شەڕی كرد. شەڕی فرۆشت.

**تعاركوا:** تقاتلوا/ جەنگین. چوون بە گژ یەكدا. تێكبەربوون.

**تعارُك:** تقاتُل. مُشاجَرة/ چوون بە گژیەكدا. شەڕكردن. جەنگین. تێكبەربوون.

**تعاريج:** إعوجاج. إنحناءات/ پێچاوپێچ. بەرزونزمی. خواروخێچی.

**تعاسة:** شقاء. بُؤس. فاقة. ضَنْك/ کەساسی. خەمباری. بارکەوتوویی. کلۆڵی. نەهاتی.

**تعاسَرَ عليه الأمرُ:** تَعَسَّرَ. إشتَدَّ والتَوَى/ کارەکەی لێ گران بوو. لێی ئاڵۆزا.

**تعاشَرَ:** تصاحَبَ. تَخَالَطَ/ بوو بە دۆست و ئاشنا و ئاسیاو. تێکەڵی کرد.

**تعاشَرَ:** تَساكَنَ/ لەگەڵی ژیا.

**تعاصى.** إستعصى/ یاخی بوو، چووەکەڵ شەیتان.

**تعاصَرَ:** عاصَرَهُ في عصر وجيل واحد/ هاودەم و هاوچەرخی بوو.

**تعاضَدَ:** تَعاوَنَ/ یارمەتی دا. پشتگیری کرد.

**تعاضُد:** تعاوُن/ یارمەتی دان. پشتگیری کردن.

**تعاطٍ. التعاطي:** مزاوَلَة. مُمارَسَة/ کردن. ئیشکردن. پیشەگەرێتی.

**تعاطي الشيءَ:** تناوَلَهُ. أخَذَ/ وەرگرت.

**تعاطي الأمرَ:** قام به أو خاض فيه. مارَسَهُ/ کردی. کارەکەی کرد. کردی بە پیشە. سەری تێکرد.

**تعاطَفَ مَعَ:** رَقَّ له. حَنَّ عليه/ بەزەیی پیاهاتەوە. دڵی پێ سوتا. دڵنەوایی کرد. مشوری خوارد.

**تعاطَفَ في مشيته:** حَرَّكَ رأسه وتمايَلَ وتثنَّى/ لە ڕۆیشتنا سەری ئەلەقان و خۆی بادەدا.

**تعاطُف:** مُشارَكة الغير في حالته الوجدانية/ بەزەیی. دڵنەوایی. بەتەنگەوەهاتن. مشورخواردن.

**تعاظَمَ:** إشتدَّ. إستفحل/ توندوتیژ بوو. ڕەق بوو. بەزەبر و بەهێز بوو.

**تعاظَمَ:** تكَبَّرَ/ خۆی زل کرد. خۆی بە گەورە دانا. گەورەیەتی نواند. لووتی بەرزکردەوە. فیزی نواند.

**تعاظُم:** إشتداد/ توندوتیژی. بەهێزبوون. قایم بوون. زەبرنواندن.

**تعاظُم:** تكَبُّر/ لووت بەرزکردنەوە. فیزنواندن. خۆبەزلگرتن.

**تعافٍ. التعافي.** شفاء. بُرء/ چاکبوونەوە. ساڕێژبوونەوە. هەڵسانەوە.

**تعافى:** شُفِيَ. إسترجع وإستردّ صحّتَهُ. نَقِهَ/ چاکبووەوە.

**تعاقَبَ:** تناوَبَ. تَداوَلَ/ نۆرەی کرد.

**تعاقَبَ:** تتابَعَ/ بەدوای یەکداهاتن. بەدوادواهاتن. یەک لە دوای یەک بوون.

**تعاقُب:** تناوُب. تَداوُل/ بەنۆرە. نۆرەکاری.

**بالتعاقُب. على التعاقُب:** على التوالي/ بەدوادوا. یەک لە دوای یەک.

**تعاقُبي:** مُتعاقِب. متتابِع. متوالٍ/ یەک لە دوای یەک. دوابەدوا. بە دوای یەکدا. نۆرە.

**تعاقَدَ:** عَقَدَ إتفاقاً. تَعاهَدَ/ پەیمانی بەست. بەڵێنی دا.

**تعاقُد:** إتفاق/ پەیمان. بەڵێن. ڕێکەوتن.

**تعاكَسَ.** إنعكس/ پێچەوانەبووەوە.

**تعالَكَ هَلُمَّ.** إحضَرْ/ بێ. وەرە. ئاوەرە. بەو. بێرە. بۆرێ. فەرە.

**تعالٍ. التعالي:** إستعلاء. سُمو. تَفَوُّق/ بەرزبوونەوە. بەرزپوانین. خۆبەزل زان.

**تعالٍ:** عُلو. عُلى. عَلاء/ بەرزی. بەرزایی. بەرزێتی.

**تعالَى:** إرتفع. عَلا/ بەرزبووەوە. بڵندبووەوە. هەڵچوو.

**تعالَى عن:** تَرَفَّعَ عن. أنِفَ/ بێزی لێ ئەهاتەوە. خۆی زۆر بە زلتر ئەزانی. بەزلتر دائەنا.

تعالَجَ: تَداوَى. تعاطى العِلاج/ دەرمانی خۆی کرد. خۆی چارەکرد.

تعالَجَ القومُ: تَقاتَلوا/ یەکتریان کوشت. چوون بە گژیەکدا. شەڕیان ئەکرد.

تعالَمَ: إدَّعى العلم/ خۆی بە زانا دائەنا. ئەیوت ئەزانم.

تعالَمَ: عَلِمَ/ زانی. پێی زانی.

تعاليم: وَصايا: مبادئ. مَذهب/ بیروباوەڕ. بەندەکانی بیروباوەڕ.

تعامَى: أظهر العَمى/ خۆی کوێر پیشاندا. ئەیوت نابینم.

تعامَى عَن كذا: تَصَنَّع وتظاهروأهمل/ خۆی لێ کوێر کرد. چاوی لێ پۆشی. خستیە پشتگوێ.

تعامَلَ في أو بـ: تعاطَى. تاجَرَ باع واشترَى/ پێوەی خەریك بوو. ئەیکڕی و ئەیفرۆشتەوە.

تعامُل: مُتاجرة. أخذ وعَطاء/ بازرگانێتی. مامەڵەکردن. کڕین و فرۆشتن. وەرگرتن و دان.

تعامُل: مُعامَلَة. مُساوَمَة. مُعالَجَة/ سەنگ و سووکی. سەواوومامەڵە.

تعامُل: عُرف/ نەریت. باو.

تعانَقَ: عانَقَ. طَوَّقَ عُنُقَهُ/ دەستی کردە ملی. باوەشی پیاکرد.

تعانُق: عِناق. حِضن/ دەستکردنە مل. باوەشپیاکردن.

تعاقَدَ: تعاقُد/ ڕێکەوت. پێکهات. پەیمانی بەست.

تعاهَدَ: تَعَهَّدَ. رَعَى/ چاودێری کرد. چاوی لێوە بوو. بایەخی پێدا.

تعاوَرَ الشيء: تعاطاه وتَداوَلَه/ ئەیخواست. داوای ئەکرد. دەستیاوی ئەکرد.

تعاوَنَ: ساعَدَ. أعانَ/ یارمەتی دا. کۆمەکی کرد. دەستی یارمەتی درێژکرد.

تعاوَنَ القَومُ: أعان بعضهم بعضا/ یارمەتی یەکتریان ئەدا. کۆمەکی یەکتریان ئەکرد.

تعاوُن: مُعاوَنَة. مُساعَدَة/ یارمەتی. دەستگرتن. دەستگیری.

تعاوُن: الإشتراك معاً/ بە کۆمەڵ. بە یارمەتی یەکتری. پێکەوە.

تعاوُني: بشكل جماعي/ هاوکاری. هەرەوەزی. هاوبەشێتی. هەرەوەزگە.

تعايَشَ القوم: عاشوا على الألفة والمَحَبَّة/ بە ئاسوودە و خۆشی پێکەوە ژیان. گوزەرانیان کرد. سەریان ناپێکەوە.

تعايُش: تَواجُد ومَعيشَة في ذات الوقت/ پێکەوەژیان. گوزەران کردن.

تعايُش سِلمي: المساوات في الوجود والمعيشة/ گوزەران کردن و ژیان بە خۆشی و ئاسودەیی.

تَعَب: كلالة. ضِد الراحَة/ ماندووێتی. شەکەتی. ماندویەتی. چەوسانەوە. چەرمەسەری.

تَعَب: كَدّ. مَسعى/ ڕەنجدان. چەوسانەوە.

تَعِب: تَعبان. مُتعَب. ضِد مُرتاح/ ماندوو. شەکەت. هیلاك. کلت. کەشەنگ. ڕەتیاو. ڕەتیك.

تَعِبَ: أعيا وكَلَّ. ضد إرتاح/ ماندوبوو. شەکەت بوو. هیلاك بوو.

تَعِبَ: كَدَّ/ ڕەنجی دا. چەوسایەوە.

تَعِبَ منهُ: مَلَّهُ/ لێی بێزاربوو. وەڕس بوو. جاڕس بوو.

تَعبِئَة: إملاء. مَلء. تَعليب/ پڕکردنەوە. پڕکردن. داگرتنەوە.

تعبئة: تألُّب للحرب. تجنید/ سەربازگرتن. لەشکرکۆکردنەوە. تەیاربوون. ئامادەبوو. ڕەتیاو ڕەتیك.

تَعَبَّدَ: تفرَّغ للعبادة/ ڕووی کردە خواپەرستنی. خۆی تەرخان کرد بۆ خواپەرستی.

تُعُبِّدَ: عُبِّدَ. تُمُهِّدَ/ تەخت کرا. قیرتاو کرا. بەردڕێژ و چەوڕێژ کرا.

تَعَبُّد: عبادة. تفرّغ للعبادة/ خواپەرستی.

تَعَبَّس: عَبَسَت. تَقَطَّبَ وجهه/ ڕووی گرژ کرد. مۆن بوو. دەموچاوی دا بەیەکدا.

تعبید الطرق: تمهید. تبلیط. رَصف/ تەختکردن. قیرتاوکردن. بەردڕێژ و چەوڕێژ کردن.

تعبید: استرقاق. إستعباد/ کۆیلەکردن. بەندەگیری. کۆیلەیەتی.

تعبیر: شرح/ لێکدانەوە. ڕاڤەکردن. ڕوونکردنەوە.

تعبیر: رَمز/ هێما.

تعبیر: عبارة. لفظ/ شێواز. چۆنیەتی.

تعبیر عن: إعراب عن/ دەربڕین. دەرخستن. ئاشکراکردن.

أسلوب أو طریقة التعبیر: نَمط أو نسق الکلام/ شێواز و چۆنیەتی دەربڕینێ

إذا جاز أو صَحّ التعبیر: بنوع ما. علی سبیل المجاز/ ئەگەر بشێ ئەو دەربڕینە.

لایمکن التعبیر عنه: لایُوصف. لایُقال/ ناوترێ. ڕاناگەیەنرێ. دەرنابڕدرێ. باس ناکرێ.

بتعبیر آخر: بأسلوب آخر. بعبارة أخری/ بە جۆرێکی تر. بە شێوەیەکی تر.

تَعَتَّبَ: تَعاتَبَ. لام/ سەرزەنشتی کرد. گلەیی کرد.

تعتیق: تغییر صفات الجسم مع الزمن/ کۆن کردن.

تعتیم: حَجب النور. إطفاء الأنوار/ تاریککردن. ڕووناکی نەهێشتن.

تعتیم علی: منع من الإنتشار/ دەستبەسەراگرتن. کپکردن و شاردنەوەی هەواڵ و ڕووداو.

تَعَثَّر: زَلَّ. سَقَطَ/ هەڵنوتا. کەوت. هەڵەنگوت. ساتمەی کرد. سەرسمی دا. ڕەتی دا.

تَعَثَّر لسانه: تَلَعثَم/ زمانی ئەیگرت. تێکەڵ و پێکەڵ ئەدوا.

تَعَثْرَ: "تَعَرقَلَ/ گیروگرفت و کۆسپی هاتەڕێ.

تَعَجَّبَ من: دَهِشَ. عَجِبَ. إستغرَبَ/ سەری سوڕما. سەرسام ما. واقی وڕما. لای سەیر بوو.

تَعَجُّب: عَجَب. دَهشَة/ سەرسوڕمان. سەرسامی.

علامة التعجب/ خاڵە سەرسامی. نیشانەی سەرسوڕمان.

تَعَجرَفَ: تَکَبَّر. تَشامَخَ/ بایی بوو. خۆی زۆر بە زل گرت.

تَعَجرُف: عَجرَفة. تَکَبُّر. تَشامُخ/ بایی بوون. خۆ بە زل زان. فیزنواندن.

تَعَجَّلَ: عَجَّلَ. أسرَعَ/ پەلەی کرد. خێرایی کرد. دایەگوڕ.

تَعَجُّل: تعجیل. إسراع/ خێراکردن. دانەگوڕ. گوڕسەندن. تاودان. دەستوبرد. پەلە.

تعجیز: عَدَم إقتدار. ضَعف. قُصور/ پەیبوون. پەکەوتن. لاوازی و بێهێزی.

تعجیزي: غیر ممکن. مُحال. مستحیل/ کاری ستەم گران. ناشی. لە تواناداا نەبوون.

تعجیل: إسراع/ پەلەکردن. گوڕسەندن. خێراکردن. تاودان. دەستوبرد. دانەگوڕ.

تعجیل: حَثّ علی العجلة/ هاندان. پەلەپێکردن. تیژکردن بۆ خێرایی و دەستوبرد.

تَعَدٍّ. التَعَدي: إعتداء/ شەڕفرۆشتن. دەستدرێژی کردن. پەلاماردان.

تَعَدٍّ: خرق. مُخالَفَة. تجاوُز. تَخَطٍّ/ سەرپێچی. لە یاسا و نەریت لادان. لە ڕادە دەرچوون.

تَعَدّى: تجاوَزَ. تَخَطّى. خَرَقَ. خالَفَ/ سەرپێچی کرد. لە یاسا لایدا. لە ڕادە دەرچوو.

تَعَدّى: إعتدى على. جارَ. ظَلَمَ/ زۆرداری کرد. دەستدرێژی کرد.

تَعَدّى: إعتدى على. بادَأ بالشَرّ/ شەڕی پێ فرۆشت. چوو بە گژیا.

تَعداد: عَدّ. حُسبان/ ژماردن. ئەژمار.

تَعداد الأنفُس: إحصاء السكان/ سەرژماردن. سەرژمێری. ئەژمار.

تَعَدَّدَ كثُرَ عَدَدُه/ زۆربوو. زۆرتربوو. پتربوو. فرە بوو. زیاتر بوو.

تَعَدُّد: كَثرَة/ زۆری. فرەیی.

تَعَدُّد الزوجات/ ژن زۆری. فرەژن.

تَعَدُّد المعاني/ فرەواتا.

تَعَدُّدي: مُتَعَدِّد. كثير العدد/ هەمە. هەمەجۆر. هەمەڕەنگ. هەمەچەشن.

تَعَدُّدِيَّة: كَثرَة. تَعَدُّد/ فرە. زۆر. فرە حزبی.

تَعَدَّلَ: تَغَيَّرَ. تَبَدَّلَ/ گۆڕا.

تَعديل: تَبديل. تَغيير/ گۆڕین.

تَعديل: تَقويم/ ڕاستکردنەوە. ڕێخستن. خشتکردن.

تَعديل: تسوية/ تەختکردن. ڕێکخستن.

تَعدين: إستخراج المعادن من منابِعِها/ کانزادەرهێنان. دەرهێنانی کانزا لە کاندا.

تَعَذَّبَ: تألَّمَ/ ئازاری پێگەیی. ئازاری چەشت. ئێشی پێگەیی. سزای چەشت.

تَعَذَّرَ: تَنَصَّلَ/ خۆی دزیەوە. بیانوی هێنایەوە. نەیکرد. نەچوە ژێری.

تَعَذَّرَ 'صبَحَ لِنَفسِه/ پۆزشتی هێنایەوە. داوای لێبوردنی کرد.

تَعَذَّرَ الأمرُ: إمتنع/ کارەکە نەکرا. نەشیا. نەگونجا.

تَعَذَّرَ عليه الأمرُ: تَعَسَّرَ/ کارەکەی لا گران بوو. پێی نەکرا. بۆی نەکرا. جێبەجێ نەبوو.

تَعَذُّر: إستحالة الأمر. عدم الإمكان/ نەکردن. نەشیان.

تَعذيب: إيلام. تبريح/ سزادان. ئازاردان. ئەشکەنجەدان. ئازارپێگەیاندن.

تَعَرٍّ. التَعَرّي: خلع الملابس/ ڕووتبوونەوە. ڕووتی.

تَعَرٍّ. التَعَرّي: خلع الملابس قطعة فقطعة أمام النظّارة/ خۆ ڕووتکردنەوە بە شێنەیی. ستریپتیز.

تَعَرّى: خلع ملابِسَهُ/ جلەکانی داکەند. خۆی ڕووتکردەوە.

تَعَرَّبَ: تَشَبَّهَ باخلاق العرب أو جعل نفسه عربياً/ خۆی کرد بە عەرەب. ڕەوشت و خوی عەرەبی گرت.

تَعَرَّجَ: مالَ/ لاریبووەوە. خواربووەوە.

تَعَرُّج: مَيَلان. تَمَوُّج. تَمَعُّج/ خواری. لاری.

تَعَرُّجات: تعاريج/ پێچاوپێچ. خواروخێچی. بەرزونزمی.

تَعَرَّشَ النباتُ: تَسَلَّقَ/ بەرزبووەوە. خۆی هەڵواسی. تەنیەوە.

تَعَرَّشَ بالمكان: ثَبَتَ/ لە جێگەکەدا مایەوە. جێگیر بوو. دایکوتا.

تَعَرَّضَ لكذا: كان عُرضَةً أو هدفاً له/ وەختەبوو تووش بێ. تووش بوو. پێوەبوو.

تَعَرَّضَ لكذا: تَصَدّى. صايَرَ. قاوَمَ/ بەرهەڵست بوو. بەرچی دایەوە.

تَعَـرَّضَ للأمـر: تَـدَخَّلَ فيـه. تَعَـرُّش/ دەسـتی تێخست. خۆی تێخست. خۆی تێهەڵقوتان.

تَعَرَّضَ لـ. تَطَرَّقَ. لمح او اشار/ هێمای بۆ کرد. ناوی هێنا. لێی دووا.

تَعَرَّضَ: كَون الشيء عُرضاً او عُرضَةً/ تووشبوون. پێوەبوون.

تَعَـرُّض: تَـصَدٍّ. مُواجَهَـة/ بەرهەڵـست وەسـتان. بەرچدانەوە.

تَعَـرُّض: تَـدَخُّل. تَعَـرُّش/ دەسـت تێخـستن. خۆتێهەڵقوتان.

تَعَـرُّض: بَحـث/ باسـكردن. ناوهێنـان. هێمابۆكردن.

تَعَرَّفَ به أو إليه: صار معروفاً. جعله يعرفه/ ناسی. ناسیاوی لەگەڵ کرد. بوو بە ئاشنای.

تَعَـرَّفَ الأمـرَ: تَحَـدَّدَ. تَبَـيَّنَ/ زانـرا. ناسـرا. ئاشکرابوو. تێیگەیشت.

تَعَـرَّفَ الـضالّة: بحـث عنهـا/ بـە شوێن ونبوودا گەڕا.

تَعَرُّف. تمييز. إدراك/ ناسینەوە. جیاکردنەوە.

تَعَـرُّف بِـشَخص: حُصُول المَعرِفَة. تَعـارُف/ ناسـین. یەکتری ناسین.

تَعرِفَة: تعريفة. بيان أو قائمة الأسعار/ نرخ دانان. لیستەی نرخ.

تَعَرَّقَ: تَرَشَّحَ العـرق مـن الجـسم/ ئارەقی کردەوە. ئارەقی دەردا.

تَعَـرَّقَ: تَأَصَّـلَ. إمتـدت العُـروق في الارض/ ڕەگـی داکوتا. بنجی داکوتا.

تَعَرَّقَ الخَمرُ: مزجهـا بمـاء قليل/ ڕوونی کردەوە. ئاوی تێکرد.

تَعَـرَّقَ العَظـمَ: أخـذ ماعليـه مـن اللحـم بأسـنانه/ کڕانیەوە. ئێسقانی کڕانەوە.

تَعَرُّق: تَرَشُّح العـرق مـن الجـسم/ ئارەقکردنەوە. ئارەقدەردان.

تَعَرُّق: إتجاه الالياف والعروق في خشب او صخر او جلـد/ شـێوەی ڕەگ و دەمـاری دار و بـەرد و پێست.

تَعَرقَـلَ الامـرُ: تَـصَعَّبَ وتَـشَوَّشَ/ کـار ئـاڵۆزاو گیروگرفتی تێکەوت. گران بوو. تێکچوو.

تَعريب: ترجمة الى اللغة العربية/ گۆڕین بۆ زمانی عەرەبی.

تَعريب: جَعل الـشيء عَرَبِيـاً/ کردن بـە عـەرەب. بە عەرەبی.

تَعرِيَة: تجريـد. تَـشليح/ ڕووتکردنـەوە. جل پێ داکەندن. داماڵین. پاکردنەوە.

تَعرِيَـة: حَـتّ. تَآكُـل. تَفَتُّـت/ داڕمـان. داخـوران. داماڵین. داڕوتان. ڕووتانەوە. هەڵوەرین.

تَعرِيَة: حِرمان/ بێبەشکردن.

تَعريج: لَيّ. جعل الشيء مُتَعَرِّجاً/ پێچ پێچ کردن. خوارکردنەوە. هەرزاڵ.

تَعـريج: علـى مكـان او شـخص/ إفتقـاد. زِيـارة/ سەرلێدان. چوون. ئامشۆکردن.

تَعرِيشَة: مَظَلّة/ کەپر. چارداخ. سابات. چارۆکە. هەرزاڵ.

تَعريض: توسيع/ پانکردنەوە. فراوانکردنەوە.

تعريض: الماع. تلميح/ هێمابۆکردن. ناوهێنان.

تَعـريض للخطـر: إيقـاع في خطـر/ خـستنە مەترسیەوە. داوێژانەوە.

تعـريض لـ. جَعـل الـشيء عُرضَـةً او مُعَـرَّض لـ/ هەڵخستن. پیاگرتن.

تعريض لأشعة الشمس: تشميس/ خستنه بەرخۆر. هەڵخستن.

تعريف: تحديد. وَصف. بيان/ باسكردن. لێدوان. ڕوونكردنەوە. دياريكردن.

تعريف: إخبار. إعلام/ ڕاگەياندن. ئاگاداركردنەوە. پێوتن. تێگەياندن.

تعريف شخص بآخر/ پێناسين. ناساندن. بەيەكناساندن.

أداة التعريف: ألـ/ كە. ئامرازی ناسين. پێناسە.

تعريفة: تُعرِفَة. بيان او قائمة الأسعار/ ليستەی نرخ.

تعزّى: تَصَبَّرَ وتَسَلَّى/ سەبووری هاتەوە. هێمن بووەوە. دڵنەوابوو. حەوايەوە.

تعزّز: إشتدَّ وصَلُبَ/ جێربووەوە. ڕەق بوو.

تعزّز: صار عزيزاً/ زياتر خۆشەويست بوو.

تعزّز به: تَشَرّفَ/ پێی گەورە بوو. سەری پێ بەرزبووەوە.

تعزّز: صار قوياً. تَقَوّى/ بەهێز بوو. قايم بوو. پتەو بوو. جێگير بوو.

تعزِيَة: مواسات. تأسِيَة/ پرسە. سەرەخۆشی كردن. دڵدانەوە.

قَدَّمَ تعازِيَهُ إلى: عَزّى/ سەرەخۆشی لێكرد. چوو بە پرسيەوە. دڵی دايەوە.

تعزير: توبيخ. زجر. تعنيف. لوم/ سەرزەنشت. پياهەڵشاخان. گلەيی. تانوت.

تعزيز: تقوية. تثبيت. تمكين/ بەهێزكردن. پاڵپشت دان.

تعزيم: تعويذ. طرد الارواح الشريرة بالرُّقى/ نوشتە و دوعاكردن. چاوەزار دانان.

تعس: تعِسَ. كان تعيساً. شقي/ (بەدبەخت. كلۆڵ. كەسا. خاكسار. بەڵەنگاز. خەمبار) بوو.

تعس: تعِسَ: هَلَكَ/ فەوتا. نەما. باری كەوت. تێشكا. (كەساس. كلۆڵ. خەمبار) بوو.

تعس: انتعس. اشقى/ (كەساس. كلۆڵ. بارگران. خاكسار. بەڵەنگاز. خەمبار)ی كرد.

تَعس. تَعس. تعاسَة. شَقاء. بؤس/ بەدبەختی. كلۆڵی. كەساسی. خاكساری. بەڵەنگازی.

تَعِس: تعيس. شقي/ بەدبەخت. كلۆڵ. كەساس. خاكسار. بەڵەنگاز. ڕۆژ ڕەش.

تعساً له: وَيل له/ بەڵای لێدا.

تَعَسّرَ عليه الأمرُ: إستعسَرَ. إشتدَّ والتَوَى/ كارەكەی لێ گران بوو. گیروگرفتی تێكەوت.

تَعَسُّر: صُعوبَة. مُشكِلَة. مُعضِلَة/ دروستبوونی گیروگرفت. پەيابوونی كۆسپ و ناڕەحەتی.

تَعَسَّفَ. عَسَفَ.

تَعَسُّف: إستبداد. ظُلم/ زۆرداری. ناڕەزايی. جەور و ستەم.

تَعَسُّفي: جائر. ظالم/ زۆردار.

تَعَشّى: اكل او تناول العَشاء/ ژەمی ئێوارەی خوارد.

تَعَشّقَ: عَشِقَ. تَعَلق به قَلبُهُ. أغرِمَ به. احَبَّ/ خۆشی ويست. حەزی لێكرد. دڵی پياچوو.

تَعَشّقَت التروس: تَركَّبَت الروس. إشتبكت/ دەنەكانی چوو بە ناو يەكدا.

تَعَشُّق: عِشق. غرام. حُب/ خۆشەويستی. دڵداری. حەزلێكردن.

تَعَشُّق. تعشيق التروس: شَبك/ چوون بە ناويەكدا. ئاڵۆزكان. تێك گيران.

تَعَصّى: إستعصى. عَصَى. خَرَجَ عَن الطاعَة/ ياخی بوو. بەلەسە بوو. بەرهەڵستی كردن

تَعَصّبَ: اتى بالعَصَبِيَة/ تووڕە بوو. ڕقی هەڵسا.

تَعَصَّبَ شَدَّ العِصابَةَ/ سەرپێچی بەست. سەری بەست.

تَعَصَّبَ صارَ سَيِّداً/ گەورە بوو. خۆی گەورە کرد. رێزی لە خۆی نا.

تَعَصَّبَ بالشيء: رَضِيَ بِهِ/ قایل بوو. ویستی.

تَعَصَّبَ علیه: قاوَمَهُ/ بەرهەڵستی کرد. ناقایل بوو.

تَعَصَّبَ في دینه وَمَذهَبه: كانَ غَيوراً فيهما/ دەمارگیر بوو. توندوتیژ بوو. تیرەگەر بوو.

تَعَصَّبَ لَه ومَعَهُ: تَحَيَّزَ. مالَ/ لایەنی گرت. پشتگیری کرد.

تَعَصُّب: تَعَصُّب. حَماس. غيرة/ پەرۆشی. پەرۆش بوون.

تَعَصُّب: عدم قبول الحق مع ظهور الدليل/ دەمارگیری. خۆپەرستی. ناقایلی. قیرسچەمیەتی.

تَعَصَّرَ: إنعَصَرَ/ گوشرا. پەسترا.

تصیر: تحدیث. عَصرَنَة/ نوێکردنەوە. نوێکاری.

تَعَضَّلَ الداءُ الأطباءَ: أعضَلَ. أعياهُم/ دەردەکە پزیشکی هیلاك کرد.

تَعَطَّى: إستعطى. سالَ العَطاء/ سوالی کرد. داوای کرد. دەرۆزەی کرد.

تَعَطَّرَ: تَطَيَّبَ/ بۆنی خۆش بوو. خۆی بۆنخۆش کرد.

تَعَطَّرَت البنتُ: لم تتزوج/ شووی نەکرد. بە کچی مایەوە.

تَعَطَّشَ الی: تاقَ. إشتاقَ الی/ ئارەزووی کرد. تامەزرۆی بوو. بیری کرد.

تَعَطُّش الی: تَوَقان. إشتياق. حَنين/ ئارەزووکردن. تامەزرۆبوون. حەزکردن. بیرکردن.

تَعَطَّفَ: تَلَطَّفَ. تنازَلَ. تَفَضَّلَ/ دڵی نەرم بوو. دڵی پێ سوتا. بەزەیی پیاهاتەوە.

تَعَطَّفَ علی: عَطَفَ علی. رَقَّ قَلبُهُ. حَنَّ/ دڵی نەرم بوو. دڵی پێ سوتا. بەزەیی پیاهاتەوە.

تَعَطَّفَ: إنعطفَ: إنحنى ومالَ/ خواربووەوە. نوشتایەوە. چەمایەوە. پێچی کردەوە.

تَعَطَّفَ الثوبَ وبالثوب: إرتداه بِهِ/ لەبەری کرد. لەخۆیەوە پێچا. خۆی پێ داپۆشی.

تَعَطَّلَ عن العمل: بَقِيَ بلا عمل/ بێ ئیش و بێ کار دانیشت. لەکارکەوت.

تَعَطَّلت الآلةُ: فَسَدَت/ ئامێرکە پەکی کەوت. لەکارکەوت. خراپ بوو. وەستا.

تَعَطَّلت المدرسةُ: تَوَقَّفَت/ قوتابخانە کەوتە پشووەوە.

تَعَطُّل عن العمل: بقاء بلا عمل. بَطالَة/ بێ ئیشی.

تَعَطُّل الآلة: حدوث عَطَل. تَوَقُّف/ خراپبوون. پەککەوتن. لەکارکەوتن. وەستان.

تَعَطُّن الجلدُ أو الكتّانُ: تَفَسَّخَ واسترخى/ خۆشە بوو. خوسایەوە. نەرم بووەوە.

تعطيل الآلة: توقف عن العمل/ لەکارکەوتن. خراپ بوون. پەککەوتن. وەستان.

تعطيل المدرسة: توقف الدراسة/ پشووی قوتابخانە.

تعطين الجلدان الكتّان: تَفَسُّخ واسترخاء وتَقَع/ خووساندن. خۆشەکردن.

تَعَظَّمَ: تَجَلَّلَ. تَبَجَّلَ/ رێزی لێ نرا. گەورە کرا.

تَعَظَّمَ: تعاظم: تَكَبَّرَ/ خۆی زل کرد. خۆی بە گەورە دانا. گەورەییەتی نواند. لووتی بەرزکردەوە.

تَعَظَّمَ: تَحَوَّلَ الی عظم/ رەق بوو. بوو بە ئێسقان.

خَبطَ عَشواء: جُزافاً/ کوێرانە. بێ سەروبن. کۆترە. بە ڕێکەوت.

یَخبُطُ خَبطَ عَشواء: یتصرف في الأمور علی غیر بصیرة/ کوێرانە کردەوە ئەکا.

خَبطَـة: ضَـربَة. طَرقَـة. قَرعَـة. دَقَّـة/ لێدان. پیاکێشان.

خَبطَةً بِخَبطَةٍ: واحِدَةً بواحِدَة/ یەك بە یەك. داش بە داش. سەربەسەر.

خَبَلَ. خَبَّلَ: سَلَبَ العَقلَ. جَنَّنَ/ شێتی کرد. هۆش و بیری نەهێشت. کەللەیی کرد. تێکی دا.

خَبِلَ: إختَلَّ عَقلُهُ. أصابَهُ الجنون/ شێت بوو. هۆش و بیری نەما. کەللەیی بوو. تێکچوو.

خَبَل. خَبل. خُبل: جُنون/ شێتی. شێتبوون.

خَبَل. خَبل. خُبل: إرتِباك/ شڵەژان. شپرزەبوون. سەرلێتێکچوون.

خَبِـل: مَخبـول. مجنـون/ شێت. وێت. کەللەیی. تێکچوو.

خَبُو. خُبُو: خُمود. هُمُود/ دامرکانەوە. نیشتنەوە. کوژانەوە.

خَبء. خَبیئة. ماخُبِیء/ شتی شاراوە.

خَبیـث: شِـرّیر. مـاکِر/ دەروون و ڕەش. بەد. مارس. گومڕا. چەپەڵ. دەگریس.

خَبیـث: مـؤذٍ/ بەزیان. زیانبەخش. وەزەنـدار. خراپەکار. زیانەخەر.

خَبیث: نَجِس/ کڵاو. بۆگەن. ناشو.

خَبیث: مرض خبیث. صِفَة لمرض أو لِوَرَم/ دەرد و برینی خراپ. نەخۆشی خراپ.

خبیث الرائحة: نَتِن/ بۆگەن.

خَبیر: أهل خِبرَة. مُختَبِر. مُجَرّب/ پسپۆڕ. کارامە. تێگەیشتوو. شـارەزا. قـاڵ. خـاراو. خـاوەن ئەزموون.

خَـبیر بـالأمر: عـالم بـه/ زانیـار. تێگـەییو. هەواڵزان. لە شتەکە تێگەیشتووە.

خَبیز: مخبوز. خُبز/ نان.

خَبیزة: خُباز. نبات/ تۆڵەکە.

خَتّار. غَدّار. خائن/ ناپاك.

خَتّال: مُخاتِل. مُنافِق. مُخادِع/ فێڵباز. تەڵەکەباز. فێڵاوی. ناپاك.

خِتام: شمع أحمر. شمع یُختَم به/ لۆك. مێوی لۆك.

خِتام: خاتِمَة. نِهایَة. آخر/ کۆتایی. دوایی هاتن. ئەنجام.

خِتامـاً. في الخِتـام: أخـیراً/ لـە کۆتاییـدا. لـە ئەنجامدا.

خِتامي نِهائي. أخیر/ کۆتایی هاتوو. کۆتاییەکەی. دواییەکەی.

جَلسَة خِتامِیَة/ دواکۆبوونەوە.

خِتـان. خِتانَـة: خَـتن. طُهُـور. قطـع القُلفَـة/ خەتەنەکردن. سونەتکردن. چوك بڕین.

حَفلَة خِتان: حفلة طُهور/ خەتەنەسووران.

خَتّان: الذي یَختُن/ چوك بڕ. ئەو کەسەی خەتەنە ئەکا.

خَتَرَ: غَدَرَبِـ. خانَ/ ناپاکی لەگەڵ کرد. ساختەی کرد. خیانەتی کرد. غەدری لێکرد.

خَتر: غَدر. خِیانَة/ ناپاکی. خیانەت. غەدر.

خَتَلَ: خَدَعَ/ فێڵی کرد. گزی کرد. ساختەی کرد.

خَتل: خِداع. نِفاق/ (فێڵ. گزی. ساختە) کردن. تەڵەکەبازی. دووڕوویی.

خَـتَمَ: إختَـتَمَ. انهی. أتَـمَّ/ تـەواوی کـرد. کۆتـایی پێهێنا.

خَـتَمَ: سَـدَّ/ دایخـست. سـەرەکەی (داخـست. نایەوە).

خَتَمَ: مَهَرَ. وَضَعَ الخَتمَ. طَبَعَ بالخاتم/ مۆری کرد. مۆری لێدا.

خَتَمَ الجرحُ: إندَمَلَ/ برین سارێژبووەوە. چاکبووەوە. دەمەکەی هاتەوەیەك.

خَتَمَ الكتابَ: قَرَأَهُ كُلَّهُ/ هەمووی خوێندەوە.

خَتَمَ بالشمعِ أو الرصاص: وضع الشمع أو الرصاص/ لۆکی کرد.

خَتم. وَضع الخَتم. مَهر/ مۆرکردن. مۆرلێدان.

خَتم: سَدّ/ داخستن. سەرنانەوە.

خَتم: إنهاء. إتمام. إختتام/ تەواوکردن. کۆتایی پێهێنان.

خَتم: خاتم. مايُختَم بە/ مۆر. لۆك. مێوی لۆك.

خَتم: تاريخ/ بەروار. ڕۆژوکات.

خَتم: بَصمَة الخَتم/ پەنجەمۆر. شەقڵ.

خَتمَة: خَتمِيَّة: نبات زينة/ گوڵە مێرۆ.

خَتَنَ الصَبيَّ: قطع قُلفَتَهُ. طَهَّرَهُ/ خەتەنەی کرد. سونەتی کرد. چوکی بڕی.

خَتَنَ الشيءَ: قَطَعَهُ/ بڕی. قرتانی. پارچەی لێکردەوە.

خَتن: خِتان. طُهور/ خەتەنەکردن. سونەتکردن. چوکبڕین.

خَتَنَة: حَماة. أم الزوجة/ خەسوو.

خَتين: مَختون. مُطَهَّر/ خەتەنەکراو. سونەتکراو.

خُثار. خُثارَة: حُثالَة. بَقِيَّة/ تلپە. نیشتوو. پاشماوە. خڵتە.

خُثارَة اللَبَن: مايَبقى من غليظ اللَبَن/ دۆرك.

خَثَرَ. خَثُرَ. خَثِرَ: تَخَثَّرَ. ثَخُنَ. كَثُفَ/ مەیی. خەستبووەوە. توندبووەوە.

خَثَّرَ. رَوَّبَ. عَقَّدَ/ مەیانی. کردی بە ماستێ. خەستی کردەوە.

خَثرَة: تَخَثُّرُ دَمٍ في الاوعيَة. جُلطَة دَم/ خوێن مەیین. دروستبوونی کلۆ خوێن لە بۆری خوێندا.

خَثلَة. خَثَلَة: مابينَ السُرَّة والعانَة. مَربِض/ دامێنی سك. خوار ناوك.

خَثلي. خَثَلي: مَربِضي/ ورگ داکەوتوو. سك شۆڕ.

خَجِلَ من: إستحى/ شەرمی کرد. شەرمی لێکرد.

خَجِلَ: إحمَرَّ خَجَلاً/ تەریق بووەوە. شەرم گرتی. شەرمەزار بوو. لە شەرمانا سووربووەوە.

خَجَّلَ: أخجَلَ. جَعَلَهُ يَخجَل/ تەریقی کردەوە. شەرمەزاری کرد.

خَجَل: حَياء/ شەرم. ڕوونەهاتن. ڕووزەردی. نەدی.

خَجِل. خَجلان. مُضطَرِب من الحياء/ شەرمەزار. تەریق. لە ڕوودا داماو.

خَجول: مُستَحٍ. كثير الحياء. حَيِيٌّ/ شەرمن. کەم ڕوو.

خَدَّ الأرضَ وفي الأرضِ: جَعَلَ فيها أخدوداً/ کەندەکی لێدا. چاڵی درێژی هەڵکەن.

خَدَّ الجلدُ: تَغَضَّنَ. تَكَرَّشَ/ پێست کرژ بوو. لۆچ بوو.

خَدَّ فيه الضَربُ: أثَّرَ/ شوێن لێدان شین بووەوە. هێڵی تێبوو.

خَدّ: أخدود. الحفرة المستطيلة/ کەندەك. خەندەق. چاڵی درێژ.

خَدّ: وَجنَة. صَفحَة. صدغ/ ڕوومەت. گۆنا. دیم.

خِداج: كل نقصان في الشيء/ هەموو ناتەواویەك. هەموو شتێکی ناتەواو. پێنەگەییو. نابەکام.

خِداج: وِلادَة قبل الأوان/ منداڵ بوون پێش کاتی خۆی. بە ناتەواوی. بە نابەکام.

خِداج: إجهاض/ لەبارچوون. بەرفڕێدان.

خَدّاع: مُخادِع. نَصّاب. دَجّال. غَشّاش/ فێلباز. تەڵەکەباز. دەستبڕ. گزیکەر. ساختەچی.

خِداع. خَدیعَة. غِش. نَصب/ (فێڵ. گزی) کردن. هەڵخەڵەتاندن. فریودان. دەستبڕین. دووڕوویی. لەخشتەبردن. ئاین و ئۆین.

خَدّام.. خادِم/ خزمەتکار. زێوان.

خَدّامَة.. خادِمَة/ کارەکەر. واتە ژنی کارەکەر لەماڵاندا.

خَدّة: أخدود. مسلك الماء الجاري/ کەندڕ. خەرەندە. کەندال. ئاوبڕ. کەندەڵ. ئاوبڕکە. ڕەندۆڵ.

خَدَّدَ لحمُهُ: هُزِلَ فَتَشَنَّجَ/ لەڕ بوو. لاواز بوو. پێست و گۆشتی چرچ بوو. کرژ بوو.

خَدَّرَ بالمكان أو مع أهله: أقام فيه ومعهم/ لەگەڵ کەسوکاری دانیشت.

خَدَّرَ. خَدَّرَ البنتَ: ألزمها الخِدر/ ماڵی بۆ جیاکردەوە.

خَدِرَ العُضوَ: أصابَهُ الخَدَر. نَمِلَ/ سڕبوو.

خَدَّرَ العُضوَ: جَعَلَهُ خَدِراً. بَنَّجَ. أفقده الحِس/ سڕی کرد. بەنجی کرد.

خَدَر: فُقدان الحِسّ. نَمَل. تَشَنُّج يُصيب العضو/ سڕبوون.

خَدَر: الفُتور والكَسَل/ لەش قورس بوون. لەش ساردی. داهێزران.

خَدِر: مُصاب بالخَدَر. مُخَدَّر. نَمِل/ سڕ.

خِدر: أجَمَة الأسد/ لانەی شێر.

خِدر: ظُلمة/ تاریکی. تاریکایی.

خِدر: سِتر. مَلجأ. مأوى. ملاذ/ پەنا. لانە. شوێنی خۆ شاردنەوە.

خِدر المرأة: مَخدَع أو غُرفة سَيِّدَة الدار/ ژووری تایبەتی ئافرەت.

خَدَش. خَدَّشَ: خَمَشَ/ ڕووشانی. چنگی لێدا.

خَدَشَ السُمعَة: عابَها/ ناوی زڕان. ئابڕووی برد. شەرمەزاری کرد.

خَدّش: تخديش/ ڕووشاندن. ڕووکاندن. چنگ لێدان.

خَدش: خَمش. أثر الخَدش/ ڕووشاو. ڕووشاوی. شوێن چنگ.

خَدَعَ: خَتَل. إحتالَ على. غَشَّ/ فێڵی کرد. گزی کرد. ساختەی کرد.

خُدعَة: خِداع. مايُخدَع به. مَكر. حيلَة/ فێڵ. کەڵەک. ئاین و ئۆین. ساختە.

خُدعَة. خَدّاع. نَصّاب. دَجّال/ فێڵباز. تەڵەکەباز. دەستبڕ. گزیکەر. ساختەچی.

خَدَمَ: عَمِل له. قام على خِدمَته/ ئیشی بۆ کرد. خزمەتی کرد. ئیشکەری بوو. کاری بۆ ئەنجامدا. یارمەتی دا.

خَدَمَ الأرضَ: حَرَثَ. زَرَعَ/ زەوی کێڵا. کشتوکاڵی تیاکرد. خزمەتی کرد.

خِدمَة: شُغل. عَمَل/ کار. ئیش. کارکردن. ئیشکردن. کارئەنجامدان.

خِدمَة: مُساعَدَة/ یارمەتیدان. ڕاژە. خزمەتکردن.

خِدمَة الأرض: فِلاحَتُها/ زەوی کێڵان. کشتوکاڵ کردن. تۆوکردن.

في خِدمتك: تحت أمرِكَ/ لە خزمەتتاین.

أدّى أو أسدَى له خدمة. قَدَّم له معروفاً/ ئیشی بۆ کرد. چاکەیەکی لەگەڵ کرد. کارێکی بۆ هەڵسووڕان.

خَدَم: خُدّام. جُملَة الخَدَم/ ئیشکەران. نۆکەر و کارەکەران. دەستوپێوەند.

خِدن: خَدين. صَديق. صاحِب/ هاوڕێ. برادەر. ئاوەڵ. هاوەڵ.

خَلوج: مَولود قبل الأوان. نـاقِص الخَلق/ ناتـەواو. نابەکام. ناکام. فەریك. پێش کات لە دایك بووە.

خَلوع: خَدّاع. مُخادِع/ فێڵباز. تەڵەکەباز. دەستپی گزی کەر. ساختەچی.

خَليج .. خَلوج/ نابەکام.

خَليعَة: خِداع/ (فێڵ. گزی) کردن. هەڵخەڵەتاندن. فریودان. دەستپڕین.

خَليعَة: خُدعَة. حيلَة/ فێڵ. کەڵەك. ئاین و ئۆین. ساختە.

خَليم/ خزمەتکار.

خَلِن/ کەنەڵاَن.

خَـذأ. خَـذِيءَ: إسـتَخذى. إسـتَخذا. خَـضَعَ وانقـاد/ سەری شۆڕکرد. ملی دا. قایل بوو. تاو بوو.

خُذامَة: قِطعَة من الشيء. جُزء/ پارچە. کەرت.

خُذروف: لُعبَة للأطفال/ مزراح.

خَـذَفَ: قَـذَفَ. رَمـى الحصاة بالأصبع أو المقلاع/ هاویـشتی. بـەردی هاویـشت. بـە پەلەپێکـە و قۆچەقانی و داو و لاستیك بەردی هاویشت.

خَذَلَ .. خاذِل/ رسوابوون، رسواکار.

خَـذَلَ. خَـذلان. خِـذلان. هَجـر. هِجـران. تـرك/ وازهێنان. دەستهەڵگرتن.

خَرَّ الماءُ: صَوَّتَ/ ئاو خوڕەی هات. هاژەی هات.

خَرَّ النائِمُ: غَطَّ. شَخَرَ/ پرخانی. پرخەی هات.

خَرَّ: سَقَطَ من عُلوٍ الى أسفل. إنهار/ کەوتـە خوارێ. ڕووخا. ڕما. هاڕەی کرد.

خَرَّ: ماتَ/ مرد. هات بەلادا.

خَـرَّ تَحتَ قَدَمَيـه: رَمـى بِنَفـسه/ خۆی دا بـە سـەر قاچیا.

خضرَّ ساجداً. إنکب على الارض. رَكَعَ/ کڕنووشـی برد.

خَـرِيءَ: تَغَـوَّطَ/ گـووی کـرد. سـکی دەرچـوو. پیسایی کرد.

خُرء. خَراء: غائط/ گوو. پیسایی.

خَـراب: دَمـار/ ڕووخـان. وێرانبـوون. ڕمـان. کاولبوون.

خَـراج: خِـراج: خَـرج. ضـريبَة/ بـاج. بـاجی دەستکەوت. باجی خانوویـەرە. دەستکەوتانە. زەویانە.

خَراج: خُـراج. خُراجَة. خُرّاجَـة: دُمّل/ دوومەڵ. پوورگ. ئارینج.

خَرّار: ماء کَثيرِ الخرير/ ئاوی خوڕ. ئاو خوڕەی دێ.

خَـرّار: نـائم کـثير الخريـر/ نوسـتوی پرخەکەر. ئەپرخێنێ.

خضرارة: خُذروف. لعبة للأطفال/ مزراح.

خَـرّاس: صـانع وبـائع الخُـرُوس أو الجِـرار/ گلێنـە فرۆش. گۆزە و دیزەکەر. گڵکار.

خُراضَة: بُرادَة. نُحاتَة. ماسقط من الشيء عندَ الحَتّ أو البَري/ خاکە. تەڵاش. وردە. وەریو.

خَرّاص: کَذّاب. مُفتَري/ درۆزن. بوختانکەر.

خَرّاط: مُشتَغِل في الخراطة/ تۆڕنەچی. خەرات.

خِراطَـة: خَـرط. عمـل الخـرّاط/ تۆڕنەچیێتی. خەراتی.

خَرّاط: کَذّاب/ درۆزن.

خَراطين: خَرطون. ديـدان الأرض/ کرمـی زەوی. گڵ خۆرکە.

خِراعَة. ذِراعَة/ دەموڵ.

خُرافَـة: إعتِقـاد سَـخيف. خُزعبَلَـة/ پڕوپـووچ. باوەڕی پڕوپووچ.

خُرافَة: أسطورة خيالية/ ئەفسانە.

خُرافَـة: خُـرق. حَماقَـة. ضِـد بَراعَـة/ گـەوجی. گێلێتی.

خَرّامَة: مِثقَب/ کونکەر. سمۆ. دریێل.

خَرِبَ. خَرِبَك هَدَمَ/ ڕووخـا. تێکچوو. وێران بـوو. کاول بوو.

خَرِب: مُخَرَّب. مُدَمَّر. مُحَطَّم/ ڕووخاو. وێران. کاول. ڕماو.

خَرب. خُرب. خُربَة: ثُقب الإبرة/ کونی دەرزی.

خَرِبَة. خِربَة: موضع الخراب/ کەلاوە. وێرانە.

خَربَق: نبات طبي/ خەریەند.

خَرَتَ: ثَقَبَ/ کونی کرد. سمی.

خَرت. خُرت: ثُقب. ثُقب/ کون. کونی دەرزی.

خُرتیت: حَیوان. کرکدن/ کەرکەدەن.

خَـرَجَ: بَـرَزَ. طَلَـعَ/ دەرکـەوت. دەرھـات. سـەری دەرھێنا. ھاتەدەرێ. بەرزبووەوە. دەرپەڕی.

خَرَجَ بنتیجة: إستَنتَج. إکتَشَفَ/ بۆی دەرکەوت. گەیشتە ئەوەی.لێی تێگەیی. دۆزیەوە.

خَـرَجَ بـه: أخرَجَـهُ/ دەری کـرد. کردیـە دەرێ. دەریپەڕان.

خَرَجَ: ضد دَخَلَ/ دەرچوو. چووە دەرەوە.

خَـرَجَ علـی: تَمَـرَّدَ علـی. ثـار علـی/ یـاخی بـوو. سەرپێچی کرد.

خَـرَجَ علـی: بَـرَزَ لقتالـه. هـاجَمَ/ بۆی دەرپـەڕی. پەلاماری دا. هێرشی برد.

خَرَجَ علی أو عن. خـالَفَ. عـارَضَ/ سەرپێچی کرد. ملی نەدا. ناڕەزایی دەربڕی. بەلەسە بوو.

خَرَجَ علی أو عن: إنشَقَّ عن. إنفصل/ جیابووەوە.

خَرَجَ عن: صدَّ عن. إنحرف عن/ لایدا.

خَرَجَ من دَینه: قَضاه/ قەرزی لانەما. دایەوە.

خَرَّجَ.. أخرَجَ/ دەرچوو. دەربازی کرد.

خَرَّجَ: مَنَح شهادة التخرج/ دەرچوان. بڕوانامەی دەرچوونی پێدا.

خَـرَجَ الأرضَ: وضـع الخَـراج/ بـاجی خستە سـەر. باجی لەسەر دانا. زەویانەی دانا.

خَرَّجَ: دَرَّبَ. عَلَّمَ/ فێری کرد. مەشقی پێکرد.

خَرَّجَ: استخرج. سَحَبَ. إستَخلَصَ/ دەریهێنا. لێی گرت. پوختەی گرت.

خَرج. خُراج: ضَریبَة/ باج. زەویانە. سەرانە.

خَرج: مَصروف/ خەرجی. پێویستی.

خَـرج: حـصیلة. نِتـاج. مَـردود/ بەرھـەم. بـەر. ئەنجام.

خَرج لِلابس النِساء: کشکش/ دوگمە و قەیتان.

خُرج: کیس/ تووەرەکە. خەرار. گونیە. جەوال.

خَرجَة: خُرُوج/ دەرچوون. چوونە دەرەوە.

خَرجَة: بُرُوز/ دەرپەڕیوی. دەرپۆقیو. قۆقز.

خَرخَرَ النائم: غَطَّ. شَخَرَ/ پرخاندی. پرخەی هات.

خَرخَرَ الماءُ: صَوَّتَ/ ئاو خوڕەی هات.

خَرخَرَة: غَطیط النائم. شَخیر/ پرخە. پرخەپرخ. پرخاندن.

خَرخَرَة: صوت الماء/ خوڕەی ئاو. خوشەخوش.

خَرِدَ الرجل: طـال سکوته أو قـلَّ کلامـه/ بێـدەنگ و کەمدوو بوو.

خَرِدَت الفتاةُ: کانت بکراً. بَقیَت عذراء/ کچ بوو. بە کچی مایەوە.

خُردَة: حدید قراضة/ ئاسنە شکاو. سکراب.

خَردَلَ اللحم: قَطعَهُ/ گۆشتی جنی. لەت و کوتی کرد.

خَردَل. خَردَلة: نبات/ خەرتەلە. گوڵەزەرد.

خَرَزَ: ثَقَبَ/ کونی کرد. سمی.

خَرَز (مفردها خَرَزَة): مایُنظَم في خیط/ مورو. مت و مووروو. لەپکە. زەنگیانە.

خَرَز: فُصوص من الحجارة/ نگێم.

خَرَزَة الظهر: فَقَرَة/ بڕبڕەی پشت.

خَرِسَ: بَکِمَ. صار أخرَس/ لاڵ بوو.

خَرِسَ: صَمَتَ. سَکَتَ/ بێدەنگ بوو.

خَرِسَ: إنعَقَدَ لِسانُهُ عَنِ الكلام/ زمانی بەسترا. لەقەی نەما.

خَرَس: بَكَم/ لاڵی.

خَرَس. خُرس: جَرَّة كَبيرة. دَنّ/ گلێنە. كوپە. مەركانە.

خَرساء: مؤنث أخرَس. أبكَم/ لاڵ. ئافرەتی لاڵ و بێدەنگ.

خَرَسانَة: إسمنت/ كۆنكریت. موسەلەح. ئاسن بەند.

خَرَش. خَرْش: خَدَش/ رووشا. رووشانی.

خَرَشَةُ الذُّباب: عَضَّة/ (مێش. مێشوولە) گەستی. پیاچزا. گازی لێگرت. رووشانی.

خُرَش: ذُباب/ مێش. مێشوولە.

خُرشَف. خُرشوف: نَبات/ كەرتەشی.

خَرَصَ: كَذَبَ/ درۆی كرد. درۆی بە دەمەوە هەڵبەست.

خَرَصَ: خَمَّنَ. حَزَرَ. قَدَّرَ/ قەبلاَنی. خەملاَنی. هەڵیسەنگان.

خُرص. خِرص: قُرطُ الأذن/ گوارە. ئەلقەی گوێ.

خَرَطَ: سَوّى بِالمِخرَطة/ تۆرنەی كرد. خەرتی كرد. لە تۆرنەی دا. خەراتی كرد.

خَرَطَك قَطَعَ/ بڕی. لێی كردەوە. داییماڵی.

خَرَطَ: فاخَر كَذِباً/ درۆی كرد. فیشاڵی لێدا. خۆی هەڵكێشا.

خَرط: خِراطَة/ تَسوية بِالمِخرَطة/ تۆرنەكردن. لە خەرت دان. خەرت كردن.

خُرطوش. خُرطوشَة: طَلقَة/ فیشەك.

خُرطوم الفيل: أنبوب ماء/ (بۆری. لاستیك. سۆندە)ی ئاو.

خُرطون: دودَةُ الأرض/ كرمی زەوی. گلێ خۆركە.

خَرَعَ. خَرِعَ: لانَتْ مَفاصِلُهُ. إسترخى. ضَعُفَ/ لەشی خاو بوو. بێهێز بوو. شل و شێواو بوو.

خَرِع: لَيِّنُ المَفاصِل. رَخو. ضَعيف/ لەش خاو. لاواز. شل و شێواو. شلەپەتێ.

خَرِفَ: خَرَفَ: فَسَدَ عقلُهُ مِنَ الكِبَر/ خەڵەفا. تێكچوو.

خَرَف: فَساد العَقل. هُتر/ خەڵەفان. خەرەفیان.

خَرِف: مُصاب بِالخَرَف. مُخَرِّف/ خەڵەفاو. خەرەفاو.

خَرفَشَ: خَلَطَ/ تێكەڵی كرد. دای بەسەر یەكدا.

خَرَقَ. خَرَّقَ. مَزَّقَ/ دڕانی. دڕی. شڕی كرد. شڕ و وڕی كرد.

خَرَقَ: إختَرَقَ. ثَقَبَ. مَرَّ فيه/ سمی. كونی كرد. كوناوەری كرد. بەناویا تێپەڕی.

خَرَقَ العادَةَ: خالَفَ. إنتَهَكَ. تَجاوَزَ/ لە سنووری نەریت و ئاسایی لایدا. پەتی پچڕێ. بەلەسە بوو. یاسای كۆمەڵایەتی خستە لاوە.

خَرَقَ الكَذِبَ: صَنَعَهُ/ درۆی كرد. درۆی هەڵبەست.

خَرُقَ: خَرِقَ: كانَ أخرَق. حَمِقَ/ بێكوێی كرد. (گێل. گەوج. سەپۆلە. گەمژە) بوو.

خَرَق. خُرق: حَماقَة. ضِد بَراعَة/ گێلێتی. گەوجی. گەمژەیی.

خَرِق: أخرَق. أحمَق/ گەوج. گەمژە. كەودەن. گێل. سەپۆلە. زلحۆرت.

خَرق: ثَقب. إختِراق/ كونكردن. تێپەڕین. سمین.

خَرق: ثَقب. ثُقب. فُرجَة. فَتحَة/ دەلاقە. كون.

خَرق: تَمزيق/ دڕاندن. دڕین. شڕكردن.

خَرق: مُخالَفَة. إنتِهاك. تَجاوز/ لە سنووری نەریت و ئاسایی لادان. سەرپێچی.

خَرق: مَزق. شَق/ دڕاوی.

خرقاء (مؤنث أخرق).. أخرق. أحمق/ گێلی کرد. کەری کرد.

خِرقة: مِزعة. قطعة من ثوب/ پارچە جل. سیپال. پەڕۆشڕ. چەپال. پڕزال.

خِرقة: ممسحة/ پەڕۆی سڕین.

خرَمَ. خرّم: ثقبَ/ کونی کرد. سمی.

خرم: تخریم. ثقب/ کونکردن. سمین.

خرم: ثقب. ثقب/ کون.

خرم: أنفُ الجبل. قمة الجبل/ لوتکەی شاخ.

خِرنق: صغیر الأرنب/ بەچکەی کەروێشک.

خرنوب. خرّوب: نبات/ خڕنووک.

خُـروج: بُـروز. نُشـوء/ دەرپـۆقین. دەرپـەڕین. هەڵتۆقیو.

خُروج: بُراز/ پیسایی.

خُروج جَماعي: مغادَرة جماعية/ کۆڕەو.

یـوم الخـروج: یـوم القیامـة/ ڕۆژی هەڵسانەوە. زیندووبوونەوە.

خَـروس: بِکـر. بِکرِیّـة. حامـل لأول مَـرّة/ نۆیـەرە. یەکەم سک.

خِروَع: ناعم/ نەرم. نەرم و شل.

خِروَع: نبات/ گەرچەک.

زیت الخِروَع/ ڕۆن گەرچەک.

خَرُوف: حَمَل. ضأن/ بەرخ. مەڕ.

خِرّیج: مُتخرّج/ دەرچوو.

خَرید. خَریدة. عَذراء. بِکر/ کچ. لاقەنەکراو. کون نەکراو.

خَریـدة: لؤلـؤ لم تُثقَـب/ مرواری بـێ کـون. کـن نەکراو.

خریر: صوت الماء/ خوڕەی ئاو.

خزیر: غطیط. شخیر/ پرخە. پرخەپرخ.

خریطة: خارطة. مُصَوّر جُغرافي/ نەخشە. خەریتە.

خریطة: وعاء من جلد أو غیره/ توورەکە. هەمانە. هۆر. دەفر.

خریـع: خَـرِع. رَخـو. ضـعیف/ شـلەپەتێ. شـل و شیاو.

خریف: وَصْل بین الصیف والشتاء/ پایز. خەزان.

خریفي: مختص والشتاء/ پایزی. خەزانی.

خزّ: وَخز. طَعَن. شَكَ/ پیاکرد. پیاچەقان.

خزّ: طَعن. وَخز. شَك/ پیاکردن. پیاچەقاندن.

خَزّ: حریر/ ئاوریشم.

خَزّ: حیوان ناعم الفرو/ دەلەک.

خَزِیَ: أخزى. أذلّ. أهان. أوقَعَـهُ في الخِـزي/ ڕسوای کـرد. سـووکی کـرد. ئـابڕوی بـرد. نـاوی زڕان. دەمزڵی لێکوتا.

خَـزِیَ: خِـزي. ذُل. هَـوان. عــار/ ڕسـوابوون. ئابڕووچوون.

خَزّاز: صانع وبائع الحریر/ ئاوریشم (دروستکەر. فرۆش).

خَـزّاف: فَخّـار. صـانع الخـزف/ گلێنـە کـار. گلکار. گلنەرمەوە.

خُزام. خُزامى. نبات ذكي الرائحة/ سمڵ. هەڵاڵە.

خَزّان: لسان/ زمان.

خـزّان: مكـان یُخـزّن فیـه المـاء/ ئەسـتێل. ئاوگـە. تانکی ئاو.

خــزّان.. خــازن/ خەزنەـدار. خـاوەن عـەمارو مەخزەن.

خِزانة: دولاب/ دۆلاب.

خِزانة الملابس/ کەمتۆر.

خِزانة الكتب/ مكتبة. کتێبخانە.

خِزانـة الدولـة: الخزینـة. بیـت المـال/ (خەزێنـە. گەنجینەی) دەوڵەت.

خِزانة حدید/ قاسە.

خَزَرَك نَظَر بمؤخر عَينه. نظر اليه شزراً/ لە لاتیرە سەیری کرد. چاوی لێ مۆڕکردەوە.

خَزَر: ضيّق العَين/ چاو بچوك. چاو کونە شووژن.

خُزَز: ذكر الأرانب/ نێرەی کەروێشك.

خَزرَة. خُزرة: ألم أسفل الظهر. ألم في الظهر/ ئێش و ئازاری پشت، دامێنی پشت.

خَزَعَ. خَزَعَ الشيء: قطعَهُ/ بڕی. کەرتی کرد.

خَزَعَ بينهم: قَسَمَ/ دابەشی کرد.

خُزعبل. خُزَعبل. خُزَعبَلة: أحاديث مستظرفة باطلة الفكاهة والمزاح/ قسەی (بێ سەر و پێ. پڕوپوچ). نوکتە و بۆ پێکەنین.

خَزَعَة: عَرَج/ شەلین.

خَزَعَل: عَرَج/ شەلی.

خُزَعل: ضبع/ کەمتیار.

خَزَف. خَزَفَة: فَخّار. ماعُمِل من الطين وشُوي بالنار/ گلێنە. گۆزەو دیزە.

خَزَفي: فَخّاري. صانع الخزف/ گلێنەکار. گلکار. کلێ نەرمەوە.

خَزَقَ: طَعَنَ/ پیاچەقان. پیاکرد.

خَزَلَ: قَطَعَ/ بڕی. پچڕی. قرتانی.

خَزَمَ: نَظَمَ. نَظّمَ/ هۆنیەوە. کردی بە پەتەوە.

خَزَمَ الأنف: جعل فيه الخزامة/ لووتەوانەی کردە لووتی.

خَزَم أنفهُ: أذلَّهُ/ لووتی شکان. لە لووتی دا. ڕسوای کرد.

خَزَنَ. خَزَنَ المال: إدّخر/ کۆیکردەوە. پاشەکەوتی کرد. پەسەندەی کرد.

خَزَنَ السرّ: كَتَمَهُ/ نهێنی شاردەوە. دەرینەبڕی.

خَزَنَ اللسان: مَنَعَهُ الكلام/ بێدەنگ بوو. زمانی بەست. نقەی لێوە نەهات.

خَزَنَ. خَزِنَ اللحمُ: إنتَنَ/ گۆشت بۆنی کرد. بۆگەنی کرد.

خَزَنَ للجرح: تَقَيَّحَ/ برین کێمی تێزا. زۆخی کرد.

خَزن: تخزين. حفظ/ عەمارکردن.

خَزن: تخزين. إخفاء وادّخار/ کۆکردنەوە. شاردنەوە. پەسەندەکردن.

خَزِيَ: ذلّ. هان/ سووك و ڕسوابوو. ئابڕووی چوو.

خَزِيَ من: إستحى من/ شەرمی کرد. شەرمی لێکرد. تەریق بووەوە.

خِزي: ذلّ. هَوان. عار/ ئابڕووچوون. ڕسوابوون.

خَزيان: خجلان/ تەریق. شەرم ئەکا.

خَزينَة: كَنز/ سامان. گەنج.

خَزينَة: مكان يُخزَن فيه/ گەنجینە. سامانگە.

خزينة الدولة: بيت المال/ (خەزێنە. گەنجینە)ی دەوڵەت.

خَسَّ: رَذُلَ. حَقُرَ/ ڕسوا بوو. سووك بوو. ئابڕووی چوو.

خَسَّ: نَقَصَ/ کەم بووەوە. کەمی کرد. کەمی هێنا.

خَسَّ: نَقّصَ/ کەمی کردەوە.

خَسّ: نبات/ کاهوو.

خَسَأَ: طَرَدَ. أبعَدَ/ دەریکرد. دووری خستەوە.

خَسَأَ. خَسِيءَ: بَعُدَ. إنزَجَرَ/ دوورخرایەوە. دوورکەوتەوە.

خَسَأَ البَصَرُ: كَلَّ وأعيا/ چاوکزیوو هیلاك بوو.

خَسئاً لك: إخسَ عليك/ ڕووت ڕەش بێت. شەرم ناکەی.

خَسئتَ: تَباً لكَ/ بەلات لێدا.

خَسارَة: ضد ربح. ضَرر. فقدان. تَلَف/ دۆڕاندن. لە کیس چوون. تێشان. زیانکردن. زیان پێگەیین. لەناوچوون.

یاخَسارَةَ: واحسرتاه. وأسفاه/ داخەکەم. داخم ناچێ. بەداخەوە.

خَساة. خِسّة: دَناءة. حقارة/ ڕسوایی. سووکی. بەدی.

خَسِرَ: فَقَدَ. ضَیَّعَ/ دۆڕانی. ونی کرد. لە دەستی چوو. تێیدا. زیانی کرد.

خَسِرَ: ضَلَّ. تَیَّهَ/ ون بوو. وێڵ بوو. ڕەهەند بوو.

خَسِرَ: هَلَكَ/ لەناوچوو. فەوتا.

خَسَّرَ: جَعَلَهُ یَخسَر/ پێی دۆڕان. لە کیسی دا. زیانی پێگەیان.

خَسَّرَ: أهلَكَ/ فەوتانی. لەناوی برد.

خَسَّرَهُ: أخذَ منه التَّعویض/ پێی بژارد.

خَسر. خُسر. خُسران: خسارَة/ دۆڕاندن. لە کیس چوون. تێدان. زیان پێگەیین. لەناوچوون.

خَسَّنَ: نَقَّصَ/ کەمی کردەوە.

خَسَفَ: أذَلَّ/ ڕسوای کرد. ئابڕووی برد.

خَسَفَ: هَبَطَ. غارَ/ تەپی. داتەپی. قوپا. چوو بە ناوا. ڕۆچوو.

خَسَفَ الشَّیءُ: نَقَصَ/ کەمبووەوە. لاواز بوو. پووکایەوە.

خَسَفَ. خُسِفَ في الأرض: غاب في الأرض/ چوو بە ناخی زەویدا.

خَسَفَ القَمَرُ. ذهب ضوءُه. إنحَجَبَ/ مانگ گیرا.

خَسَفَ هَزَلَ/ لاواز بوو. پووکایەوە.

خَسَفَ. إنخَسَفَت البئر: إنهدمت/ دڵڕووخا. پڕبووەوە.

خَسَفَت العینُ: عَمِیَت/ کوێر. چاو بە قووڵاچوو.

خَسف. خُسف: ذُلّ/ ڕسوایی. بێئابڕوویی. ترۆیی.

خَسف: نُقصان. نَقیصَة/ ناتەواوی. کەم و کووڕی.

خَسف: هُبوط/ قوپان. تەپین. ڕۆچوون. نەوین.

خَسف: ظُلم/ دڵڕووخان.

خَسفَة: البُقعة المُنخفِضة/ داتەپیو. ڕۆچوو. بەقووڵاچوو.

خُسوف القمر: إحتجابه/ مانگ گیران.

خُسوف کُلّي/ مانگ گیرانی خشت.

خُسوف جُزئي/ مانگ گیرانی ناتەواو.

خَسیس: دَنيء. حَقیر/ سووك. ڕسوا. ناپیاو. نامەرد. خوێڕی. بێبایەخ. نان تاڵ.

خَسیسَة: فَضیحة. عار. مُحتقرات الأمور/ ڕووداوی ناشیرین. شوورەیی. نەنگی.

خَسیف: عَینٌ خَسیفة: غائرة/ چاوی بە قووڵاچوو.

خَشَّ في: دَخَلَ/ تێی چوو. چووە ناوی.

خَشّی: خَوف/ ترسانی. تۆقانی.

خُشاء: العظم الناتيء خلف الأذن/ کرکراگە.

خُشارَة: فَضلَة/ پاشماوە.

خُشاف. خَشاف: فواکه منقوعة مُحلّي بالسكر/ خۆشاو. شەربەتی میوە.

خُشام: عظیم الأنف/ لووت زل. لووتە.

خُشانَة: خُشونَة/ زبری. ڕەقی. سەختی. دڕشت.

خَشَّبَ. حَوَّلَ الی خَشَب/ کردی بەدار. ڕەقی کرد.

خَشُبَ: تَخَشَّبَ صار صلباً کالخشب. تَجَمَّدَ/ ڕەق بوو. بوو بە دار.

خَشَب: ماشُقِّقَ من الشجر/ دار. تەختە.

خَشَبَة: قِطعَة خَشَب/ دار. بڕەدار.

خَشَبَة نَقل الموتی. نَعش/ دار تەرم. تابووت.

خَشَبَة المسرح: المسرح/ شانۆ.

خَشَبي: مِن الخشب. کالخشب/ دارین. لەدار. وەکدار. لە دار و دروستکراو.

خَشخَشَة: نبات/ خاشخاش.

خَشخَشَ: صَلَّ. خفخفَ. جَلجَلَ/ (ورشه. تەقە. فیشکە. خرنگە)ی هات.

خَشخَشَة: لُعبة للاطفال/ شەقشەقە.

خَشرَم: جماعَة النَحل/ پوورەی هەنگ. پلوورەی هەنگ.

خَشَعَ: خَضَعَ/ سەری شۆڕکرد. ملی کەچ کرد. خۆی دا بە دەستەوە.

خَشَعَ بَصَرُهُ او بِبَصَرِهِ: غَضَّهُ/ چاوی شۆڕکرد. چاوی داخست.

خَشعَة: أمّ تموت وفي بطنها ولد حَيّ/ پاش مەرگە.

خَشَعَ: ذَهَبَ في الارض وتَغَيَّبَ/ چوو بە ناخی زەویدا.

خَشَفَ في الشيء: دخل فيه/ پیاچوو. چووە ناوی.

خَشَفَ: مَشى في الليل/ بەشەو ڕۆیی.

خَشَف: إتَّسَعَ الأنفُ/لووت کراوە. لووت فش بوو.

خَشَمَ الأنفُ: تَغَيَّرَت رائحته/ لووت بۆگەنی کرد. بۆنی لێهات.

خَشم: خَيشوم. أنف/ لووت. کەپوو. لویت. بێڵ. کەپ. دم.

خَشُنَ: خلاف نَعِمَ. صار خشناً/ زبر بوو. سەخت بوو.

خَشَّنَ: جَعَلَهُ خشناً/ زبری کرد. سەختی کرد.

خَشِن: ضد ناعم/ زبر. ڕەق.

خَشِن: أجَش/ دڕشت.

خَشِنُ الطبع: فَظّ. شَرِس. وَقِح/ دڕ. ڕەق. وشک. بێنابڕوو. تڕۆ.

خُشوع: إحترام/ ڕێز. دەست بە سنگەوەگرتن. کوڕنوش بردن.

خُشوع: خُضوع/ سەرشۆڕکردن. ملکەچکردن. ملکەچی. قایلی.

خَشوف: مُتَحَرِّش. جِسْرِيّ/ خۆتی هەڵقوتێن.

خُشونَة: ضد نُعومة/ زبری. ڕەقی.

خُشونَة: فَظاظَة/ دڕی. بێنابڕوویی. تڕۆیی. پیاوی ڕەق و وشک و تڕۆ.

خُشونة في الصوت: بُحّة. جُشّة/ دەنگ گڕی. دەنگی گڕ و قەبە.

خَشيَ: خافَ/ ترسا. ترسی لێنیشت. تۆقی.

خَشي. خَشيان. خاشٍ. خائف/ ترساو. ئەترسی. ترسی هەیە.

خَشيَة: خوف/ ترس. ترسان. تۆقین.

خَشيَةَ أن: لئلاّ/ نەوەکو. مەبادا. نەبا.

خَشِن: خَشِن. فَظّ. شَرِس. وَقِح/ دڕ. ڕەق. وشک. تڕۆ. بێنابڕوو.

خَصَّ بالشيء: فَضَّلَهُ وافْرَدَهُ/ پەسەندی کرد. هەر ئەوی ویست.

خَصَّ بالودِّ: تَعَلَّقَ بِه. احَبَّهُ دون غيره/ دڵی پێداچوو. هەر ئەوی خۆشویست.

خَصَّ الشيءَ لنفسه: إختاره/ شتەکەی بۆ خۆی (ویست. دانا. هەڵبژارد).

خَصَّ: كان خاصاً. ضد عَمَّ/ بوو بە تایبەتی.

خَصَّ: إقتَصَرَ/ هەژارکەوت.

خَصَّهُ بِعنايَتِهِ: عَيَّنَهُ. حَدَّدَهُ/ دیاردی کرد. ئاماژەی کرد.

فيما يَخُصّ. فيما خَصَّ: فيما يَتَعَلَّق/ دەربارەی.

هذا لا يَخُصُّكَ: لايعنيك/ پەیوەندی نیە بە تۆوە.

خُصّ: كوخ. عُشّة/ قوڵخ. کوختە. کەپر.

خَصّ: ناقِص/ ناتەواو.

خَصَى: طَوَّشَ. جَعَلَهُ خصياً/ خەسانی. گونی دەرهێنا.

خُصَى (مفردها خُصيَة): بَيضَة/ گون. باتو. ڕتڵ.

خِصاء: خَصي، تَطويش/ خەساندن. گوندەرهێنان. یەختەکردن.

خَصاص: شَق. فُرجَة. فَتحَة/ درز. دەلاقە. کون. قلیش. کەلێن.

خَصاصَة: فَقر/ هەژاری. نەبوونی. نەداریی.

خِصام.. خُصومَة/ دژ. دژایەتی.

خَصَبَ. خَصِبَ: کانَ خَصیباً/ بە پیت بوو. بەپێز بوو.

خَصَّبَ: أخصَبَ. صَیَّرَهُ خَصیباً/ بە پیتی کرد. پەیینی تێکرد.

خَصِب. خَصیب. کَثیرُ الخَیر/ بە پیت. بەخێر. بەبرشت. بەپێز.

خِصب: خُصوبَة: کَثرَةُ الإنتاج/ بەرهەم زۆری. پیت. فەر. بژوێن. بوم.

خِصب: خُصوبَة: رَخاء. کَثیرُ الخَیر/ هەرزانی. خۆشی. شتومەکی زۆر.

خَصَرَ: بَرَدَ/ ساردی کرد.

خَصَر. بَرد/ سەرما.

خَصَر: التهاب جلدي یُسَبِّبُه البرد/ پێست قلیشان.

خَصر: لَسعَةُ الصقیع/ تەزین. سەرمابرد.

خَصِر: بارِد/ سارد.

خَصر: وسط الإنسان فوق الورك/ ناوقەد. کەمەر. پشتێنە.

دَقیقُ الخَصر/ ناوقەدباریک.

خَصَّ: أفرد. خَلَّدَ. عَیَّنَ/ دیاردی کرد.

خَصَّصَ: کَرَّسَ/ تەرخانی کرد.

خَصَّصَ: کَرَّسَ/ تەرخانی کرد.

خَصَّصَ. حَصَّصَ. وَزَّعَ حِصَص/ دابەشی کرد. کردی بە بەشبەش.

خَصل: عادَة. خُلق. سَجیَّة/ خوو. ڕەوشت.

خُصلَة: حِزمَة/ چەپک. قول.

خُصلَة: عُنقود/ هێشوو.

خُصلَةُ شَعر/ چنگێ قژ. پارچەیەک قژ.

خَصَمَ: خَصَمَ. إقتطع/ دایشکان. لێی دەرکرد. کەمی کردەوە.

خَصَمَ: غَلَبَ. تَغَلَّبَ علی/ زاڵ بوو. بردیەوە. بەزانی. دەستی خۆی وەشان.

خَصَمَ الثَمَنَ: حَطَّ/ لە نرخەکەی کەم کردەوە. دایشکان.

خَصم: غَریم. مُنازِع. عَدو/ دژ. دژمن. ناحەز. نەیار. ڕشت.

خَصم: أحد الفریقین المتخاصمین. مُتَقاضٍ في دَعوی/ یەکێک لە دووبەرەی تێکهەڵچوو.

خَصم: خَسم. إقتطاع/ داشکاندن. لێدەرکردن. کەمکردنەوە.

خَصم من الثَمن: تقلیل/ کەمکردنەوەی نرخ. داشکاندن.

خُصوبَة.. خِصب/ بەپیت.

خُصوص: صَدَد. شَأن/ بۆنە. بارە.

بِخُصوص. في خُصوص. من خُصوص: بِشَأن. بِصَدَد/ دەربارەی. بە بۆنەی.

بهذا الخُصُوص. من هذا الخصوص. بهذا الشأن. بهذا الصَدَد/ لەم بارەیەوە.

خُصوصاً. خاصَّةً. علی وجه الخُصُوص: لاسِیَّما/ نەخولزەلا. بە تایبەتی.

خُصوصي: خاص: ضِد عمومي/ تایبەت. تایبەتی.

خُصوصي: خاص. شَخصي/ کەسی. هی خۆیەتی.

خُصوصیَّة: سِرِّیَّة/ نهێنی و تایبەتیە.

خُصوصیَّة: خاصیَّة. میزَة/ تایبەتمەندێتی.

خُصوم.. خَصم/ دژ. ناکۆک.

خُصومَة: خِصام. نِزاع/ ناکۆکی. شەڕ. بەگژاچوون. دەمقاڵێ. مشتومڕ.

خُصومَة: خِصام. عِداء/ دوژمنایەتی.

خُصومَة قَضائیَّة: مُقاضاة/ داوالکەری. شکات و شکاتکاری. دوبەرەکێتی.

خصي: مَخصي. مُطَوَّش/ خەساو. ئاتوس. يەختە. ئەختە. خەرت.

خصي: خِصاء. تطويش/ خەساندن. گونەدەرهێنان. يەختەكردن.

خـصيب: خـصيب. كـثير الخـير/ بـەپيت. بەفـەر. بەبرشت. بەپێز.

خُصية. خِصية: بَيضَة/ گون. باو. رتل.

خصيصة: خاصيَّة. ميزة/ تايبەتمەنديتی.

خصيم: خصم. عَزيم. عَدو/ دوژمن. ناحەز. نەيار. رشت.

خَضٌ: رَجٌ. هَزٌ/ شلەقانی. رايوەشان. ژەنی.

خَـضٌ: أفـزَعَ/ ترسـانی. تۆقـانی. دلـيـچلەكان. دليخورپان.

خَضُ الإناءِ: رَجُهُ بالماء/ ئاوی تێوەردا.

خَضٌ. خضخضة: رَجٌ/ شلەقان. ژەنين. تێوەردان.

خضاب: صبغ. لَون/ بۆيە. رەنگ. خەنە و وسمە.

خِضاب الدَمّ: يحمور/ هيموگلۆبينی خوێن.

خُضار: خُضَري. بائع الخُضر. بَقّال/ بەقال. سەوزی فرۆش.

خُضار: خُضَر: خضروات. البقول والفواكه/ سەوزە و ميوە.

خُضار: ورِوار. طائر/ كەنەسمە. هەنگ خۆر.

خُضاري: بَطٌ بَرّي/ مراوی كێوی.

خـضاض. خـضاضة: وعـاء الخـضّ. رجاجة/ ژەنەر. مەشكە.

خَـضَبَ. خَـضَّبَ: صَـبَغَ. لَـوَّنَ/ رەنگی كـرد. بۆيـەی كرد.

خضب. خَضِبَ. خَضَبَ: إخضرّ/ سەوز بوو. دار گەڵای كرد. چرۆی كرد. كۆيكەی كرد.

خَـضب: خُـضرَة الـشجر/ گـەڵا. چـرۆ. سـەوزەی پووەك.

خَضب: المادّة الخضراء في النبات/ كلۆرفيل.

خَـضَّة: رَجّـة. إرتعـاش. هَـزّة. رَجفَـة/ راچـڵەكين. داچلەكين. مووچرك. لەرزە. داخورپان.

خضخضَ. خَضّ/ لەرزين و داچڵەكين.

خَضَدَ: ثنى من غير كَسر/ نوشتايەوە. چەمايەوە. خواربووەوە.

خَضَدَ الـشجر: قَطَعَ شـوكَه/ دركـەكانی لێكردەوە. هەڵيپاچی.

خَـضَدَ: ئخَـضَدَ. إنخَـضَدَ. إنكـسر/ شـكا. خواربووەوە.

خَضَدُ البَدَن: تكَسُرهُ وتَوَجعه مع كَسَل/ تێكشكاوی لەش. داهێزران. لەش قورسی. تەمەڵی.

خَضد: مخضود. الضعيف العاجز عن النهوض/ لاواز. لەشی تێكشكاو. داهێزراو.

خَضِرَ: إخضَرَّ. صار أخضَر/ سەوز بوو.

خَضَّرَ الشيءَ: جعَلَهُ أخضر/ سەوزی كرد.

خَـضَّرَ الارض: زرعهـا/ زەوی چـاند. كـشتوكاڵی تياكرد.

خَـضِر: أخـضَر اللـون/ سـەوز. رەنگـی سـەوز. كەسك.

خَضِر: مكان كثير الخُضرة/ سەوزەڵان. شوێنی پڕ لە پووەك و گژوگيا.

خَضَر. خُضرَة: خضروات/ سەوزە.

خضراء (مؤنث الأخضر): بلون الزرع/ سەوز. رەنگی سەوز. كەسك.

القُبَّة الخضراء: السماء/ ئاسمان.

خُـضرَة: إخـضرار. خـضراوات/ سـەوزە. سـەوزەو ميوە.

خُضرَة في لون الإنسان: سُمرَة/ گەنم رەنگ. سەوزە.

خَضرَة: نُعومَة. (غُصنٌ فيـه خَضرَة: نُعُومَة)/ لق و شوولكی نەرم و شل. ناسك.

خضرة: خضار. خضروات/ سەوزە و میوە.

بائع الخضرة/ هەمیشە سەوز. سەوزە فرۆش.

خضع لـ: أخضع. أذعن وانقاد/ ملی کەچ کرد. خۆی دا بە دەستەوە. ڕام بوو. تاو بوو. هاتەسەرێ. هاتە ژێربار.

خضع لـ: إجتاز. عانى. إحتمل. قاسى/ چێژتی. خواردی. بەرگەی گرن.

خضّع: أخضع. صيّره خاضعاً/ ملی پێ کەچ کرد. سەری پێ شۆڕکرد. دایەرکانەوە. ڕامی کرد. تاوی کرد.

خضل: إخضلّ. نَدِيَ. إبتلّ/ تەڕ بوو. شێی هێنایەوە.

خضّل: أخضل. بلّل. ندّى/ تەڕی کرد.

خضل: رَطب. نَدِي. مُبتل/ تەڕ. شێدار. پاراو. ناسك. نەرم و شل.

خضَم: بحر عظيم/ دەریای فراوان.

خضَمّ: جمع كثير/ خەڵکێکی زۆر.

خضوع: خاضع. مُذعن/ سەرشۆڕ ملکەچ. فریو. لاس. گەردن کەچ.

خضوع: إذعان/ ملکەچکردن. ملدان. سەرشۆڕی. خۆبەدەستەوەدان.

خضيب: مصبوغ. مُلوّن. مصبوغ بالحناء/ بۆیەکراو. خەناوی.

خضير: أخضر/ سەوز.

خضير. خضيري. نوع من العصافير/ سەرسەوز.

خضيراء: دردار/ کەندەسەمە. هەنگ خۆر.

خطّ: كتب/ نووسی.

خطّ: رسم أو عمل خطاً/ هێڵی کێشا. وێنەی کرد.

خطّ: حفر. نقش/ نەخشانی. هەڵیکۆڵی.

خطّ: وضع أو رسم خطة/ نەخشەی پیلان و پرۆژەی کێشا.

خطّ الشاربُ أو جانب اللحية: نبَتَ. طلَعَ/ مووی لێ ڕووا. ڕیشی هات. سمێڵی گووگرە بوو.

خطّهُ الشيب: تغيّر لون شعره/ سەری سپی بوو. موو سپی تێکەوت. بوو بە ماش و برنج.

خطّ الوجه: تجعّد/ دەموچاوی چرچ بوو. لۆچی تێکەوت.

خطّ في نومه: غطّ. خرّ/ پرخانی. پرخەی هات.

خطّ: سطر/ دێڕ. هێڵ. ڕیز.

خط: كتابة/ نووسین. دەستنووس.

خط: فن الخط. علم الخط/ زانیاری شارەزایی لە نووسین و خەت خۆشیدا. خۆشنووسی

خط الإستواء: خط الإعتدال/ کەمەرەی زەوی. هێڵی پشتێنە.

خط أفقي: موازٍ للأفق/ هێڵی ئاسۆیی.

خط أنابيب/ بۆری.

خطّ تلفوني أو هاتف/ هێڵی تەلەفۆن.

خطّ تماس: مجابَهَة. مواجَهَة. ملاصقة/ ڕووبەڕوو. پێکگەیشتن.

خط حديدي: سكة الحديد/ هێڵی ئاسن. ڕێگەی ئاسن.

خط الزوال: خط نصف النهار/ نیوەڕۆ. تەواوبوونی نیوەی کەمی ڕۆژ.

خط الطول/ درێژ هێڵی زەوی. هێڵی درێژایی.

خط العرض/ پان هێڵی زەوی. هێڵی پانایی.

خط عمودي/ هێڵی ستوونی.

خط فاصل/هێڵی جیاکار.

خط مستقيم/ هێڵی ڕاست.

خط النار: أمامي. مواجَهَة/ پێشەوە. ڕووبەڕوو. جەرگەی جەنگ.

خط مُنحني/ هێڵی چەماوە.

خط أو خطوط جوّية/ هێڵی ئاسمانی.

خُطّ: حَيّ. محلة/ گەڕەك. ناوچە.

خَطِيءَ.. اخطأ/ هەڵەی کرد.

خَطَا: مَشَى/ ڕۆی. ڕۆیشت.

خَطَا: تَقَدَّم. نَقَل رِجلَيه/ هەنگاوی نا. چووە پێشەوە.

خَطا خُطوات واسِعَة: تقدم ونَجَحَ بسرعة/ هەنگاوی باشی نا. زۆر چووە پێشەوە. سەرکەوت.

خَطَّأَ: غَلَّطَ/ هەڵەی پێکرد. بە هەڵەیا برد.

خَطَّأَهُ: نَسَبَهُ الى الخطا. قال له أخطأت/ هەڵەی دۆزیەوە.

خَطَا: غلط. غير صَحيح/ هەڵە. ناڕاست.

خَطا مطبعي/ هەڵەی چاپ.

خَطَأً: بالخَطَأ: بالغلط. على نحو خاطيء/ بە هەڵە. بە شێوەیەکی هەڵە. هەڵەیەك بوو ڕوویدا.

على خطأ: مُخطيء/ هەڵەیە. ئەو هەڵەیە.

خَطء: خطاء: خطأ. غلط. غير صحيح/ هەڵە. ناڕاست.

خِطء: كثير الخَطَأ: ذنب/ تاوان.

خَطّاء: كثير الخطأ/ زۆر هەڵە ئەکا.

خِطاب: خُطبَة. كلام الخطيب/ وتار. ئاخاوتن. دووان.

خِطاب: رسالة. كتاب/ نامە. پەیام.

خطاب إعتماد: شهادة أو وثيقة إعتماد/ باوەڕنامە.

خَطابَة: فَنّ الخطابَة. عِلم الخطابَة والفصاحَة/ زانیاری و شارەزایی لە ئاخاوتن و قسەکردن و وتاردان و وتارخوێندنەوە.

خَطّار: مِقلاع/ قۆچەقانی.

خَطّار الساعَة: رَقّاص. بَندول/ بەندۆڵ. پاندۆڵی سەعات.

خَطّار. خُطّار: ضيف/ میوان. مەیمان. میڤان.

خَطّاط: كاتب الخَط. إختصاصي بفن الخَطّ/ خۆشنووس. خەت خۆش.

خَطّاط: رَصاصَة خَطّاطة/ مُضيئة/ ڕووناك كار. تەلقەتەنوورە.

خَطّاف: خاطِف. من يَخطُف/ ڕفێنەر. هەڵگر. ڕڕپیاکەر.

خُطّاف: لِصّ/ دز. جەردە.

خُطّاف: لِصّ/ دز. جەردە.

خُطّاف: كُلّاب/ قولاب.

خُطّاف: طائر عُصفور الجَنَّة/ پەڕەسێلکە.

خِطام الدابّة: عِنان/ هەوسار. جڵەو. ڕەشمە. دەزگین.

خِطام: وَتَر القَوس/ ژێ. ژێ کەوان.

خَطَبَ: ألقى خِطاباً أو خُطبَة/ وتاری دا. وتاری خوێندەوە.

خَطَبَ: ألقى خِطاباً أو خُطبَة/وتاری دا. وتاری خوێندەوە.

خَطَبَ الفتاة: طَلَبَ الإقتراب بها/ خوازبێنی کرد. داوای کرد.

خَطَب الفتاة: عَقَدَ خُطبَة عليها/ نیشانەی کرد. شەکراوی خواردەوە. مارەی کرد.

خَطَبَ وِدَّهُ: صاحَبَهُ. ناشَدَ رضاه/ دڵی ڕاگرت. هاوڕێیەتی لەگەڵ بەست.

خَطب: أمر. شأن/ کاروبار.

خَطب: شِدَّة. مَكروه. مشكلة/ گیروگرفت. کێشە. بەڵا. تەنگ و چەڵەمە.

ماخَطبُكَ: ماشأنُكَ/ چیتە. کێشەت چیە.

خِطب: خاطب. خطيب/ خوازبێنی کار. دەسگیران.

خِطب: خَطيبَة. مَخطوبَة/ خوازبێنی کراو. دەسگیران.

خُطبَة: خطاب. كلام الخطيب/ وتار. ئاخاوتن. دوواندن.

خُطبَة دينيّة: موعظة/ ئامۆژگاری ئاینی.

خِطبَة: خُطوبَة: طلب المرأة للزواج/ خوازبێنی کردن. داواکردن. داخوازی.

خُطّة. خِطّة: طريقة. نهج/ ڕێباز. نەخشە. پرۆژە. شێوەی کارکردن.

خَطَرَ (بباله. في باله. على باله. له): لاح في فكره. بداله/ هات بە بیریا.

خَطَرَ: تَرَجَّحَ. تَذَبذَبَ/ لەرییەوە. لەلەرێتەوە. ئەهات و ئەچوو.

خَطَرَ بـ: لوّح بـ. هزّ/ ڕایوەشان.

خَطَرَ في مشيته: تبختر زهواً. تميّحَ/ خۆی با ئەدا. خۆی ڕائەوەشان. شانی بائەدا.

خَطَرَ بذنبه: ضرب به فخذ به/ کلکی ڕائەوەشان. ئەیلەقان.

لم يَخطر بالبال: لم يَرِد في الفكر/ نەهات بە بیریا. هەر لە بیرا نەبوو.

خَطُرَ: كان خطيراً. صار رفيع المقام وذاقدر/ گەورە بوو. پلەوپایەی بەرزی دەستکەوت.

خَطَر (جمع أخطار): تَهلُكَة/ مەترسی.

خَطَر: (جمع خِطار): سَبَق. رِهان. مايُراهَن عليه/ گرەو. پێشبڕکێ. پێشکەوتن. ئەوەی گرەوی لەسەر ئەکرێ.

خَطَرٌ مُحدِق: وشيك/ مەترسیەکی چاوەڕوانکراو. هاکا ڕوویدا.

خَطِر: مُتَبَختِر/ بەفیز. خۆڕاوەشێن. بەلاروولەنجە.

خَطَران: تَرَجُّح. تَذَبذُب/ لەرە. لەرزە. لەرینەوە.

خَطرَة: مَرّة. حين/ جار. کەرەت.

خَطرَفَ: أسرع في المشي/ بە خێرایی ئەڕۆی.

خِطرِيف. خُطرُف: السرع في المشي/ خێرا. گورج ڕەو. گورجوگۆڵ لە ڕۆیندا.

خَطَّ: رَسَمَ. سَطَرَ/ هێڵی کێشا. هێڵی دروستکرد. ڕێنەی دروستکرد.

خَطَّ الحدود: عيّن الحدود/ سنووری. دیاری کرد.

خَطَّطَ الارض: مَسَحَها. قاسها/ زەوی پێوانە کرد. پێوای. نیشانەی کرد.

خَطَّطَ الحواجب: زَجَّجَها/ برۆی باریک کردەوە.

خَطَّطَ: وَضَعَ أو رَسَمَ خِطّة/ پلان و نەخشەی (دانا. کێشا).

خَطَفَ. خَطِفَ: إنتزَعَ. سَلَبَ. إستلب بسُرعَة/ پڕی پیاکرد. ڕفانی. بردی.

خَطَفَكَ مَشى سريعاً/ خێرا تێپەڕی. فڕکەی کرد.

خَطَفَ إمرأة: هَرَبَ بها/ ئافرەتی هەڵگرت. بردی. ڕفانی.

خَطِفَ البَصَرَ: بَهَرَ/ ئاوی چاوی ڕۆی. چاو ڕێشکە و پێشکەی کرد.

خَطف: إنتزاع. إستلاب/ ڕفاندن. هەڵگرتن. تالانکردن. پڕپیاکردن.

خُطّاف. خُطَّاف: طائر عُصفور الجَنّة/ پەڕەسێلکە.

خَطَلَ. أخطَلَ في كلامه. أتى بكلام كثير فاسد/ زۆری وت. وتنەکەی پڕبوو لە قسەی هیچ و پووچ و بێسەروبن.

خَطَل: كلام فارغ/ قسەی (هیچ و پووچ. بێ جێ. بێ سەروبن. قۆڕ. ناشیرین).

خَطِل: طويل/ درێژ. بەرگی درێژ. شۆڕ. شەپ و شۆڕ.

خَطِل: ثرثار/ زۆربلێ. چەنەباز.

خَطِل: أحمق/ گێل. گەمژە. گەوج.

خَطَمَ. خَطَّمَ: كَمَّمَ. لَجَمَ/ هەوساری کرد. دەمی بەستەوە.

خَطَمَ: أسكَتَ/ بێدەنگی کرد. دەمکوتی کرد.

خَطي. خَطِيئَة/ ثبات/ هێزۆ.

خَطو: مَشي/ ڕۆیشتن. گەڕان. پیاسە. هەنگاونان.

خُطوبَة: خِطبَة: طلب المرأة للزواج/ خوازبێنی کردن. داواکردن. داخوازی.

خُطوَة. خَطوَة: نَقلَة الرجل/ هەنگاو. شەقاو. هنگاو. پێنگاو.

إتَّخَذَ خُطوَة حاسِمَة: قَرَّرَ قراراً هاماً/ هەڵوێستێکی گرنگی کرد.

خطا خُطوات واسِعَة: مَشي في تقدم ونجاح/ هەنگاوی گرنگی نا.

سار في خُطاه: إقتَدى به/ پەیڕەوی کرد. شوێنی کەوت. لاسایی کردەوە.

خُطورَة: أهَمِيَّة/ گرنگی. گرنگێتی.

خَطّي: كِتابي. مكتوب/ نوسراو.

خَطيئَة: خَطِيَّة. ذَنب. إثم. مَعصِيَة/ تاوان. گوناه.

خَطيب: مَن يُلقي الخُطبَة/ وتاربێژ. وتاردەر. دووان بێژ.

خَطيب: خاطِب. طالب زواج/ خوازبێنی کار.

خَطيب: خاطِب. المُرتَبط للزواج/ دەسگیراندار.

رَجُل خَطيب: حَسَن الخُطبَة/ وتاربێژی چاک.

خَطيبَة: مَخطوبَة/ دەسگیران. داواکراو. دەسگیراندار.

خَطِيئَة: خَطِيئَة. ذنب. إثم. مَعصِيَة/ گوناه. تاوان.

خَطير: هام. رفيع القدر والمقام/ گەورە. پایەبڵند. گرنگ.

خَطِر: عَصيب. خَطِر. ذو الخَطَر/ سامناك. مەترسی.

خَطير: المُتَبَختِر/ بەفیز. خۆهەڵکێش.

خَطير: مَثيل/ هاوتا.

خَطير: ظُلمَة الليل/ تاریکی شەو.

خَطيفَة: خَيطَف. السريع في المشي/ گورج و گۆڵ لە ڕۆیندا. گورج ڕەوا. خێرا.

خَطيفَة: فَتاة يَخطفها رجل ليتزوجها بغير راضي أهلها/ هەڵگیراو.

خَفَّ: ضد ثَقُلَ/ سووك بوو. ئاسان بوو.

خَفَّ: نَقَصَ. تناقَصَ/ كەمبووەوە. كەمی كرد. هێواش بووە. هێواشی كرد.

خَفَّ: طاشَ/ بەرەڵایی كرد. هەڵەشەیی كرد. كەرێتی نواند.

خَفَّ إلى: أسرَعَ/ بۆی چوو. بە پەل ڕووی تێكرد. بە هەڵمەتەوە چوو.

خَفَّ الشيء: جَعَلَهُ رَقيقاً/ تەنكی كرد. تەنكی كردەوە.

خُفّ: حِذاء. مَشايَة. مايُلبَس في القدم/ پێڵاو. كەوش. پاپوچ. پانی بەرز.

خُفّ: باطِن القَدَم. ماأصاب الأرض من قدم/ بنی چێ. جێ پێ. شوێن پێ.

خُفّ الحيوان: حافِر/ سم. سمی وشتر.

رَجَعَ بِخُفَّي حُنَين: رَجَعَ خائباً/ (بە نائومێدی. بە بێهیوا. بە دەستی بەتاڵ) گەڕایەوە.

خُفّ/ ترسا.

خَفيف/ ئاسك و تەنك. لاواز.

خِفّ: الجماعَة القليلة/ چەند كەسێك. خەڵكێكی كەم.

خَفَا. خَفَى: أخفى. سَتَر/ شاردیەوە.

خَفاء: ضد ظُهور/ نهێنی. شاراوە. پەنهانی.

خِفاء: غِطاء/ سەرقاپ. دەمەوانە. دەرخۆنە.

خِفاء: يُلبَس على الثوب فيُغَطيَة/ سەرجل. كاڵای ئاودامان.

في الخَفاء: خُفيةً. خِفيَةً/ لەژێرەوە. بە دزیـەوە. بەنهێنی.

بَرِحَ الخَفاءُ: وَضَحَ الأمرُ/ ئاشکرابوو. دەرکەوت. بەدیارهات.

خَفـارَة. خِفـارَة: حِراسَـة/ پاسـەوانی. دیـدەوانی. ئێشکگرتن.

خُفّاش: وَطـواط/ شەمشەمەکوێرە. چەکچەکۆڵە. چەکچەکی.

خَفّـاف: بـائع وصـانع الخِفـاف/ پـێڵاودروو. پێڵاوفرۆش. کەوشدروو.

خَفَقَ. خَلَقَ/کرمە ژۆڵەی کرد. هەڵتروشکا.

خَفَنَ: ماتَ فُجاةً/ کوتوپڕ مرد.

خَفَتَ الصَوتُ أو الضَوءُ: صارخا فتـاً. سَكَنَ/ کز بوو. نزم بووەوە. هێواش بووەوە.

خِفّة: ضد ثِقَل/ سووکی. ئاسانی.

خِفّـة: طَـيش. تَهـوُّر/ هەڵەشـەیی. خودسـەری. بەرەڵایی. لاساری.

خِفّة: ضَآلَة. تفاهَة/ هیچ و پووچی.

خِفّة الـدم. خِفّة الـروح. خِفّة الظِـلّ: بَشاشَة. ظَرافَة/ ڕۆح سووکی.

خِفّـة الحركـة: نـشاط. سُـرعَة الحركـة/ سووکەڵەیەتی. بزێوی. چابووکی.

خِفّـة العقـل: غَبـاء. حَماقَـة. بَـلادَة/ گێلـی. گەمژەیی. گەوجی.

خِفّـة اليَـد: مَهـارَة. شَـطارَة/ دەسـت سـووکی. چابووکی.

خفخاف: كأن صوته يخرج من منخريه/ منگن.

خَفَـرَ. خَفَّـرَ: حَـرَسَ/ پاسـی کـرد. ئاگـاداری کـرد. پاسەوانی کرد. چاودێری کرد. ئێشکی گرت.

خَفِرَ: تَخَفَّرَ. إستَحى/ شەرمی کرد.

خَفَر: حياء/ شەرم.

خَفِر: حَيّ/ شەرمن.

خَفَر: حَرَس/ پاسەوان. دیدەوان. ئێشکگر.

خَفَـر: خَفـارَة. حِراسَـة/ پاسـەوانی. دیـدەوانی. ئێشك گرتن.

خَفَـسَ: هَـزَأ. إسـتهزأ/ (گاڵتـە. قەشمـەری. تەشقەڵە)ی کرد.

خَفَسَ: هَدَمَ/ ڕووخانی. ڕمانی.

خَفِشَ: عَمي نهاري/ ڕۆژکوێری.

خَفِـشَ: يَبـصُر بالليـل دون النهـار/ شـەوبین. ڕۆژکوێر.

خَفَضَ: أنـزَلَ. ضـد رَفَعَ/ نـزی کردەوە. دایبـەزاند. هێنایە خواری.

خَفَضَ: خَفَّضَ. انْقَصَ/ کەمیکردەوە. دایشکان.

خَفَـضَ الـصَوتَ: هَـضَهُ وأخفـاه/ دەنگەکـەی نـزم کردەوە. هێواشی کردەوە.

خَفَضَ الصَوتُ: لانَ/ دەنگەکە نزم بووەوە. هێواش بووەوە. ئاسك بوو.

خَفُضَ العَـيشُ: سَـهُلَ/ ژیـان و گـوزەران خـۆش و ئاسان بوو.

خَفُضَ: انقَـصَ/ کـەمی کـردەوە. داشـکان. هێنایـە خواری.

خَفـض: إنـزال/ نزمکردنـەوە. دایـشکان. هێنایـە خواری.

خَفض العَيش: سُهولَة/ ژیـان و گـوزەرانی ئاسـان و خۆشی و ئاسوودەیی.

خَفـض الـسعر: إنقـاص/ نرخداشـکاندن. کەمکردنەوە.

خَفَّفَ الوزنَ: ضد ثَقَّلَ/ کێشی سووك کرد. کـەمی کردەوە.

خَفَّفَ: انْقَصَ. خَفَّضَ/ کەمی کردەوە. دایشکان.

خَفَّفَ: لَطَّفَ. سَكَّنَ/ (هێواش. نەرم. خاو)ی کردەوە. دڵی نەرم کرد.

خَفَّفَ: رَقَّقَ. جَعَلَهُ رقيقاً/ تەنکی کردەوە.

خَفَّفَ الزرعَ: قَلَّلَ من كثافته/ تەنکەی کرد.

خَفَّفَ السائلَ: أمرَضَهُ/ ڕوونی کردەوە. شلی کردەوە.

خَفَّفَ السُّرعةَ أو سُرعَتَهُ: أبطأها/ خاوی کردەوە. کەمی کردەوە.

خَفَّفَ العُقوبةَ: قَلَّلها. أبدلها بأخف/ سزاکەی گۆڕی. کەمی کردەوە.

خَفَّفَ الشَّعرَ: قَصَّ منه/ قژی کورت کردەوە. سووکی کرد. تەنکی کرد.

خَفَقَ برأسه وهو ناعس: أخفقَ. هَزَّهُ/ وەنەوزی دا. وەنەوزەکوتێی کرد.

خَفَقَ البَرقُ: لَمَعَ/ چەخماخەی دا. بروسکەی دا. بریسکایەوە.

خَفَقَ البَيضَ: خَلَطَهُ/ هێلکەی شلەقان.

خَفَقَ الطائرُ جناحَيه: أخفقَ. رَفرَفَ. طار/ باڵی ڕاوەشان. دای لە شەقەی باڵ.

خَفَقَ العَلَمُ: أخفقَ: رَفرَفَ/ ئاڵا شەنایەوە. شەکایەوە. شنیەوە.

خَفَقَ القلبُ: دَقَّ. رَفرَفَ/ دڵ لێی دا. پلی دا. ترپەی کرد. کەوتە پەلەپەل.

خَفَقَ النجمُ: غابَ. أفَلَ/ ئەستێرە ئاوا بوو. دیارنەما.

خَفق. خفقان القلب: وَجيب/ دڵەکوتێ. لێدان. پلدان.

خَفقة: نَفْلة. خبطة/ تەقە. ڕەقە. دەنگێکی نزم. لێدانێکی سووک.

خَفقة: نَبضة/ لێدان. پلدان.

خَفيَ: إختفى. توارَى/ ون بوو. دیارنەما.

خَفيّ: مُستَتِر. مُبطَن. سِرّيّ/ شاراوە. نهێنی. نادیار. پەنهان.

خَفيّ: غامض/ ئاڵۆز. شێواو.

خفيت:/ خافت. ساكن. هادیء/ بێدەنگ. دەنگی نزم. ئەسپایی. کپ.

خَفيّة: سِرّ. خانية. غامضة/ نهێن. نهێنی.

خِفيةً. خُفيةً: في الخفاء. سِرّاً. خِلسةً/ بەدزیەوە. لەژێرەوە. بەنهێنی.

خَفير: حارس. ناطور/ پاسەوان. دیدەوان. ئێشکگر. حەسحەس.

خَفيض: مُنخفض. خافت/ نزم. کز.

خَفيض: هَنيء/ ئاسان. سووک.

خَفيف: زهيد. تافه. حقير/ بێنابرو. ڕسوا. ترۆ. نزم. کەم بایەخ.

خفيف (الدم. الروح. الظل. العشرة): مليح. ظريف/ ڕۆح سووک. خوێن شیرین.

خفيف الحركة: حَرِك. رشيق. سريع ونشيط في عمله/ سووکەڵە. چابوک. بەدەست و برد.

خفيف الظهر: قليل أفراد العائلة/ کەم خێزان. سەرسووک.

خفيف العارضين: قليل أفراد العائلة/ کەم خێزان. سەرسووک.

خفيف العقل: أحمق/ گێل. گەوج. گەمژە.

خفيف السُّمك: ضد سَميك/ تەنک.

خفيف اليد: سريع العمل/ دەس سووک. ئیش ڕاپەڕێن.

خفيف الوزن: ضد ثقيل/ سووک. کێش سووک.

جاي خفيف/ ڕوون.

س تبغ خفيف/ نەرم.

خَلّ: ثَقَبَ/ کونی کرد.

خَلّ: إحتاج وافتقر/ هەژارکەوت.

خَلّ. تَخَلَّل: أزال مابين أسنانه. نَقاها بِخلال/ دانی ئاژنی. پاکی کردەوە.

خَلّ لَحمُهُ: هَزَل ونَقَص/ لەڕبوو. لاواز بوو. کێشی کەم بووەوە.

خلّ الزرعُ: خَفَّفَه/ تەنکەی کرد.

خَلّ: نَحيف الجَسَد/ لەڕ. لاواز.

خَلّ: شَقّ في الثوب. الثوب البالي/ دڕاوی. شڕ. جلی دڕاو و شڕ.

خَلّ: ماحُمِّضَ من العَصير/ سرکە.

خَلّ في الزراعة: تخفيف/ تەنکەکردن.

خِلّ. خُلّ: صديق. أليف. الصديق الوَدود/ هاوڕێ. برادەر. هاوڕێی گیانی بە گیانی.

خُل: مَوَدّة/ خۆشەویستی. دۆستایەتی.

خَلا: فَرَغَ. شَغَرَ/ چۆڵ بوو. بەتاڵ بوو.

خلا إلى نَفسه: إنفَرَدَ. إنعَزَلَ/ بە تەنها مایەوە.

خلا باله: إطمأنّ. إرتاح/ دڵنیابوو. خەمی نەما.

خلا (بـ. الى. مَعَ): إختَلى بـ/ لەگەڵی کۆبووەوە. پێکەوەمانەوە.

خلا بالمكان: لَزِمَهُ/ لە جێگەکەدا مایەوە. بە جێی نەهێشت.

خلا بـه: خادَعَه/ فێڵی لێکرد. دەستی بڕی. نائومێدی کرد.

خلا الحُزن: فارَقَه/ خەمی نەما. خەمەکەی لەبیرچووەوە.

خلا الشهرُ: مَضى/ مانگ تێپەڕی. تەواو بوو.

خلا عن الأمر ومن الأمر: تَبَرّأ منه/ خۆی نەکرد بە خاوەنی. خۆی لێکێشایەوە. ڕزگاری بوو.

خلا للأمر: تَفَرَّغَ له. إنصرف اليه/ خۆی بۆ تەرخان کرد.

خلا المكانُ: رَحَل ساكنوه/ چۆڵیان کرد. گواستیانەوە. کەسی تیانەما. چۆڵ بوو.

خَلا مكانُهُ: مات/ کرد. جێگەکەی چۆڵ بوو.

خَلا: مَضى. مَرّ. إنقَضى/ تێپەڕی. ڕابوارد. بەسەرچوو.

خَلا: ماخَلا. سِوى/ بێجگە. جگە لە. جگە. بەبێ.

لايَخلو من فائدة: فيه فائدة/ کەڵکێکی هەر هەیە.

منذ كذا سنوات خَلَتْ/ لە پێش چەند ساڵێکەوە.

خَلّى الفَرَس: ألقى اللجام في فيها/ لغاوی کرد.

خَلّى اللجام من الفرس: نَزَعَهُ/ لغاوەکەی داکەند.

خَلّى القِدرَ: ألقى تحتها حَطَباً/ ئاگری مەنجەڵەکەی کرد.

خَلا. خَلاة: عُشب/ گیا.

خَلّى عن: تَرَكَ/ بەجێی هێشت وازی لێهێنا. لێی گەڕا. دەستی لێهەڵگرت.

خَلّى بينهما: تركهما مُجتَمِعَينِ/ وازی لێهێنان. بەجێی هێشتن.

خَلّى سبيله: أطلَقَهُ/ بەری دا. بەرەڵای کرد.

خَلّى مكانَهُ: مَضى لسبيله/ چوو بە ڕێی خۆیدا. بە ڕێی خۆیدا ڕۆیشت.

خَلّى مكانَهُ: مات/ مرد. جێگەکەی بە چۆڵی بەجێهێشت.

خَلاء: فَراغ. فَضاء. المكان الفارغ/ چۆڵی. چۆڵیان. دەشت. دەر.

خَلاء: ريف/ دەشت. لادێ.

في الخلاء: في العَراء. في الفضاء. تحت السماء/ لە دەشت. لە دەرەوە.

بَيتُ الخلاء: مرحاض/ ئاودەستخانە. ئاودەست. چۆڵە. سەرئاو.

خَلائق: خَلق. بَرِيّة. مخلوقات/ زیندەوەر. گیاندار.

خَلّاب: خالب. أخّاذ. جَذّاب. فاتن/ دڵڕفێن.

خَلّاب: خالب: مُخادع/ زمان لوس. هەڵخەڵەتێن.

خَلاسي: الولد من أبوين أحدهما أسود والآخر أبيض/ مندالّی دوو توخم. ڕەش و سپی.

خَـــلاس: نجــــاة/ ڕزگـــاربوون. ڕزگـــاری. سەرفرازبوون.

خَلاص: إنقاذ/ ڕزگارکردن. سەرفرازکردن.

خَلاص: إنتهى الأمر/ کۆتایی. تەواو. لێبووەوە.

خَلاص الجنين: مَشيمَة/ مناڵدان.

خُلاصَة: عُصارَة. زُبدَة/ ناوەرۆك. پوخت. پوختە.

خُلاصَة: مُختَصَر. موجَز/ کورتە. پوختە. نوێشك.

الخُلاصَـة. خُلاصَـة القَـول. بالإختـصار/ کورتـە و پوختەی باش.

خَلاَط. خَلاّطَة: آلة وجهاز الخَلط/ تێکەڵکار.

خَلاعَة: تَهَتُّك. فُجور/ کردەوەی ناشیرین. خراپە. بێشەرمی. بەرەڵایی.

خَلاعي: إباحي. بَذيء/ بێنابووو. بەرەڵا.

خِلاف: نزاع. خُصُومَة. ضد وِفاق/ ناکۆکی. ناڕێکی. چەن و چوونی.

خِلاف: إختلاف. فَرق. تفاوت/ جیاوازی. جیایی.

خِلاف: نَقيض. عكس. غير. عَدا. ماعَدا/ پێچەوانە. بێجگە.

خِـلاف: بِخِـلاف: الى جانـب/ سـەرەڕای. لەگـەڵ ئەوەشدا.

بخِلاف كذا. على خلاف كذا: عكس/ پێچەوانە. بە پێچەوانەی.

وخِلافُه: الى آخرهِ. وغير ذلك/ هەتا دوایی.

عليه خِلاف: عليه نزاع/ چەن و چوونی لەسەرە. ناکۆکی لەسەرە.

خِلافَة: عُقُوب. الإتيان بَعد. أن يخلف شخص غيره/ بەدواداهاتن. جێنشینی.

خِلافَة: إمامَة/ خەلیفەیەتی. ڕابەری.

خِلافي: محل خلاف. متنازع عليه/ ناکۆکی لەسەرە.

خَلاّق: مُبدِع. مُبتكِر/ دروستکار. داهێنەر.

الخَلاّق: الباري. الله/ خوا. خوای کردگار.

خِلال. خِلالَة: عود أسنان. مايُخَلَّل بـه الأسـنان/ دان تاژنە. خەلیلە.

خِلال: خِلالَة: بقية الطعام بين الاسنان/ پاشماوەی خواردن لەناو ددانەکاندا.

خِلال. في خِلال: في حدود/ لە چوارچێوەی.

خِلال: سَفُّود/ شیش. سیخ. شیش. سیخ.

خِلال: مايُثقَب به/ درەوش. سمۆ.

في خِلال ذلك: أثناء/ لەوکاتـەدا لـە هـەمان کاتـدا لە کاتی.

من خلال: بواسطة/ بە هۆی.

خَـلاّل: صـانع وبـائع الخَـل/ سـرکە دروسـتکەر. سرکەفرۆش.

خَلالَـة. خِلالَـة. خُلالَـة: الـصداقة الـصادقة/ هاوڕێیەتی گیانی. ڕاستەقینە.

خَلَبَ العقلَ: فَتَنَ. إستهوى/ دڵی لێ سەند. شەیدای کرد. گرفتاری کرد.

خَلَب: إختلب. خَـدَع/ خەڵـەتاند. هەڵیخەڵـەتان. فریوی دا. دەستی بری.

خِلب: ظفر. مِخلَب. بُرثُن/ چنگ. نینۆك.

خُلَّـب: يَعِـد ولاينجِـز/ بـێ پـەیمان. بـێ گفـت. هەردەم.

خَلباء: حَمقاء/ ئافرەتی گێل و کەم ئەقڵ. گەوج. ساویلکە.

خُلَّـة. خِلَّـة: صَـداقَة. مَـوَدَّة/ هاوڕێیـەتی. دۆستایەتی. خۆشەویستی.

خَلَّـة: الحاجَـة والفَقـر/ هـەژاری. نـەبوونی. نەداریی.

خَلَّـة: خَـصلَة. خاصـيَّة/ ئـەدگار. چـۆنیەتی. تایبەتمەندێتی.

خَلَجَ: خالَجَ. خامَرَ. شَغَلَ/ چەواشە بوو. سەری لێ تێکچوو. دوودڵ بوو. گومانی کرد.

خَلَجَهُ بِعَينِه: غَمَزَهُ/ چاوی لێ داگرت.

خَلَجَت العَينُ: رَفَّت/ چاو فڕی. پرتەپرتی کرد.

خَلَجَة: عاطِفَة. إحساس/ هەست. سۆز.

خَلَجَة: خَلَاج. هاجِس/ دوودڵی. گومان.

خَلَجَة: إختلاجة. رَعشَة/ لەرزە. لەرین. لەرینەوە.

خَلخال: ثَوب القَدَم. حُلِيَة تُلبَس في الرِجل/ پاوانە. خرخاڵ. بازنەی قوڵ.

خَلخَال: ثَوب خَلخَال. رَقِيق/ تەنک. تیواڵ.

خَلخَلَ: خَلَعَ. فَكَّ/ جوڵانی. لەقی کرد. ترازانی. هەڵیکەند. کردیەوە.

خَلخَلَ: حَرَّكَ. رَجَّ/ شڵەقانی. ڕیوەشان.

خَلخَلَ: جَعَل أقَلَّ كَثافَةً. رَقَّقَ/ ڕوونی کردەوە. شلی کردەوە.

خَلخَلَة: تَقليل الكَثافَة/ ڕوونکردنەوە. شلکردنەوە.

خَلَدَ: دام/ مایەوە. درێژەی کێشا.

خَلَدَ: أبطَأَ عَنهُ المَشيب/ درەنگ مووی سپی بوو. درەنگ پیر بوو.

خَلَدَ. خَلَّدَ الى المكان وبالمكان: أقام فيه/ نیشتەجێ بوو. لەوجێیە مایەوە.

خَلَدَ الى الراحَة: إرتاح. إستراح. إسترخى/ پشووی دا. بای باڵی خۆیدا. حەوایەوە.

خَلَّدَ: أقَرَّ. سَرمَدَ. أدام/ مایەوە. درێژەی کێشا. درێژەی خایان.

خَلَّدَ الذِكرَ: أحيا ذِكرَه/ باسی کرد. ناوی هێنا. یادی کردەوە. ناوی کوێر نەکردەوە.

خَلَد: بال. نَفس. قَلب/ دڵ و دەروون. بیروهۆش.

خُلد (الجمع مَناجِذ): حيوان/ مشکەکوێرە. خەرمشك. سووچەر.

خُلد: دَوام. بَقاء. أبدِيَة. عَدَم الموت/ مانەوە. هەتایی. هەمیشەیی. جاویدی. نەمری.

جَنَّة الخُلد. دار الخُلد: فِردَوس/ بەهەشت. بەهەشتی نەمران.

خُلد: سِوار. قُرط/ بازنگ. گوارە.

خَلَسَ: إختَلَسَ. سَلَبَ. سَرَقَ/ دزی. دزی کرد. فڕانی. پڕی پیاکرد.

خَلَسَ: إختلس. سَرَقَ زهيداً/ ناخونەکی دا.

خَلَسَ الشَعرُ: أبيَضَّ بَعضُه/ قژ سپی تێکەوت. بوو بە ماش و برنج.

خُلسَةً: خُفيَةً/ بە دزیەوە. بە دزە. بە نهێنی. سەراسوێ.

خُلسَة: فُرصَة/ هەل. ڕێکەوت.

خُلسَة: مُختَلَس. مَسروق/ دزراو. ڕفێنراو. ناخونەك.

خَلَصَ: صَفا/ ڕوون بووەوە. خاوێن بوو. پوخت بوو.

خَلَصَ إلى. وَصَلَ الى. إنتهى إلى/ گەیشتە ئەو ئەنجامەی.

خَلَّصَ من: انقَذَ. نَجَّى. حَرَّرَ/ ڕزگاری کرد. ئازادی کرد. سەربەستی کرد.

خَلَّصَ: صَفَّى. نَقَّى/ خاوێنی کرد. بژاردی. پوختی کرد.

خَلَّصَ: أنهى/ تەواوی کرد. لێبووەوە. کۆتایی پێهێنا.

خَلَّصَ حَقَّهُ بيده: أخذَه/ بە دەستی خۆی (تۆڵەی کردەوە. ماڵی خۆی سەند).

خَلَطَ. خَلَّطَ: مَزَجَ/ تێکەڵی کرد.

خَلَطَ في الكلام: هَذى/ دای بە سەریدا. تێکەڵ و پێکەڵ قسەی کرد. بزڕکانی.

خَلَطَ وَرَق اللعب: رَتَّبَ. سَوّى/ شانەی لێدا. تێکەڵی کرد.

خَلَطَ بينهما: أخطَأَ/ لێی تێکچوو.

خَلَطَ المريضُ: أكل ما يَضُرُّهُ/ نەخۆش دەمی نەپاراست. ئەوەی باش نیە خواردی.

خلط: مَزج/ تێکەڵکردن. ئاوێتەکردن. ئامێزەن کردن.

خلط الحملان والأمهات/ زاوما. زاوماکردن.

خِلط: أحمق/گەوج. گێل. ساویلکە.

خِلط: مختلف النَسَب/ دووڕەگ. دوو توخم.

خِلط: احمد أخلاط الجسم الأربَعة.. أخلاط/ باش و جوان.

خلط: خلطة: خليط. مزيج/ تێکەڵ. هەرمە. تێکەڵە. ئاوێتە.

خُلطة: عِشرة. مُعاشرة/ تێکەڵی. ئامشۆ و هاتوچۆکردن.

خَلَعَ: شَلَعَ/ هەڵیکەن. هەڵیکێشا.

خَلَعَ: نَزَعَ/ دایکەن.

خَلَعَ إمراتَهُ: أزالها عن نفسه. طَلَّقَها/ ژنەکەی تەڵاق دا. وازی لێهێنا. لێی جیابووەوە. دەستی لێهەڵگرت.

خَلَعَ ثيابَهُ: تَعَرّى/ ڕووتبووەوە. خۆی ڕووتکردەوە. جلەکانی داکەن.

خَلَعَ الحَوينُ جلدَهُ: طَرَحهُ/ پێستەکەی لێکردەوە. دایماڵی. پێستەکەی فڕێدا.

خَلَعَ الدابَةَ: أطلقها من قيدها/ ئاژەڵەکەی بەردا. بەرەڵای کرد.

خَلَعَ العذار: ألقاه نفسه. تَهَتَّكَ. تَرَكَ الحياء ورَكِبَ الهَوى/ حەیا و شەرمی خستەلاوە.

خَلَعَ عليه ثوباً أو خِلعةً: ألبَسهُ منحةً. وَهَبهُ. مَنحَهُ/ کاڵا پێبەخشی. کردی بە بەریا.

خَلَعَ المفصلُ: فَسَخ. مَلَخ/ لەجێچوو. لە خرتکە چوو.

خَلَعَ مِن مَنصَب: عَزَل/ لە ئیشەکەی لایبرد. دەریکرد.

خَلَعَ وَلَدَهُ: تَبَرّأ مِنهُ/ دەستی لە کوڕەکەی هەڵگرت. حاشای لێکرد. دەستبەرداری بوو.

خَلَعَ الشَجَرُ: سَقَطَ وَرَقُهُ/ دارگەڵای وەری. گەڵاڕێزان بوو.

خَلَعَ الشَجَرُ: انبَتَ ورقاً جديداً/ دارگەڵای کرد. گەڵا ڕووا. گەڵای تازەی دەردا.

خَلَعَ: إنقادَ لهواه/ شوێن هەوەس و ئارەزووی خۆی کەوت. دەستی دایە خوێڕیێتی.

خَلَعَ: فَكّكَ/ لە جێی چوان. لە خرتکەی برد. ترازانی. هەڵیوەشان. تێکی دا.

خَلع: إقتلاع/ هەڵکەندن. دەرکێشان.

خَلع: تَعَرٍّ/ ڕووتکردنەوە. ڕووتبوونەوە.

خَلع: نَزع/ داکەندن.

خَلع المفصل: مَلخ/ لە ئیش لابردن. دەرکردن.

خُلع: حَقّ المرأة في الإنفصال: عَزل/ لە ئیش لابردن. دەرکردن.

خِلعة: ثوب يُعطى منحةً. رداء الشَرَف/ بەرگی پێشکەش کراو. بەرگی شانازی و ئابڕوو.

خُلعة: تَرك وطلاق المرأة/ جیابوونەوەی ژن لە مێردەکەی. تەڵاقدان. دەستلێهەڵگرتن.

خَلعة: خالع: المرأة المُطلّقة/ ئافرەتی تەڵاقدراو.

خَلَفَ: كان خَليفَتَهُ. أتى بَعدَهُ/ بەدوایا هات. جێی گرتەوە.

خَلَفَ: حَلّ محل. بَقي بَعد/ جێگەی گرتەوە. چووە جێگەکەی.

خَلَفَ عن أصحابه: تأخّرَ/ دواکەوت.

خَلَفَ لَهُ: ذكَرَهُ في غيابه ( بخير أو شرّ)/ پاشملە باسی کرد. ئاوی هێنا.

خَلَفَ له وعليه : عَوَضَ/پاداشتی دایەوە. بژاردی.

خَلَفَ فلاناً : اَخَذَهُ من خَلفِه/لە پشتەوە گرتی. لە دواوە پەلاماری دا.

خَلَـفَ : جَعَلَـهُ خَليفَتَـهُ/چـووە جێگەکـەی. لـە جێگەکەی دانرا. جێگەکەی گرتەوە.

خَلَفَ ولداً : إنسَلَ/نەوەی خستەوە.

خَلف : ضد سَلَف/نەوەی خستەوە.

خَلَف : وَلَد. نَسل. ذُرِّيَة/نەوە. وەچە.

خَلَف : بدیل. عِوَض/بری. بریکار. لەجێی.

خَلـف : ظَهـر. قَفـا. مُـؤَخِرة. وَراء/بەشـی دواوە. پاش. پشت.

خَلـف : الـرديء مـن القـول/قسەی قۆپز هیچ و پووچ.

خَلف : أحَدَ الفاس/دەمی تەشوێ. دەمی تەور.

خِلف : حَلَمَة الضَرع/گۆی گوان.

خُلـف : عَـدَم إنجـاز الوَعـد/بـێ گفتـی. پـەیمان شکاندن. درۆ.

خُلفَـة : فَقـد الـشهوة الى الطعـام/دڵ نـەبردن. پێنەخوران.

خُلفَة. خِلفَة : خِلاف. نِزاع. خُصومَة/ناکۆکی.

خُلفَة : العَيب/شووورەیی. نەنگی.

خِلفَة : رُقعَة/پینە.

خِلفَة : ماعُلِّقَ خلف الراكب/پاشکۆ.

خِلفَة : بَقيَة/پاشماوە.

خَلفيَة : ارضية/تەختەکەی.

خَلفيَـة : خَفايـا وماوراء/نهێنی. ئەوەی بە دوایا دێت و نازانرێ.

خَلَقَ : بَـرَأَ. احـدث. اوجَدَ/دروستی کرد. هێنایە کایەوە.

خَلَقَ إختلق. حاكَ. لَفَقَ. إفترى/قسە و بوختانی دروست کرد. هەڵیبەست.

خَلَقَ : إختلق. إستنبط/دایهێناز دۆزیەوە.

خَلُقَ بـ أول : جَدُرَ بـ : كان جديراً به/لە خۆی هات. لێی هات. شایانی بوو. بۆ ئەو باش بوو.

خَلُقَ : خَلِقَ : بَلِيَ/کۆن بوو. شڕبوو. زۆر لەبەرکرا.

خَلَّقَ : عَطَـرَ. طَيَّبَ/بۆنی لـە خۆیدا. خۆی بۆن خۆش کرد. بۆنداری کرد.

خَلَق : بالِ/کۆن. شڕ. کۆنە. بەکارهێنراو.

خَلـق : بَـرء. أحـداث/دروستکردن. داهێنـان. هێنانەکایەوە.

خَلـق : بَرِيـى. مخلوقـات/زینـدەوەر. گیانـەوەر. جانەوەر.

خَلق . خلقة/دروستی کرد.

خُلُق. خُلق : سَجِيَة. طبع/خوو. ڕەوشت. ڕەفتار.

خُلُق. خُلق : مُروءة/پیاوەتی.

سَـيِءُ الخُلُـق : شَـكِس/بـەدخوو. بەدڕەوشـت. بێنابڕوو.

خُلقاني : بائع الملابس القديمة/کۆنەفرۆش.

خَلَقَة : خِرقة بالية/پەڕۆشڕ. کۆنە. شڕە.

خِلقَة : بُنيَة : هَيئة/دیمەن. ڕواڵەت.

خِلقَة : بـالولادة. مُنـذُ الـولادة/زکماکی. سکماک. سروشتی.

خِلقين : قِـدر. مِرجَل/مەنجەڵ. قازان. مەنجەڵی ئاوگەرمکردن. بۆیلەر.

خَلَّ : صـار خَلاً. حَـوَّلَ الى خَلَ. صَيَّرَه خَلاً/بوو بە سرکە. کردی بە سرکە.

خَلَّلَ : كَبَسَ بالخل او الملح/خستیە ئاوو خوێوە. خستیە سرکەوە.

خَلَّلَ أسنانَهُ : نَقّاها/ددانی ئاژنی. پاکی کردەوە.

خَلَّـلَ بَينهَـا : وَسَّـعَ. فَـرَّقَ/تێکـی دان. کردنـی بە گژیەکـدا. نـاکۆکی تێخـستن. کردنـی بـە دووبەرەکی.

سَلَف في عمل: ضِد الخلف/ پێشوو. ڕابوردوو. کارمەند و ئیشکەرەکەی پێشتر.

سَلَف: سُلفَة: قرض بلا فائدة/ قەرزی بێ سوود. وامی سەربەسەر.

سَلَف: مجموعة ختام او بَیت شعر/ کبە. زۆم. هۆیە. چەند ڕەشماڵێك پێکەوە.

سَلَفاً: مُقَدَماً/ پێشەکی.

سِلف الرَّجُل: زوج أخت زوجته. عدیل/ ئاوەڵزاوا.

سِلف: أخو الزوج/ شووبرا.

سِلف: أخو الزوجة/ ژن برا.

سِلف. سِلفَ: جلد. جلد رقیق/ پێست. پێستی تەنك. مێشن.

سِلفَة المرأة: إمراة أخو الزوج/ شووبراژن.

سُلفَة: سَلَف. قرض بلا فائدة/ قەرز. وام (بەبێ سوود و سەلەم).

سَلَقَ الطعامَ: أغلاه وطَبخه/ کوڵانی. لێینا.

سَلَقَ الشيءَ بالماء الحار: سَمَطَ. اذهب شعره وریشه/ ئاوەڕووتێی کرد. پەڕ و تووکەکەی لێکردەوە.

سَلَقَ البَردَ أو الحَرّ النَّباتَ: احرَقَه/ گەرما بردی. سەرما بردی. هەڵپڕوکان. سووتانی.

سَلَقَهُ باللسان أو بالکلام: آذاه. زَجَرَهُ/ قسەی پێوت. دڵی شکان. دڵی بریندار کرد.

سَلق (مصدر سَلَقَ): إغلاء وطبخ/ کوڵاندن. لێنان.

سَلق. سَلَق: أثر الجرح/ شوێن برین. جێ برین.

سِلق: نبات/ سلق.

سَلَكَ: تَصَرَّفَ. سارَ/ ڕەفتاری کرد.

سَلَكَ الطریقَ: سار فیه. إجتازَ/ بە ڕێگەکەدا ڕۆیشت. ڕێگەکەی گرتەبەر. پیاتێپەڕی.

سَلَكَ الشيءَ في الشيءِ: أسلَكَ. ادخله فیه/ تێی خست. پیاکرد. کردی بە ناویا. پێوەی کرد. هۆنیەوە.

سَلَكَ.. أسلَكَ/ ڕێگەی گرت.

سَلَّكَ الخَیطَ/ حَلّ لَفَّهُ. حَلّ عَقدَهُ/ خاوی کردەوە. دەزوکەی کردەوە. گرێکەی کردەوە.

سَلَّكَ الأمرَ المُعَقَّد: ازال الأبهام عنه/ کاری گرانی ئاسان کرد.

سَلَّكَ: نَظَّفَ/ پاکی کردەوە. بەریدا.

سِلك: خَیط/ تەل. تاڵ.

سِلكٌ شائك: مُسَنَّن/ تەل دڕکاوی.

سِلك: مِلاك. هَیئة. مِهنَة/ پیشە. کار.

سِلك دبلوماسي: سیاسي/ ڕامیاری. باڵیۆزگەری.

سِلكي: (مِثل. من) السلك/ تەلدار.

لاسلکي: لایحتاج سلك جهاز لایعتمد علی سلك/ بێ تەل.

سِلکیان: خَلیطیات. طائفة من الدیدان/ کرمە پەتدارەکان.

سَلِمَ من خطَر: نَجا/ ڕزگاری بوو.

سَلِمَ من عَیب: بَرِىءَ منه/ بێ خەوش دەرچوو. پاك بوو. ڕووسوور بوو.

سَلَّمَ إلی: ناوَلَ. رَفَعَ او قَدَّمَ الی. اعطی/ دایە. پێی دا. بۆی نارد. پێی سپارد.

سَلَّمَ الیه: إنقادَ واذعَنَ/ خۆی دا بە دەستەوە. ملی شۆڕ کرد.

سَلَّمَ بالأمر: رَضيَ. قَبِلَ/ قایل بوو. ڕازی بوو. ملی دا.

سَلَّمَ الشيءَ من خَطَر: خَلَّصَه/ ڕزگاری کرد.

سَلَّمَ امرَه إلی الله: رَضيَ بامره/ کاری دایە دەست خوا.

سَلَّمَ بـ: اقَرّ. إعتَرَفَ/ دانی پیانا. دەرکانی. قایل بوو.

سَلَّمَ سلاحَهُ: نَزَعَهُ/ چەکی دانا.

سَلَّمَ علیه: قال سلام علیکم. حَیَّا/ سڵاوی کرد.

سَلِّم لي عليه : بَلِّغهُ سلامي/ سڵاوی منی پێ بگەیەنە. سڵاوی لێ بکە.

سلم. سَلم. سَلام/ ئاشتی. ئاسایش.

سُلَّم : مرقاة. دَرَج/ پەیژە. قاڵدرمە. پلیکانە. پێپلیکە. پاپەنجە. پسترە. ترنجە.

سُلَّمَة : دَرَجة. إحدى درجات السُلَّم/ پلە. پایە.

إتَّخَذَهُ سُلَّماً : وَسيلَةً/ کردی بە هۆیەک بۆ مەبەستی خۆی. کردی بە پەیژە پیا سەرکەوێ.

سَلمون : سَلمون مُرَقَّط: سَمَك/ ماسیە خاتوونە.

سِلمي : مُسالم. مُحِبّ السِلم/ ئاشتیخواز.

سِلمِياً : بسلام/ ئاشتیانە. بە ئاشتی.

سَلوَ. سُلو. سُلوان/ هێمنی و دڵنەوایی.

سَلوى : تَسلِيَة. لَهو. كل مايُسَلّي/ رابواردن. کەیف کردن.

سُلوان : سَلو. سُلو. نسيان/ بیرچوونەوە. لەبیرکردن.

سُلوان : عَزاء/ پرسە. سەرخۆشی.

سُلوان : خَرزَة للوقاية من العين/ مووروی چاوەزار.

سَلوة. سُلوَة : رَغَد/ خۆش گوزەرانی. ژیانی باش.

سَلوقي : سَلاقي. كلب الصيد/ تانجی. تاژی. تاجی.

سُلوك : تَصَرُّف. سيرة/ کردار. رەفتار. کردەوە. رەوشت و خوو.

سَليَ عَنهُ. سَلِيَهُ : سَلا. نَسيَ/ لەبیری چووەوە. لەبیری کرد.

سُلّيّ. سِلّيّ : متعلق بمرض السُّل/ پەیوەندیدار بە نەخۆشی سیلەوە.

سَليب : مَسلوب. مَنهوب. مَسروق/ دزراو. بڕاو. تاڵانکراو.

سَليخ : بلا طعم/ بێتام.

سَليخ : مَسلوخ/ گوراو. داماڵراو.

سَليط : وَقِح. طويل اللسان/ زمان درێژ. جنێو فرۆش. بێئابڕوو.

سَليط (صِفَة لِلّسان) : الفصيح الحديد اللسان/ زمان رەوان. پاراو.

سَليقة : طعام مَسلوق/ کوڵاو.

سَليقة : طبيعة. غريزة. بَديهَة/ نەژادی. خۆرسک. لەخۆوە. سروشتی.

سَليل : وَلَد. إبن. نَسل. ذُرِّيَة/ نەوە. وەچە. کوڕ. کچ. وەجاخ.

سليل الأكارم : إبن الأكارم/ وەجاخزادە.

سَليل : مسلول. مُصاب بالسل/ سیلاوی.

سَليل : مَسلول. مُستَل (كالسيف)/ ڕاکێشراو. دەرهێنراو. هەڵکێشراو. شمشێر و خەنجەری ڕووت.

سَليم : ليس به أذى/ بێوەی. بێ زیان.

سَليم : صَحيح/ تەواو. دروست. هیچ نییە. بێخەوش. بێگەرد.

سليم البُنيَة : صحيح البنية/ لەش ساخ. تەندروست.

سَليم العقل : صحيح العَقل/ هۆشیار. هۆشمەند. ژیر. ئاقڵ.

سَليم من كذا : خالٍ منه/ بێ خەوش. پەتی.

سليم من الآفات والامراض : سليم العافية/ بێدەرد. نەخۆش نییە.

سليم النيّة : سَليم القلب : صالح الضمير/ دڵسۆز. نیەت پاک. دڵپاک.

سليم : لَديغ/ ماران گاز. چزاو.

سليم : المُشرِف على الهلاك. الجريح المشرف على الموت/ بریندارى پەرێشان. لەسەر گیانەڵا.

سَمَّ لطعامَ سَمَّمَهُ. جَعَلَ فيه سَمّاً/ خواردنەکەی ژاراوی کرد. ژاری تێکرد.

سَمَّ الأمرَ : سَبَرَهُ ونَظَرَ غَورَهُ/ تاقی کردەوە. هەڵیسەنگان. ویستی لێی تێبگا.

سَمَّ بَينَهُما: أصلَحَ/ڕێکی خستن. ئاشتی کردنەوە. پێکی هێنان.

سَمَّ الشيءَ: عَمَّ الجميعَ/هەموانی گرتەوە. بەر هەموان کەوت.

سَمَّ القارورَةَ: سَدَّها/سەری نایەوە. دایخست.

سَمَّهُ: سقاهُ السَّمَّ/ژەهرمان خواردی کرد. ژاری دایە.

سُمَّت الريحُ: أحرقَتْ/گڕە بردی. سووتانییەوە.

سُمَّ اليومُ: إشتدَّ حَرُّهُ/گەرمای کرد.

سُمَّ النباتُ: أحرقَتْهُ السَّمومُ/گڕە سووتانی. گڕە بردی.

سَمّ. سُمّ. سِمّ: قَشْب/ژار. ژەهر. زەهر.

سَمّ الفار: زرنيخ/مەرگەمووش. مەرگەمشک.

سَمّ الحمار: دَفْلة/ژاڵە.

سَمّ. سُمّ. سِمّ: ثَقب. مَسام/کون. کونە دەرزی. کونیلە. وردەکونی گەڵای درەخت.

سَما: أسمَى. عَلا. إرتفَعَ/بەرزبوومەوە. هەڵچوو. بڵند بوومەوە.

سَما عَن: تَرَفَّعَ عن/بێزی لێکردەوە. خۆی لێ دوورخستەوە.

سَما بـه: أسماهُ. رَفَعَهُ. أعلاهُ/بەرزی کردەوە. هەڵێنا.

سَما الى: طَمَحَ الى/بەرز خوازڕوانی. بۆ بەرز ڕوانی.

سَمّى. سَمال: أسمَى. دعاهُ بـ. جعل له إسماً/ناوی لێنا. ناوی نا.

سَمّى: ذكر إسم الله. إبتَهل/ناوی خوای هێنا. بە ناوی خوا دەستی پێکرد.

سَما: الصيت الحَسَن/ناوبانگی باش.

سَماء: مايحيط بالارض من الفضاء/حەوا. بۆشایی ئاسمان.

سَما: القُبَّة الزرقاء. جَلَد/ئاسمان.

سمائي. سَماوي/شینی ئاسمانی.

سَماجَة: بَشاعَة. قُبح/ناشیرینی. ئێسک قورسی.

سَماح: سَمح. صَفح. تسامُل/چاوپۆشی. لێبووردن. بەخشین. لێخۆشبوون.

سَماح: سماحَة. جُود. كَرَم. سَخاء/بەخشندەیی. میهرەبانی. دەستبڵاوی.

سَماح: إجازَة. إباحَة/ڕێدان. هێشتن. هێڵان.

سَماحَة: سَعَة أو رَحابَة صَدر/سنگ فراوانی. میهرەبانی. بە دڵی فراوانەوە.

سَماحَة فُلان: صاحِب السماحَة. سُمو. رِفعَة/ پایەبەرز. پایەبڵند.

سَماد: زِبل. سِباخ/پەیین. کووت. سنێری ئاژەڵ.

سَماد کیمیاوي/پەیینی کیمیاوی.

سَمار: نَبات كالحلفاء يُستعمل لصنع الحصران والسلال/لەبان.

سَمار: لَبَنٌ كثير الماء/(شیر. ماستاو)ی پڕ لە ئاو. ڕوون. تراو.

سَمارِيَّة: بَطَّة بَرِيَّة/مراوی کێوی.

سِماط: شَرشَف. غطاء المائدة. مايُبسَط ويوضع عليه الطعام/چەرچەف. خوان. سفرە.

سَماع: سَمع. إستِماع/گوێگرتن. گوێلێگرتن.

سَماع: نَقل. تقليد. حديث منقول/بیستن. دەڵێن. شنەفتن.

سَماعِ: إسم فعل بمعنى إسمَعْ/گوێ بگرە. ببیسە.

سَمّاع: مُستَمِع. سَميع/گوێگر.

سَمّاع: مُطيع/گوێ (ڕایەڵ. بیست. لەست. دێر).

سَمّاع: جاسوس/گوێ هەڵخەر. سیخوڕ.

سَمّاعَة: آلة تزيد قوّة السمع/دەمگەمرە. بیستەک.

سَماعي: سَمعي. مأخوذ بالسَماع/بە بیستن. وتیان. دەڵێن.

سَمَاق: نبات ثَمَرَهُ حامض/ ترش. ترشى سماق. سفووك.

سَمَّاك: بـائع أو صـيّاد سَمَك/ ماسـى فـرۆش. ماسيگر. راوكەرى ماسى.

سَمَاكَة: ثَخانَة. غِلَظ/ ئەستووری. ئەستوورایی.

سَماكَة: علم الأسماك/ زانیاری لە ماسیدا.

سِماكَة: تربية الأسماك/ ماسى بەخێوكردن.

سَمأَلَ الغَـلُّ: عَـلاهُ السَمْوَال/ سـرکە مێشوولەی هەڵهێنا.

سَمّان: بائع السَمن. بَقَّال/ رۆن فرۆش. بەقاڵ.

سَمانَة: سِمنَة. بَدانَة/ قەڵەوی. تێکسمڕاوی.

سَماوي: سَمائي. بلون السماء/ شینی کاڵ. رەنگی ئاسمانی.

سَماويك سَمائي. روحي/ گیانی. گیانزان.

سَماوي: سمائي. عُلوي/ بەرزی. بڵندی.

سَمَتَ: لَـزِمَ الـسَمتَ. سـار على الطريـق/ رێگەکـەی گرتۆ بەر رێگەکەدا تێپەڕی.

سَمت: طريق/ رێ. رێگا. رێگە.

سَمت: هَيئَة/ دیمەن. شێوە. باروبۆخ.

سِمَة: عَلامَة/ نیشانە.

سِمَة: نَغمَة. بَصمَة/ مۆر. پەنجەمۆر.

سِمَة: مِزَة. طابع. صِفَة/ چۆنیەتی. رەفتار.

سِمَة دُخول: تَاشيرة/ ڤیزە.

سَمُجَ: كان سَمِجاً قَبيحاً/ ناشیرین بوو.

سَمِج. سَمِجك قَبيح/ ناشیرین. ئێسک قورس.

سَمَحَ لكذا: أجاز. أذِنَ/ رێیدا. هێشتی. چاوپۆشی کرد.

سَمَحَ لـ: خَوَّلَ. فَوَّضَ/ دەسەڵاتی پێدا. سەرپشکی کرد.

سَمَحَ بـ: جاد. أعطى/ بەخشی. دای.

لاسَـمَحَ الله. معـاذ الله/ خوانـەکا. خوانـەکردە. دوورِیا. دووربێ.

سَمُحَ: كـان سَمِحاً. صـارَ مـن أهـل الجُـود والكـرم/ (بەخشندە. دەستبڵاو. خێرمەند) بوو.

سَمح: رَحب الصَدر/ دڵفراوان.

سَمح: سَماحَة. جود. كَرَم/ بەخشندەیی. خێرکردن.

سمحاق: غشاء يكسو العظم/ پێستی سەر ئێسقان.

سمحاق: سَحاب مُرتَفِع/ هەوری تەنکی بەرز.

سَـمَدَ الارض: سَـبَّخَ. زَبَّـلَ/ زەویەکـەی پـەیین دا. پەیینی پێوەکرد.

سَمَرَ: تَحَدَّثَ ليلاً/ شەونخوونی کێشا. بە قسە و رابواردنەوە خەریک بوو نەنوست.

سَمَرَ: إسمَرَّ. صار أسمَر/ بۆر بوو. بۆر هەڵگەڕا.

سَمَّرَ: ثَبَّتَ بمسمار/ بزمار رێژی کرد. بە بزمار. قایمی کرد.

سَمَرَ اللَبَنَ: جَعَلَهُ سماراً (أي رَقَّقَهُ)/ ئاوی تێکرد. رووتی کردەوە.

سَمَرَ: الحـديث في الليـل/ ئاهـەنگ و رابـواردنی شەو. کۆڕ و دەمەتەقێی شەو.

سَمَرَ: الليل وسوادُهُ/ شەو و تاریکی شەو.

سُمرَة: إسمرار/ بۆری. رەنگی بۆر. گەنم رەنگ.

سمسار: دَلّال. وسيط/ دەڵاڵ. جامباز. جاکەش.

سَمسَرَ: إشتغل سمساراً. تَوَسَّط بـين البـائع والمشتري/ بوو بە دەڵاڵ. دەڵاڵی کرد. جامبازی کرد.

سَمسَرَة: عَمَل السمار/ دەڵاڵی. جامبازی.

سَمسَرَة: أجرة السمار/ دەڵاڵانە.

سمسم: نبات الجلجلان/ کونجی.

سَمسَم: ثَعلب. ذئب. نمل أبيض/ رێوی. گورگ. مێروولە وردەی سپی.

سَمَطَ: سَكَتَ/ بێدەنگ بوو.

سَمَطَ: أزالَ الشَعرَ/ تووکی لێکردەوە. ئاوەڕووتی کرد.

سَمط. إزالة الشعر بالماء الحار/ ئاوەڕووت کردن. تووك لێکردنەوە.

سَمط: فقير/ هەژار. نەدار. کەمدەست.

سِمط: خيط القلادة/ کشتەك.

سَمِعَ: أدرَكَ بالأذن/ بیستی، گوێی لێبوو. گوێی تێوەبوو.

سَمِعَ الكلامَ: فهِمَ/ تێی گەیشت. حاڵی بوو. چوو بە گوێیدا.

سَمِعَ بـ: عَلِمَ. تَبَلَّغَ بالخبر/ زانی. پێی زانی. پێی وترا. پێی ڕاگەیەنرا.

سَمِعَ (إلى. لـ): إستمع. أصغى/ گوێی شل کرد. گوێی لێگرت.

سَمِعَ مصادفةً أو عَرَضاً/ بەرگوێی کەوت.

سَمِعَ لـ: أطاعَ. أذعنَ/ بە گوێی کرد. گوێڕایەڵی کرد.

سَمِعَ الله لـ: سَمِعَ الدُعاءَ. إستجاب/ دوعای گیرا. خوابۆی هێنایە دی.

لم يُسمَع به: غير معروف/ نەبیسراوە. نەزانراوە.

سَمَّعَ: أسمَعَ. جَعَلَهُ يَسمع/ گوێی پێ لێگرت. دای بە گوێیدا. پێی ڕاگەیان.

سَمَّعَ الدرسَ: تَلاه/ وانەی وتەوە.

سَمَّعَ به: نَدَّدَ. نَوَّه بذكره في الناس/ ناوی هێنا، باسی کرد.

سَمَّعَ به: أذاع عنه عَيباً وفضحَهُ/ ناوی زڕان. قسەی شوێن خست، بە خراپ ناوی هێنا.

سَمع: سَماع/ بیستن. گوێ لێبوون. ژنەفتن. ئەژنەفتن.

سَمع: مَسمَع. حاسة السمع/ هەستی بیستن.

سَمع: أذن/ گوێ.

سَمعاً وطاعةً/ گوێڕایەڵ و ملکەچم.

سَمعَكَ إليَّ: إسمَع مني/ گوێم لێبگرە.

ثقيل السَمع/ گوێگران.

خفيف السَمع/ گوێ سووك.

أرعاهُ سَمعَهُ/ گوێی بۆ شل کرد. گوێی لێگرت.

سَمع: الذكر الجميل/ بە باشی ناوهێنان و باسکردن.

سَمعَة: صيت. ذِكر. شُهرَة/ ناوبانگ.

سُمعة حميدة: حَسَنَة/ ناوبانگ باشی.

سُمعة رَديئة: سَيئة/ ناوزڕاو. ناوبانگی خراپ. بەناتۆرە.

سَمعي: مختص بالسَمع/ زانیار لە بیستندا.

سَمَقَ. سَمقَ: علا. إرتفَعَ/ بەرزبووەوە. هەڵکشا. درێژبوو.

سَمق. سامِق: عالٍ. مُرتفع/ بەرز. بالا. درێژ. هەڵچوو.

سَمَكَ: رَفَعَ. إرتفَعَ واعتَلى/ بەرزی کردەوە. بەرزبووەوە. هەڵچوو.

سَمُكَ: ثَخُنَ. صار سميكاً/ ئەستووری کرد.

سُمك. سماكة: ضد رقة. ثخانة. غلظ/ ئەستووری. قەف.

سَمك: سَقف/ بنمیچ. سایەتە. بنبان. دارەڕا.

سَمَك: حيوان مائي/ ماسی.

سَمَك الترس/ ماسیە پانکە.

سمك ذهبي/ ماسیە زێڕینە.

سمك كُروي: مفلطح/ ماسیە خڕە.

صيد السمك/ ڕاوەماسی.

علم السمك: سَمكيات/ زانیاری لە ماسیدا.

سَمَكَة: سمكة واحدة/ ماسیەك.

سَمكَرَة: سباكة/ تەنەکەچێتی.

سَمكَري: سَبّاك/ تەنەکەچی.

سَمَلَ عَينَهُ: إستَمَل. فَقَأَهَا/ چاوی دەرهێنا. چاوی هەڵکۆڵی. کوێری کرد.

سَمَلَ. سَمُلَ الثَّوبُ: بَلِيَ/ کۆن بوو. شڕ بوو. دڕا. پووا.

سَمِل: بالٍ/ کۆن. شڕ.

سَمَل: خِرَق بالية. ملابس قديمة بالية/ جلەکۆن. پوواو.

سَمَّ الطعام: سَمَّ. جَعَل فيه سَمًّا/ خواردنەکەی ژاراوی کرد. ژاری تێکرد.

سَمَّمَهُ: سَقَاهُ السم/ ژاری دەرخوارد دا. دەرمان خواردی کرد.

سَمِنَ: كَثُرَ شحمُهُ ودَسَمُهُ/ چەوری زۆر بوو. ڕۆنی زۆر بوو. زۆر چەور بوو.

سَمِنَ: زاد وَزنُه/ قەڵەو بوو. گۆشتی گرت.

سَمَّنَ: صَيَّرَهُ سميناً/ چەوری کرد. ڕۆنی تێکرد.

سَمَّنَ الحيوانَ: عَلَفَهُ/ دایبەست. قەڵەوی کرد.

سَمَّنَ الحيوانَ: عَلَفَهُ/ دایبەست. قەڵەوی کرد.

سَمن. سِمن. سمنة/ چەوری. ڕۆن.

سِمَن. سِمَنَة. كثرة الشحم. واللحم على البدن/ قەڵەوی. گۆشتنی.

سَمَندر. سَمَندَل: حيوان/ قورناویلکە.

سِمَّن. سُمَّانى. سُمنَة: طائر/ شیلاقە. پەتەفە.

سُمُو: رِفعَة. جَلال/ شکۆ. پلەوپایەی بەرزی.

سُمو: عُلو. إرتفاع/ بەرزی. بڵندی.

سُمو الأمير/ خاوەن شکۆ.

سُمو الأخلاق: مكارم الاخلاق. نُبالَة/ ڕەوشت بەرزی. شکۆداری.

سَموال: ذُباب الخَلّ/ مێشوولەی سرکە.

سَموال: ظِلّ/ سێبەر.

سَمور: حيوان له فرو ثمين/ سمۆرە.

سَمور أبيض/ قاقم. ئاژەڵێکە لە سمۆرە ئەکا.

سُمُوق: عُلو. إرتفاع/ بەرزی. بڵندی. بالا.

سَموم: ريح حارَة/ گڕە.

سَمِيٌّ: مَن إسمُه إسمك. له نفس الإسم/ هاوناو.

سَمِيٌّ: سام. مُسَم/ ژاراوی. ژەهرین. بکوژ.

سَمِيح: سَمح. رَحب الصدر. جواد. كريم/ میهرەبان. دڵفراوان. بەخشندە.

سَمِير: مُسامر. الرفيق أو العشير المرح/ هاوڕێی خۆش مەشرەف. ئەریاب.

إبن سمير: الليل لاقمر فيه/ شەو. شەوەزەنگ. شەوی تاریك.

إبنا سمير: الليل والنهار/ شەو و ڕۆژ.

سَمِيع: مُستَمِع/ گوێگر.

السميع: من أسماء الله الحسنى/ یەکێکە لە ناوەکانی خوا.

أم سميع: المخ/ دەماخ. مێشك.

سَمِيك: ثَخين. غليظ/ ئەستوور.

سَمِيم: سَامی. ذو مَسام/ کوندار. کون کون.

سَمِين: شحيم/ چەور. بەزاوی. ڕۆناوی.

سَمِين. بَدين/ قەڵەو. گۆشتن. تێکسمراو. شیشمان.

سَنَّ: سَنَّنَ. شَحَذَ. بَرَى/ تیژی کرد. دەمەزەردی کرد. دایدا. نووکی بۆ کرد.

سَنَّ قانوناً: شَرَعَهُ/ یاسای دەرکرد. ڕێبازی دانا.

سَنَّ: سَنَّنَ الأسنان. سَوَكَها/ دانی شت. فڵچەی پیاهێنا. سیواکی لێدا.ی پیاهێنا. سیواکی لێدا.

سَنَّ: أسَنَّ: نَبَتَت الاسنان/ دانی دەرهات.

سَنّ: شَحَذ. جَلخ. بَري/ تیژکردن. دادان.

سَن القوانين والشرائع: تشريع/ یاسا دەرکردن. یاسادانان.

سِنّ (الفم. المشط. المنشار.. الخ)؛ واحدة الأسنان/ دان.

سِنّ: عُمر. مقدار العُمر/ تەمەن. سیّرە.

سِنّ: شوكة. شُعبة/ نووك. چقڵ. لق. دان. تەڵەزم.

سِنّ. سِنّة الثوم: فُصّ/ سەڵك. قسڵە.

سِنّ الرُشد. سِنّ البلوغ/ (تەمەن. سیّرە)ی هەرزەكاری. كاتی لاوی.

سِنّ الفيل أو الخنزير: ناب/ كەڵبە. شفرە. ماهی.

سِنّ الإبرة أو القلم: الرأس الحاد/ نووك.

سِنّ اللَّبَن: سِن الحليب. أول مايظهر من الأسنان/ دانی شیری. دانی زووكەوت.

سِن المحراث: الحديدة/ گاسن.

سِنّ اللولب: حَزّ/ دان و پێچی برغو.

سِنّ اليأس: إنقطاع الحيض. تَوَقُّف الطَمْث/ وەستانی خوێنی ئافرەت.

صغير السِنّ: شاب. صَبي/ گەنج. لاو. تەمەن بچوك.

كبير السِن: شيخ. هَرِم/ پیر. بە تەمەن. بەساڵاچوو.

طَعَنَ وطُعِنَ في السِنّ: شاخ. هَرِمَ/ پیر بوو. بە ساڵاچوو. بەتەمەنە.

هو في سِنّ فلان: تِرِبُه/ لە تەمەنیكەدان. هاوتەمەن.

ألم أو وجع السِنّ/ دان ئێشە.

سِنّ: (الجمع أسنان)/ دانەكان.

طبيب أسنان/ پزیشكی دان.

مُرَكّب أسنان/ دانساز.

طَقم أسنان/ تاقمی دان.

فرشاة أسنان/ فڵچەی دان.

أسنان وَقتيّة/ دانی زوو كەوت.

أسنان دائميّة/ دانی هەمیشەیی.

سَنا البرقُ: أضاءَ/ بروسكەی دا. چەخماخەی دا.

سَنا: لَمَعَ/ درەوشایەوە. شەوقی دایەوە.

سَنا البابَ: فَتَحَهُ/ دەرگای كردەوە.

سَنَت السماءُ: مَطَرَت/ باران باری. دایكردە باران.

سَنِيَ: سَهُلَ. يَسُرَ/ ئاسان بوو. ئاسانی كرد. ڕاییەڕان.

سَناً. سَنىً: سَناء. ضياء. لمعان. بَهاء/ ڕووناكی. ڕۆشنایی. چەخماخە.

سَناء: رِفعَة/ مەزنی. بەرزی. بلندی. شكۆ.

سِناج: سُخام/ دووكەڵ. ڕەشی. دووڕژنج. دۆڕژنگ.

سَناخة: خَمَة: نَتانة. زَنَخ/ بۆنڕزبۆگەن. بۆنكردوو.

سَناد: سَنَد. دعامَة. ركيزة/ كۆڵەكە. پاڵپشت.

سَنام: حدبَة في ظهر الجَمَل/ كۆپارە.

سَنام: حدبَة في منكب أو ظهر الحيوان/ پێڵ.

سِنان: نَصل الرمح/ نووك. نووكە ڕم.

سِنان: سَن. مِشحَذة/ هەسان. تیژكەر.

سِنان: أفعى سامَة/ ماری ژاردار.

سُناهيَة: راتب أو دخل سَنَوي/ مووچە و دەستكەوتی ساڵانە.

سَنْاج: سَنفَرَة/ سمارتە.

سُنبك: طرف الحافر/ نووكی سم.

سَنبَلَ الزرعُ: أسبَلَ. خَرَجَ سُنبُلُه/ گوڵی كرد.

سُنبُل (الواحدة سُنبُلَة): ملكان أعالي نبات الحنطة والشعير/ گوڵەگەنم و جۆ.

سُنبُل بَرّي: نبات/ هاس.

سِنّ اللولب: حَزّ/ دان و پێچی برغو.

سِنّ اليأس: إنقطاع الحيض. تَوَقُّف الطَمْث/ وەستانی خوێنی ئافرەت.

صغير السنّ: شاب. صَبي/ گەنج. لاو. تەمەن بچوک.

كبير السن: شيخ. هَرم/ پیر. بە تەمەن. بەساڵاچوو.

طَعَنَ وطُعِنَ في السنّ: شاخ. هَرِمَ/ پیر بوو. بە ساڵاچوو. بەتەمەنە.

هو في سنّ فُلان: تِربُهُ/ لە تەمەنیکدان. هاوتەمەنن.

ألم أو وجع السنّ/ دان ئێشە.

سِنّ: (الجمع أسنان)/ دانەكان.

طبيب أسنان/ پزیشكی دان.

مُركب أسنان/ دانساز.

طَقم أسنان/ تاقمی دان.

فرشاة أسنان/ فڵچەی دان.

أسنان وَقتية/ دانی زوو كەوت.

أسنان دائمية/ دانی هەمیشەیی.

سَنا البرقُ: أضاءَ/ بروسكەی دا. چەخماخەی دا.

سَنا: لَمَعَ/ درەوشایەوە. شەوقی دایەوە.

سَنا البابَ: فَتَحَهُ/ دەرگای كردەوە.

سَنَت السماءُ: مَطَرَت/ باران باری. دایكردە باران.

سَنّي: سَهّلَ يَسّرَ/ ئاسان بوو. ئاسانی كرد. راپەڕان.

سَناً. سَنىً: سناء. ضياء. لمعان. بَهاء/ ڕووناكی. ڕۆشنایی. چەخماخە.

سَناء: رفعة/ مەزنی. بەرزی. بڵندی. شكۆ.

سناج: سُخام/ دووكەڵ. ڕەشی. دووڕۆژنە. دۆرۆژنگ.

سَناخة: خمة: نَتانة. زَنخ/ بۆدەرنز بۆگەن. بۆنكردوو.

سناد: سَنَد. دعامة. ركيزة/ كۆڵەكە. پاڵپشت.

سَنام: حدبة في ظهر الجَمَل/ كۆپارە.

سَنام: حدبة في منكب أو ظهر الحيوان/ پێڵ.

سِنان: نَصل الرمح/ نووك. نووكە ڕم.

سِنان: سَن. مشحَذة/ هەسان. تیژكەر.

سِنان: أفعى سامّة/ ماری ژاردار.

سَناهِيّة: راتب أو دخل سنوي/ مووچە و دەستكەوتی ساڵانە.

سَنادِج: سَنفَرة/ سمارتە.

سُنبك: طرف الحافر/ نووكی سم.

سَنبَلَ الزرعُ: أسبَلَ. خَرَجَ سُنبُلُه/ گوڵی كرد.

سُنبُل (الواحدة سُنبُلة): ماكان أعالي نبات الحنطة والشعير/ گوڵەگەنم و جۆ.

سُنبُل بَرّي: نبات/ هاس.

سُنبُل: قَرن الغزال/ هەڵاڵە.

سُنّة: سيرة. طريقة. شريعة/ ڕێباز. یاسا.

سُنّة الرسول: السُنّة النبوية/ ڕێباز و فەرمایشتەكانی پێغەمبەر.

أهل السُنّة: القائلون بخلافة أبوبكر/ ئەوانەی باوەڕیان بە خەلیفە ئەبوبەكر كرد.

سُنّة: خلاف الشيعة/ بیروباوەڕی سوننە.

سَنَة: عام. حَول/ ساڵ.

سَنَة حَسَنَة/ ئامەد.

سَنَة دراسية/ ساڵی خوێندن.

سنة ضوئية/ ساڵی ڕووناكی.

سنة كبيسة/ ساڵی پڕ. ٣٦٦ ڕۆژ.

سنة مالية/ ساڵی دارایی.

سنة ميلادية/ ساڵی زایین.

سنة هجرية. سنة قمرية/ ساڵی كۆچی.

سَنَت: عام سنة جَدب. قَحط/ ساڵی نەهاتی. برسێتی. قاتوقڕی.

رجل سَنت: قليل الخير/ پیاوی بێ خێر. پەرپووچ.

سِنجاب: حیوان/ سمۆرە.

سِنجابي: رَمادي/ خۆڵەمێشی.

سَنَحَ: عَرَضَ. خَطَرَ/ هات بە (خەیاڵ. بیرەدا).

سَنَحَ: تَیَسَّرَ. تَسَهَّلَ/ ڕێکەوت. هەڵکەوت. ئاسان بوو.

سَنَح عَن: صَرَفَ عَن/ وازی هێنا. دەستی هەڵگرت. پەشیمان بووەوە.

سَنَحت الفُرصَة: اُتیحت/ هەل هەڵکەوت. دەست پەرژا.

سَنِخَ: زَنِخَ. نَتَنَ/ بۆگەنی کرد. بۆنی کرد.

سَنَخ: زَنخ. خَمة. نَتانة/ بۆگەنی. بۆگەن بوون. بۆنکردن.

سَنِخ: نَتِن. زَنِخ/ بۆگەن. بۆنکردو.

سِنخ: أصل/ بن. بنە. ڕەگ و ڕیشە. ڕەگ.

سَنَدَ. سَنُدَ: دَعَم. دَعَم وَوَثَّقَ/ ڕایگرت. پشتگیری کرد.

سَنَدَ إلی: إستَنَدَ إلی. إعتَمَدَ علی/ پشتی پێ بەست.

سَنَد: دِعامَة. رَکیزة/ پاڵپشت. کۆڵەکە. پشتگیر.

سَنَد: صَكّ. حُجَّة. مُستَنَد. وَثیقة/ سەنەد. بەڵگە. بەڵگەنامە. کۆمپیالە. نوسراوێك.

سَند: تَسنید. دَعم/ پشتگیری. یارمەتی. لایەنگرتن. ڕاگرتن. پاڵپشت نان.

سَندان. سِندان: مایُطرَق علیه. مَصطَبَة العَمَل/ دەزگا.

سِندانَة: أصیص/ ئینجانە.

سَندَروس. سَندَلوسك صَمغ أو معدن شبیه بالکهرباء/ سەندەلوس. سەندەل.

سُندُس: حریر رقیق. نسیج حریري/ ئاوریشمی نەرم.

سِندیان: شجر البلوط/ داربەڕوو.

سِنط: رُسغ. المفصل بین الکَفّ والساعد/ مەچەك.

سَنط: شجر شائك/ هەڵز. دارهەڵز. ئەکاسیا.

سَنطور. سِنطیر. آلَة طرب/ سەمتوور.

سِنطیل: طویل/ درێژ. زەبەلاح. درێژداهۆڵ.

سِنع: شِطّ الیَد/ شانەی دەست.

سِنع: جمیل/ جوان.

سَنَع: جَمال/ جوانی.

سِنف. سَنفَة النبات: وِعاء. غِلاف الحَبّ/ پیلە. قەلاس. تونکڵی تۆو.

سَنَف: العود المجرد من الورق/ شووڵە.

سَنفَرَ: سَفَنَ/ سمارتەی کرد. سمارتەی لێدا.

سَنفَرَة: سَفن/ سمارتەکردن.

وَرَق السَنفَرَة/ سمارتە. کاغەزی سمارتە.

سَنَمکي: نبات وَرَقُهُ مُسهِل/ سینەمەکی.

سَنَّنَ. سَنَّ. شَحَذَ. جَلَخَ. بَرَیَ/ تیژی کردن دەمەزەردی کرد. دایدا. نووکی بۆ کرد.

سَنَّنَ: حَزَّ. ثَلَمَ. فَرَضَ/ کەل کرد. قلیشی تێکرد. دانی بۆ کرد.

سَنَّنَ الأسنانَ: نَظَّفَها/ دانەکانی ئاژنی. پاکی کردەوە.

سَنَن: طریقة. نَهج/ ڕێباز.

سَنَن. سُنَن. سُنُن. سِنَن. طریق/ ڕێ. ڕێگا. ڕێگە.

سُنَن.. سُنَّة/ سوونەت و فرمایشتی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ).

سَنِهَ: مَرَّت أو مَضَت علیه السنون/ کۆن بوو. ساڵانی بەسەرا تێپەڕی.

سَنِهَ الطعامُ أو الشرابُ: تَغَیَّر. تَعَفَّنَ/ تێکچوو. بۆنی کرد. بۆگەن بوو.

سِنَّور: هِرّ. قِطّ/ پشیلە. گوریە. کتك.

سَنون: مَسحوق لتنظیق الأسنان/ دان پاکردنەوە.

سُنونو: سُنونوَة. خُطّاف. طـائر/ پەرەسێلكە. حاجی ڕەش.

سَنَوي: عـامي. حَـولي/ سـالانە. سـالوەخت. لـە سالێكدا.

سَنَوياً: في السَنَة. كل سَنَة/ لە سالێكدا. هەموو سالێك.

سَنَوِيَّة: راتب أو دَخل سنوي/ مووچە و دەستكەوتی سالانە.

سَنيّ: رفيع. سام/ بەرز. بلند. مەزن. خاوەن شكۆ.

سُنّي: واحد من أهل السُنَّة/ سوننی.

سِنّ: ذو علاقَة بـالأسنان/ پەیوەندیدار بە ددانەوە.

سَنيم: عالي القَدر/ پایەبەرز.

سَها عـن: نَسِيَ. أغفَلَ/ لەبیری چوو. غافڵ بوو. سەهوی كرد.

سُـــهاد: سَـــهد. أرَق/ خـــەوزڕان. بێخـــەوی. شەونخونی.

سَهّار: كـثير الـسَهَر/ كـەم خـەو. زۆر بـە خەبـەر. بێدار.

سُهاف: العَطَش الشديد/ تینوێتی زۆر.

سَهام: حَر السَموم/ گەرمای گڕە.

سَهام: وهج الصَيف/ گڕچە گەرمای هاوین.

سُـهام: تَغَيُّـر الـلـون مـع هُـزال/ ڕەنـگ گـۆڕان و هەڵژلەپان. لاوازبوون.

سِهام (جمع سهم).. سَهم/ ڕم. ڕمەكان.

سَهب. سُهُب. سُهب: فَلاة/ چۆڵ. بیابان. چۆڵەوانی.

سَهب: وَقت/ كات.

سَهِدَ: تَـسَهَّدَ. أرِقَ ولم يَـنَم/ خـەوی زڕاو خـەوی لێنەكەوت. نەنوست.

سَهَدَ: أرِقَ/ خەوی زڕان. نەیهێشت بنوێ.

سُـــهد. سُـــهاد: أرَق/ خـــەوزڕان. بـــێ خـــەوی. شەونخوونی.

سُـــهُد: مُـــسهَد. ارِق/ خـــەوزڕاو. بەخەبـــەر. نەنوستوو.

سَهدَة: يَقظَة/ بە خەبەری. بێداری. بێخەوی.

سَهِرَ: لم يَـنَم لـيلاً. بَقـيَ مُتيقظـاً/ شەونەنوست. بەخەبەر بوو. خەوی لێنەكەوت.

سَـهِرَ علـى: راقـبَ. رَعـى. عُنـيَ/ ئێشكی گـرت. شەونخوونی كێشا.

سَهَّرَ: اسهَرَ. جَعَلَهُ يَسهَر/ نەیهێشت (بنوێ. خـەوی لێبكەوێ). بە شەونخونی هێشتیەوە.

سَهَر: تَيَقُّظ. حَذَر. عَدَم النوم ليلاً/ شەونەنوستن. بێداری.

سَهَر: رِعايَة. عِنايَة/ ئاگاداری كردن. بەدیارەوە دانیشتن. ئێشككرتن.

سَهران: سـاهِر. صـاحٍ. يَقِظ/ بەخەبـەر. بـە ئاگـا. نەنوستوو. بێخەو. بێدار.

سَهرَة: حفلة لَيليَة. ليلة سـاهِرَة/ ئاهـەنگ. بەزمی شەو.

سَهِفَ: عَطَشَ شديداً/ زۆری تینوو بوو.

سَهِكَ: أنتَنَ/ بۆنی كرد. بۆگەنی كرد.

سَـهَك. سَـهكَة. سُـهُوكَة. نَتانَـة/ بۆنی نـاخۆش. بۆگەن. بۆنی ئارەقی لەش.

سَهِك: نَتِن/ بۆگەن.

سَهُلَ: كان هَيِّناً/ ئاسان بوو. سووك بوو.

سَهُلَ المَكانُ: كان مُستَوِياً/ تەخت بوو.

سَهَّلَ: يَسَّرَ. هَوَّنَ/ ئاسانی كرد. سووكی كرد.

سَـهَّلَكَ مَهِّـدَ. سَـوّىَ/ تـەختی كـرد. ئاسـانی كـرد. ڕێكی خست.

سَهل: هَيِّن. بسيط. يسير/ ئاسان. سووك.

سَهل: مُسَطَّح. مُستَوٍ/ تەخت. ڕێك. تەختان.

سَهل الإنقيـاد: قـابِـل للتعلـيم والتطبيـع/ زوڕام ئەبێ. بە ئاسانی ڕایەت.

سَهل الخُلق: لَيِّنه/ نەرم. ڕووخۆش. ڕەوشت بەرز.

سَهل الوَجه: قليل اللحم/ کەم گۆشت.

سَهل الهَضم: خَفيف/ سووك هەرس. ئاسان هەرس.

سَهُمَ. سَهَمَ: بَهِتَ لونُه. هَزَلَ. تَغيّر لونُه/ ڕەنگی هەڵزڕکاو. تێکچوو. لاواز بوو.

سَهَمَ. سَهُمَ: عَبَس/ ڕووی گرژ کرد. مۆن بوو.

سَهم: نَبلة/ تیر.

سَهم: حِصّة. نصيب/ بەش. بەرکەوت.

سَهم: قِدح المَيسر/ پیاڵەی مەی.

سَهم ناري: صاروخ/ فیشەکە شێتە.

سَهم في شركة: حِصّة/ بەشداریێتی. بەش.

سَهو: غَفلة. عَدم إلتفات. عدم إنتباه/ بێئاگایی. سەهو. ئاگالێنەبوون.

سَهواً: عَفواً/ بەبێ ئاگا. بە سەهوو.

سَهوان: ساهٍ. غافِل. غير مُنتبِه/ بێئاگا. بێهۆش. کەمتەرخەم.

سَهوب: سَهب. فَلاة/ چۆڵ. بیابان. چۆڵەوانی.

سُهولة: سَهكة. سَهك. نَتانة/ بۆنی ناخۆش. بۆگەن. بۆنی ئارەقی لەش.

سَهولدواء مُسهل. مُلَيِّن/ ڕەوانکەر. دەرمانی ڕەوانی. قۆزکەر.

سُهُولة: هَون/ ئاسانی. سووکی. هاسانی.

سَهيان: شارِد الفكر/ بیر ڕۆیو. داڵغاوی.

سُهَيل: نَجم شديد السُطوع/ گەلاوێژ.

سَوَّأ: أفسَدَ/ خراپی کرد. تێکی دا. شێوانی. گێرەشێوێنی کرد. کردەوەی ناشیرینی کرد.

سَوَّأ عليه عَمَلَهُ: عابه ووَبّخه/ گاڵتەی پێکرد. سەرزەنشتی کرد. گاڵتەی بە ئیشەکەی کرد.

سَوّى الارضَ: جَعَلَها مُستوية/ تەختی کرد.

سَوّى بالارض: دَمّر. هَدَمَ. دَكّ/ ڕووخانی. ڕمانی. ڕ تەختی کرد.

سَوّى: رَتَّبَ. ضَبَطَ. عَدّلَ/ ڕێکی خست. ڕازاندیەوە.

سَوّى بَينَ: عادَلَ. عَدَّلَ. وازَنَ/ وەك یەکی لێکرد. خستیە یەك کێشەوە.

سَوّى: جَعَلَهُ مستقيماً/ ڕاستی کردەوە.

سَوّى نزاعاً أو خلافاً: أنهى. حَسَمَ/ کۆتایی بە ناکۆکی هێنا.

سَوّى بينَهُم: صالَحَ. وَفّقَ/ ڕێکی خستن. پێکی هێنان. ئاشتی کردنەوە.

سَوّى بِحَلٍ وَسَطٍ: وَفّقَ. عَمَل الرّاضي/ بە مام ناوەندێتی پێکی هێنان.

سَوّى: صَنَعَ. عَمَلَ/ دروستی کرد.

سَوّى: طَبَخَ. أنضَجَ/ لێی نا. کوڵانی. پێی گەیان.

سُوء: شَرّ/ خراپە. تاوان.

سُوء: إساءة. أذيّة/ خراپەکاری. خراپەکردن. زیانگەیاندن. ڕەفتار خراپی. بەدی.

سُوء الاستعمال: رداءة الاستعمال/ خراپ بەکارهێنان.

سوء التغذية: نَقصٌ في التغذية/ بەدخۆراکی. خراپ خۆری.

سُوء التفاهُم: وُجود خلاف/ ناکۆکی. ناڕێکی.

سُوء الحظ أو البخت أو الطالع: تعاسة. عدم توفيق/ بەدبەختی. بێ شانسی.

سوء السلوك أو التصرف: رداءة السيرة/ ڕەفتار خراپی. ناوزڕاو.

سُوء الظَنّ: وجود شك. ريبة. عدم ثِقة/ گومان کردن. بەدگومانی.

سوء الإدارة: فساد الإدارة. فساد الحُكم/ بەرەڵایی. ناپاکی لە بەڕێوەبردنی کاردا.

سُوء النيّة: سُوء لقَصد/ بەدنیهاد. نیازخراپی.

سوء الهَضم: عُسر هضم/ ترخه. گرفت.

سُوء: مَساءة. فَساد. العمل القبيح/ خراپە. کرداری ناشیرین و نابەجێ. بێنابڕوویی.

سُوء: نار/ ئاگر.

رَجُلُ سَوءٍ ورَجُل السَوء: ذو سُوء. فاسِد/ پیاوخراپ. بێنابڕوو. خراپەکار.

تقدير السَوء: تشاؤم/ ڕەشبینی.

مُقدِّر السَوء: متشائم/ ڕەشبین.

سِوىً: سواء. حاشا. عدا. غير. باستثناء/ بێجگە. جگە. جگە لە.

سَواء: متساويان. متساوون/ وەک یەکن. لەیەک ئەچن. چوونیەکن.

سَواء: تماثل. تجانس. مِثل/ لەیەکچوون. وەک یەک بوون. هاو.

سَواءَ: سِوى. باستثناء/ بێجگە. جگە. جگە لە.

سَواءٌ هذا أم ذاك: أيُّ الشيئين/ ئەمیان یا ئەو. کامیان. هەرکامیان.

سواءُ الجَبَل: ذروته/ بەرزایی و بڵندایی چیا.

سَواءُ النهار. سواءُ الليل: مُنتَصَفُه/ ناوەڕاستی ڕۆژ. ناوەڕاستی شەو.

هُمْ سَواء: سَواس. سَواسية. متساوون/ هەمووی وەک یەکن. بەیەک جۆر کردارییان لەگەڵ ئەکرێ.

على حدّ سَواء: بالتساوي/ وەک یەک. چوونیەک.

سَوابِق.. سابِقَة/ پێشینە

سَوءَة: عَورة/ شوێن شەرم. عەورەت. گەڵ و گون.

سَوءة: فاحِشة. عمل قبيح/ کردەوە و کرداری ناشیرین. خراپە. بەدی. گێرەشێوێنی.

سَواد: خلاف البَياض/ ڕەشی.

سَواد: ثَوبُ الحِداد/ بەرگی پرسە و ماتەمینی.

سَواد: الأكثرية. كَثرة/ زۆریە. بەشی زۆر. زۆرێتی.

سَواد: شَبَح/ تارمایی.

سَواد: مُسوَّدة/ ڕەش نووس.

سَوادُ الليل: طول الليل/ درێژایی شەو.

سَوادُ العين: الحَدَقة/ ڕەشێنەی چاو. گلێنەی چاو.

سَوادُ المدينة: ماحَولَها من الريف والقُرى/ دەوروبەری شار.

سَوادُ الناس: عامّتهم/ زۆریەی خەڵک.

السَواد الأعظم: الأكثرية/ زۆریە. بەشی زۆری خەڵک.

سُوار: سِوار، أسوار. حُلية تَلبَسُها المرأة في مِعصَمِها/ بازنگ. دەستەوانە. دەزبێنە.

سُوار الذراع/ بازبەند.

سُوار القميص/ سەرقۆڵ.

سَواس. سَواسيةٌ: سَواء/ وەک یەک.

هُم سَواسيةٌ أمام القانون: متساوون/ هەموویان وەک یەکن لە بەردەم یاسادا.

سَواف. سُواف: مرض هلاك المواشي/ دەردە ئاژەڵ.

سَوّاق: سائق: مُسَيِّر/ لێخوڕ. شۆفێر. ئاژۆتەر. ئاژۆەر.

سِواك: مِسواك. العود الذي تُنَظَّف به الأسنان/ سیواک.

سَوبَر: مَنصاف. شَجَر/ بی. داربی.

سَوِدَ: إسوَدَّ. صار أسوَد/ ڕەش بوو. ڕەش داگەڕاو ڕەش داگیرسا.

سَوَّدَ: صَيَّرَ أسوَد. جَعَلَهُ أسوَد/ ڕەشی کرد.

سَوَّدَ المكتوب: كَتَبَ مُسوَدَّة/ نووسیەوە. ڕەش نووسی کرد.

سَوَّدَ: جَعَلَهُ سَيِّداً/ گەورەی کرد.

سَوداء: أسوَد/ ڕەش. ڕەنگی ڕەش.

سَوداء: سُوَيداء: داء مَلنخوليا/ نەخۆشی ماخۆلان.

حَبَّة سَوداء: نبات/ ڕەشکە.

سودان: الجنس الأسود من البَشَر/ ڕەشپێست. زنج. قول. قولەڕەش. زەنگی.

سوداني: نِسبَةً الى بلاد السودان/ خەڵکی وڵاتی سوودان.

فول سوداني: فستق عَبيد/ فستق.

سَوداوي: مُصاب بمرض السَوداء/ ماخۆلاناوی.

سَودَل: شارِب/ سمێڵ.

سَوَّرَ حَوَّطَ/ دەوری گرت. پەرژینی کرد. دیواری بۆ کرد. شووورەی بۆ کرد.

سَوَّرَ المرأة: ألبَسها السُوار/ بازنی کردە دەست.

سُور: حائط/ دیوار. تەیمان. شووورە.

سُور: سياج/ پەرژین. شووورە.

سُور: مِتراس. خَندَق/ سەنگەر.

سَورَة: شِدَّة. حِدَّة/ گەرمە. توندوتیژی.

سُورَة: فَصل من كتاب/ بەشێك لە کتێب.

سُورَة من القُرآن/ سوورەتی قورئان.

سَوِسَ. سَوَّسَ. تَسَوَّسَ الطعام. وَقَعَ فيه السوس/ ئەسپێی هەڵهێنا. ئەسپێ و مۆرانەی تیا پەیدا بوو.

سوس: سوسَة. حَشَرَة. عَثّ/ مۆرانە. مۆریان.

سوس: نَبات/ بەلەك.

سوس. سوسة الحبوب: قَمل/ ئەسپێ. مێش.

سوس. سوسة الخشب: أرضَة/ مۆرانەی دار.

عِرق السوس/ ڕەگی بەلەك.

رُبّ السوس: شَراب عِرق السوس/ (شەربەت. دۆشاو)ی بەلەك.

سَوط: اداة يُجلَد او يُضرَب بها. مِجلَدَة/ قامچی. شەلاخ. شەلاق. جەڵدە.

سَوط: الضَرب بالسياط/ بە قامچی لێدان.

سَوط: زائدة شبيهة بالسَوط. زائدة كالذَيل/ کلك.

سَوَّغَ: أجاز. أباحَ/ ڕێیدا. شیانی. گونجانی.

سَوَّغَ: بَرَّرَ/ پاکانەی کرد. بیانوی هێنایەوە. خۆی پەڕاندەوە. پێدەی کردن پاسوخی دایەوە.

سَوَّفَ: ساوَفَ. ماطَلَ/ دوای خست. ئەمڕۆ بە سبەی کرد.

سَوفَ: س. سَ/ وشەی بەجێهانە لە ئایندەدا.

سَوَفان: إستهلاك/ سووان.

سَوَّقَ البِضاعَة: باعَها/ کەلوپەلەکەی فرۆشتن خستیە بازاڕەوە.

سَوَّقَ النَبتُ: صار له ساق/ ڕووەك ڕووا. قەدی کرد. لاسکی کرد.

سَوق: قِيادَة/ لێخوڕین. بەڕێوەبردن.

سَوق: نَقل. حَمل. إرسال/ ناردن. گواستنەوە.

إجازة سَوق: رُخصَة السياقَة/ مۆڵەتی لێخوڕین.

سُوق: مكان البيع والشِراء/ بازاڕ.

سوق الحرب: مَيدان القِتال/ گۆڕەپانی شەڕ.

سوق حُرَّة: البيع الحُرّ/ بازاڕی سەربەست.

سوق خَيرِيَّة: سوق المعونة/ بازاڕی خێرکەیەن.

سوق راكِدَة: كاسِدَة. راكِدَة/ بازاڕی نوستوو. مردوو. بێبازاڕی.

سوق سَوداء: التعامُل مع الخَفاء/ بازاڕی ڕەش.

سوق مستطارة: نَشيطة/ بازاڕ گەرم.

سوق النقد: العُمْلات/ بازاڕی دراو. بۆرسە.

سعر السوق: القيمة السوقية. القيمة الوقتية/ نرخی ڕۆژ.

سُوقَة: رَعاعه. دَهماء/ هەرچی و پەرچی. لات و لەوار. بازاڕی.

سوقي: عامي/ بازاڕی.

سَوَك الأسنان: نَظّفَها/ ددانی شت. پاکی کردەوە. سیواکی کرد.

سَوّل لـ. أغوى. أغرى/ هەڵیفریوان. فریوی دا. خەڵەتانی. دەستی بری. هەڵیخەڵەتان.

سَوّلَت له نَفسُهُ كذا: أغوَتهُ/ خۆی بە خۆی کرد. خۆی فریو دا.

سَوّمَهُ الأمرَ: فَرَضَهُ عليه. كَلّفَهُ إيّاه/ سەپانی بەسەریا. بە زۆر پێی کرد. کردی بە کوڵکیەوە.

سَوِيَ: إستقام/ ڕاست بووەوە.

سَوّى: ساوى. عادَلَ. بَلَغَ مقدارَهُ كذا/ هەڵیسەنگان. خەملاندی. نرخی بۆ دانا. ئەوەندە ئەهێنێ.

سَوِيّ: سليم. سالم. صَحيح/ ساغ. تەواوز کەم و زیادی نیە.

سَوِيّ: مستقيم. مُستوٍ/ ڕاست. تەخت. تەختان.

سَوِيّ: إعتيادي. عادي/ ئاسایی.

سَوِيّاً. سَوِيّةً: معاً/ پێکەوە. بە یەکەوە.

سَوِيّةً: تَساوٍ. مُساواة/ وەک یەک بوون. یەکسانی. چوون یەکی.

سُوَيداء: داء السَوداء/ ماخۆلان.

سَوِيق الحِنطة: الدقيق الناعم/ ئاردی سفر. زۆر ورد.

سَوِيق البُرغل: الدقيق الذي يخرج من البرغل عند نَخله/ ئاردە ساوەر. پەرخەنیلە. قاووت.

سُوَيق. سُوَيقَة: نَصل الوَرَقة/ لاسک. قنچک.

سَيِّء. سَيْء: رَدِيء/ خراپ. بەد. بێکەڵک. بێفەڕ.

سَيِّء التربية: غير مُهَذّب/ بەدپەروەردە. بەدڕەوشتز بێتەربیەت.

سيء الحَظ أو البَخت أو الطالع: نَحس/ بەدبەخت. بێبەخت. چارەڕەش. بێ شانس.

سَيِّء الخُلق أو الطبع: شَكس/ بەدڕەفتار. خوێڕی.

سيء السُمعة: مَشين/ بەدناو. ناوزڕاو. ناوبانگ خراپ.

سيء النيّة: سيء القَصد/ بەدنیهاد. نیاز خراپ.

سَيِّئة: إساءة. خَطيئة. ذَنب/ گوناه. تاوان.

سَيِّئة: ضد حَسَنة/ خراپەکردن. خراپەکاری.

سِياج: سور. حائط/ دیوار. پەرژین. تەیمان. شوورە. چەپەر.

سَيّاح: كثير السياحة. جَوّاب/ گەشتیار. گەڕیدە. شوورە. چەپەر.

سِياحة: سَفَر/ گەشت. گەڕان. سەیرانکردن.

سياحي/ گەشتیاری.

سِيادة: لَقَب الإحترام/ پایەبڵند. پایەبەرز. خاوەن شکۆ. بەڕێز.

سِيادة: تَسَلّط. سَيطرة/ دەسەڵات. زاڵبوون.

سَيّار: مُتَنَقِّل. مُتَحَرِّك. كثير السَير/ گەشتیار. گەڕۆک.

سَيّار. سَيّارة. قافِلة/ قافلە. کاروان.

سَيّارة: مَركَبة تَسير. بِمُحَرِّك/ ماشین. گەڕێن. ئوتومۆبیل.

سيارة اجرة: تاكسي/ کرێ. تەکسی.

سيارة إسعاف/ فریاگوزاری.

سيارة إطفاء/ ئاگرکوژێن.

سيارة شحن/ لۆری. بارهەڵگر.

سياسَة : حُسن الإدارة. فَنّ الحكم/ رامیاری.

سياسة : إدارة/ بەڕێوەبردن. ڕابەری. سەرەوکاری.

سياسة : تَدبير/ پیلان. نەخشە.

سياسة : حُسن الجوار/ رامیاری لەگەڵ دراوسێدا.

السياسة الدولية/ رامیاری وڵاتان.

سياسي : رجل السياسة/ رامیار. سیاسەتمەدار.

سياسي : متعلق بالأمور السياسية/ پەیوەندیدار بە رامیاریەوە.

سَيّاف : جَلاّد وَسَفاك الدماء/ خوێنڕێژ. پیاوکوژ.

سَيّاف : صاحِب السيف والمقاتل به/ شمشێر هەڵگر. جەنگاوەری شمشێر.

سَيّاف الدَولة : الذي يضرب الأعناق/ ملپەڕێن.

سَيّاف البَحر : سمكة بحرية. أبو سيف/ ماسی دەم شمێر.

سِياق : مَهر المرأة/ مارەیی.

سِياق (الحديث. الكلام) : مَجراهُ. صِلَة الكلام/ بە دەم قسەکردنەوە. لەناو گفتوگۆدا.

سِـياقَة : سَـوق. تَـسيير/ بـەڕێوەبردنی لێخوڕینی ئاژوتن. ڕاندن.

سَيّال : جارٍ. مِدرار/ لەبەرڕۆیو. نەوەستاو.

سَيّال : سائِل/ شل.

سَيّال : تَيّار. شديد السَيل/ خوڕ.

سِيّان : سَواء. شَبيه. مُماثِل/ لێچوو. وەکو. هاو.

سَـيَّبَ : تَـرَكَ. أهمَـلَ/ فەرامۆشـی کـرد. پـەڕاندی. پشتگوێی خست.

سَيَّبَ حَرَّرَ. أعتَقَ/ ئازادی کردن سەربەستی پێدا.

سَيبَة : مِرقاة. سُلَم/ پەیژە.

سَيَّجَ : أحـاطَ بـسياج/ (دیـوار. پـەرژین. تـەیمان. شوورە. چەپەری) کرد.

سيجار : لفافة تَبغ كبيرة/ چرووت.

سيجارة : خَضّان. لفافة تَبغ صغيرة/ جگەرە.

سَيَّحَ : أساحَ. جعلهُ يَسيح/ کردیەوە. بەریدایەوە. بەرەڵای کردەوە.

سَيَّحَ : أذابَ. صَهَرَ/ توانیەوە. شلی کردەوە. خاوی کردەوە.

سَيح. سَيحاً : أرض تُسقى بالماء الجاري/ زەوی بەراو.

سيخ : سَفود/ شیش. زرك.

سَـيِّد : مَـولَى. رَئـيس/ سـەرگەورە. فـەرمانڕەوا. سەرۆك. سەروەر.

سَيِّد : لقب كل رَجُل. لقب احترام/ کاك. سەردار. بەڕێز. سەروەر.

سَيِّد عند الاسلام : من كان من السُلالَة النَبَوية/ سەیید. سەیی.

سَـيِّدي : يـا سَـيِّدي/ گـەورەم. کاکـە. سـەروەرم. بەڕێز.

سَيِّدَة : لقب احترام للمرأة/ خانم. خاتوون. خان.

سَيِّدَة : إمرأة/ ژن. ئافرەتی بەشوو.

السـيدة العَـذراء : الـسيدة مَـريَم/ مریەمی دایکی عیسا.

سَيِّدَتي : يا سَيِّدَتي/ خانمەکەم. گەورەم. بەڕێز.

سَيَّرَ : مَشّى. جَعَلَهُ يَمشي/ ڕەوانی. پێی وت بڕۆ. بردی بەڕێوە.

سَيَّرَك حَرَّكَ. وَجَّهَ. قادَ/ لێی خوڕی.

سَـيَّرَ : شَـغَّلَ. أدارَ/ خستیە (ئیش. کـەر). ئیشی پێکرد.

سَـــيَّرَك أدار. تَـــوَلّى الإدارة/ بـــەڕێوەی بـــرد. سەرەوکاری کرد.

سَيَّرَ: دَفَعَ. دَسَّرَ/ پاڵی پێوەنا. پاڵی نا.

سَيَّرَك ارسَلَ/ ناردی.

سَيَّرَ: رَوَّجَ. دَرَّجَ/ بازاڕگەرمی کرد. ڕەواجی پێدا.

سَيَّرَهُ من المكان: أخرَجَهُ/ دەریکرد.

سَيْر: مَشي. تَحَرُّك/ ڕۆیین ڕۆیشتن. چوون.

سَيْر: تَقَدُّم/ پێشکەوتن. چوونەپێشەوە.

سَــير: حَرَكَــة المــرور/ بزوتنــەوەی هاتوچــۆ. هاتوچۆکردن.

سَــير الآلــة أو الماكنــة: تَــشغيل/ ئیــشپێکردن. خستنە (ئیش. کار).

سَــير: قِــدَّة مــن جلــد مستطيلة/ قــایش. چــەرم. سیرمە.

سَير: حِزام/ پشتێنی پشتوێن.

السَير خلال النوم/ بە دەم خەوەوە ڕۆیشتن.

سيراً على القَدَمَين/ ڕۆیشتن بەپێ.

سيرَة: سُلوك/ ڕەفتار. ڕەوشتی ڕەوشت و خوو.

سيرَة: حياة شَخص. تــاريخ حياتــه/ مێژووی ژیان. سەربورد.

سيرَة: سُنَّة. طريقَة/ ڕێباز.

سيرَة: سُمعَة/ ناوبانگ.

سيرَة: قِصَّة/ چیرۆک. ڕاز. داستان. بەسەرهات. سەربورد. سەرگوروشتە.

سيرَة: تاريخ/ مێژوو. ڕوودلو.

سيساء: عَمود فَقَري/ بربڕەی پشت.

سيسَبان: نبات/ سیسبان.

سَيطَرَ علــى: تَــسَيطَرَ. تَــسَلَّطَ/ زاڵ بوو. دەستی بەسەرداگرت. دەسەڵاتی وەرگرت.

سَــيطَرَة. تَــسَلُّط/ زاڵبــوون. دەستبەســەرداگرتن. کەڵەگایی.

سَــيطَرَة: سُــلطَة/ فــەرمانڕەوایی. دەســەڵات. ڕکێفە.

سَيِّع.. سائِغ/ دابڕێژەر. زەرەنگەر.

سَيف: حُسام/ شمشێر. شیر.

سَيف الحَصاد: مِقضاب/ کەرەنتو. داسی گەورە.

سَيف: سَيّاف. ابو سَيف: سَمَكَة بحريَـة/ ماسی دەم شمشێر.

سيف: ساحل البحر/ ڕۆخ. گوێ. کەناری دەریا.

سيفون: مَصّ/ مژەر. ڕاکێش. مژۆک. هەڵمژ.

سيفون المَجرى: مَثعَب. مَحبَس الـرواح في المجـاري/ گەڵ. سیفون. وشتر گەروو.

سَيِّل.. أسالَ/ ڕژا. لافاوهەڵسا.

سَيل: فَـيض: مـاء جـارِف/ لافاو. لێشاو. خوڕاو. لافاوی بەخوڕی لەمێ.

سَيل: وابِـل مــن الأسـئلة أو الرسـائل/ (پرسـیار. نامە)یەکی زۆر. بەلێشاو.

سَيل: سَيَلان. جَرَيان/ لەبەرڕۆیشتن.

سَـيَلان: ترشُــيح/ پـاڵاوتن. دەڵانــدن. لێــچوون. ئاودادان. لێتکان.

سَيَلان: مرض/ سووزەنەک.

سَيلَة: مَسيل. مَجرى/ ئاوڕێ. جۆگە. چەم.

سَيّما: لاسيَّما: خاصَّةً/ بە تایبەتی. نەخوازەڵا.

سيما. سيماء. سِيمَة: طَلعَة. مُحَيّا. هَيئَة/ دیمەن. ڕەزا. ئێسک. چارە. ڕوخسار. سەروسیمای ڕوو. سیما.

سيما. سيماء. سيمَه: عَلامَة/ نیشان. نیشانە.

سَيُولَة: ضد جُمودَة. مَيع. مُيُوعَة/ شل. شلێتی.

سَيُولَة: نَقد/ دراو. دراوی بەکارهێنراو. دراوێك کە بەکاربهێنرێ.



شاءَ: أراد/ ویستی. خواستی.

شـاءَ أم أبـي/ أراد أم لم يُـرِد/ بیـەوێ یـا نەیـەوێ. ویستی یانەی ویست.

إن شاءَ الله: بمشيئةِ الله/ خوابیکا. بە خواستی خوا.

إلى ماشاء الله: إلى الأبد/ تاهەتا. هەتاهەتایە.

ماشاءالله: ماأرادە الله/ خواکرد.

شائب: أشيَبَ. أبيض الشعر/ سەرسپی. پیر.

شـائبة: عَيـب. عِلّـة/ نـەنگی. شـووره‌یی. کەموکووڕی. خەوش. ناتەواوی.

شائع: مُنتَشِر. ذائع/ بڵاو. ئاشکرا. زانراو. باو.

شـائعَة: إشـاعَة. تَقَـوُّلات/ دەنگۆ. وتـەوات. قـاو. هـەیت و هـوت. تـەواتی. دەنگـۆ. بەدنـاوباو. بانگەشە.

شـائق: مُـشتاق. شَـهي/ سـەرنجڕاکێش. حەزجووڵێن. بەلەزەت.

شـائق: مُشتاق. تـائق/ ئارەزوومەنـد. تـامەزرۆ. پەرۆش.

شائِك: ذو شوك/ دڕکاوی. چقڵدار.

شائِك: صَعب. حَرِج. دقيـق/ ئاڵۆز. گـراز. گرفتار. شێواو. گران.

شائِن: مُشين. مُخزِ. مُعيب/ ئابڕووبەر. ئاوڕووبەر. ناوزڕێن. شووره‌یی.

شائه.. مُشَوَّه/ شێواو.

شابَ: خَلَطَ/ تێکەڵی کرد. دا بەسەریەکدا.

شابَكَ أفسَد. فَضَح. عـاب/ پیسی کرد. عەیبباری کرد. نەنگی کرد.

شابَ الشَعرُ: إبيَضّ/ تووک سپی بوو. سەر سپی بوو.

شـابَهُ: خانَـهُ وغَـشّهُ/ خەڵـەتاندی.ز هەڵیخەڵـەتان. دەستی بڕی. فێڵی لێکرد.

شابّ: فَتى. يافِع. مَن كـان في سِنّ الـشباب/ گەنج. لاو. دەستەکوڕ. هەرزەکار. نەوجەوان. نەوڕەس.

شابّة: فَتاة/ کچ. دەستە کچ. عازەب.

شابَكَ: تَداخَلَ بَعضُهُ في بَعض/ ئاڵۆزکا. تێکچوو. چوو بە ناویەکدا. چەواشە بوو.

شـابَكَ بـين الأصـابع: أدخَـل بعـضها في بَعـض/ پەنجەکانی کرد بەناویەکدا.

شـابَهَ: أشـبَهَ. مـاثَـلَ. ضـاهَى/ لەیەک ئەچن. لـەو ئەچێ. وەک ئەو وایە.

وماشـابه ذلـك: وأمثـالهم/ ئەوانـەی لـەو ئەچن. نەوی وا هەیە.

شُؤبوب: دَفقَة من المطر/ تاوەباران.

شُؤبوب: حَرّ الشمس/ گەرمای بەرخۆر.

شاة (الواحدة من الغنم. ذكر أو انثى): خروف/ مەڕ. پەز. کاوڕ. بەران.

شاة: نَعجَة/ کاوڕ. شەکەمەڕ.

شاتٍ. الشاتي: مُمطِر. شَتَوي/ زستانی. بارانـاوی. لە زستان ئەکا.

شاتَمَ: شَتَمَ. سَبَّ/ جنێوی دا. جوێنی دا. دژوێنی دا.

شـاتِم: شـتّام. سَبّاب/ جنێوفرۆش. دەم پیس. دەم شڕ.

شـاجَرَ: نـازَعَ. خاصَـمَ. تـشاجَرَ/ شـەڕی (کـرد. فرۆشت). چوو بە گژیا. یەخەی گرت. جەنگی.

شاحَ بالشيء عليه: شحَّ. بَخِلَ. تباخَلَ/ دەستی لێگرتەوە. لێی کەمکردەوە. لێی کرد بە دەسندە.

شاحِب: باهِت. مُتَغَيِّر اللون/ ڕەنگ پەڕیو. بزرکاو. زەردهەڵگەڕاو.

شاحِذ: سَنّان. مُجَلِّخ/ تیژکەر. چەرخچی.

شاحِذ: شحّاذ. مُتَسَوِّل/ سواڵکەر. دەروەزەکەر.

شاحِذة: آلة شحذ. مِسَنّ/ هەسان. بڕیند. مەکینە و چەرخی تیژکەر.

شاحِط: بَعيد/ دوور.

شـاحَنَ: شـاجَرَ. خاصَـمَ/ شـەڕی کـردن شـەڕی فرۆشت.

شـاحَنَك بـاغَضَ. بَغَضَ/ ڕقەبەرایەتی کرد. قینی گرت.

شاحِن: مُحَمِّل/ بارکەر.

شاحِن: مَشحون. موسوق. مُحَمَّل/ بارکراو.

شاحِن: ناقِل. واسِق/ باربەر.

شـاحِنة: حافِلَـة. عَرَبَـة كـبيرة/ لـۆری. قـارگۆن. بارهەڵگر.

شاحِنة. شاحِن. جهاز لِشحن البطارِيَة/ پڕکەرەوە. شاحینەی پاتری.

شاخ: هَرِمَ. شَيَّخَ. صار شيخاً/ پیر بوو. بەساڵاچوو.

شاخ: شَيَّخَ النبات أو الثمر. نَضَجَ ولَخْشَنَ/ پیر بوو. تۆوی کرد. کەوتە تۆو. ڕەق بوو.

شاخِصٌ بِبَصَرِه: مُحَملِق. مُتَطَلِّع. مُتَفَرِّس/ چاوتێبڕ.

شـاخِصُ المهنـدس: قـائمـة خـشبيَة/ دارنیـشانی ئەندازیار. چەلاک.

شـادَ البنـاءَ: شَـيَّدَ. بَنـى. رَفَـعَ/ دروسـتی کـرد. دایمەزران. هەڵیسان. بەرزی کردەوە.

شادَ الحائطَ بالشيد: طلاه/ سواخی دیواری دا.

شـادَّ: خاصَمَ. شـاحَنَ. شـاجَرَ/ بەربەرەکانی کـرد. چوو بە گژیاز دەمقاڵی کرد.

شادٍ. الشادي: مُغَنٍّ/ گۆرانیبێژ. سترانبێژ.

شادِن: وَلَد الظَّبي/ بەچکە ئاسک.

شـادِه: مُـذهَل. مُـدهَش/ سەرسوڕمێنەر. شلەژێن. سەرسامکەر.

شادوف: أداة لرفع المياه/ ئاوسەرخەر.

شادِيَة: مُغَنِّيَة/ گۆرانیبێژی ئافرەت.

شاذّ: غير قياسي/ ئاوازە.

شاذّ: مخالف القاعدة والمألوف/ ناباو.

شاذّ: غير إعتيادي. خارق العادة/ نائاسایی.

شاذّ: إستثنائي/ هەڵاوێژیاری.

شاذّ: غريب/ نامۆ.

شاذّ: نادِر/ دەگمەن. دانسقە.

شاذّ: مُنحَرِف/ ناتەبا. وەرگەڕاو. خوار. لار.

شاذّ: غير قانوني/ نایاسایی.

شـاذّ الطبـع أو الأطـوار: فُوَيت. مُنفَـرِد بِرَأيِـه/ کەللەڕەق. خۆویست. تایبەخۆ.

شار. الشاري: مُشتَرٍ. مَن يَشتَري. مُبتاع/ کڕیار.

شار: قَضيب الصاعِقَة. مانِعَة الصواعِق/ برووسکەبڕ. برووسکەکوژ.

شارَبَ: شَرِبَ مَعَ/ لەگەڵی خواردیەوە.

شارِب: مَن يَشرَب/ ئەوەی ئەخواتەوە.

شـارِب. شـاربان: شـوارِب. شَـنَب/ سمێڵ. سمبێل. سوێڵ.

شارَة: عَلامَة. رَمز/ نیشانە.

شارِح: مُوَضِّح. مُفَسِّر/ ڕاڤەکار. توێژەرەوە.

شارد: هارب. ضالّ. تايه/ ڕاکردوو. هەڵهاتوو. بەلەسە. ونبوو. دەربەدەر.

شارد الفكر أو الذهن: شارح/ خەیاڵبەدەو. خەیاڵاوی. ڕۆیشتوو.

شاردة: لاتفوته شاردة ولا واردة: لاينسى ولايفوته شيء/ هیچی (بیرناچێ. لێ تێکناچێ).

شارط: إشترط. عيّنَ شرطاً/ مەرجی (دانا. کرد. لەگەڵ کرد).

شارع: مُشرّع. مُتشرّع. واضع القوانين/ یاسادانەر.

شارف على.. اشرفَ.

شارَفَ: فاخرَ في الشرف/ شانازی بە ئابڕووەوە ئەکرد. خۆی هەڵئەکێشا.

شارَكَ في: إشترك مع/ هاوبەشی کرد. بەشداریتی کرد. بەشی تێخست.

شارك في: إشترك في/ بوو بە ئابوونە.

شارَكَهُ في العواطف: مال اليه وعطف عليه/ بەزەیی پیاهاتەوە. دڵی پێسووتا. هاوبەشی خەمی کرد.

شارَكَهُ رأيَهُ: إتفق م في الرأي/ بیروباوەڕەکەی سەلماند.

شاسع: واسع. كبير/ فراوان. گەورە. پان و بەرین.

شاسع: بعيد/ دوور.

شاش: نسيج قطني رقيق/ شاش. مەندیل. کەتانی تەنک.

شاشة: لوحة عرض الصُوَر المتحركة/ پەردەی سینەما.

شاطَ به الغضبُ. إشتشاط. إشتعل/ توورە بوو. ڕقی هەڵساز ئاگری ئەکردەوە.

شاطَ الطعامُ: إحترق/ خواردنەکە سووتا. هەڵکزا.

شاطىء: شطء. ساحل/ ڕۆخ. کەنار.

شاطَرَ: ناصَفَ. قاسَمَ مُناصَفَةً/ کردی بە دوو بەشەوە.

شاطَرَكَ شارَكَ. ساهَمَ/ بەشداریکرد.

شاطَرَهُ رأيَهُ: ساهَمَ في رأيه/ بەشداری بیروباوەڕەکەی کرد و سەلماندی.

شاطَرَهُ حُزنَهُ: تعاطف معه. رَقّ له/ دڵی پێی سووتا. بەشداری خەمی کرد.

شاطر: داهية. مُحَنّك/ چالاک. چابوک. وریا. چاوەمار. زرنگ.

شاطر: خبيث/ فێڵباز. ساختەچی.

شاطر: مُقسِم. مُنصِف/ لەتکەر. دابەشکەر.

شاعَ الخَبَرُ: ذاعَ. إنتشرَ/ هەواڵ بڵاوبووەوە. ئاشکرابوو. ڕاگەیەنرا.

شاعَ الخَبَرَ: أشاعَ. أذاعَ. نشرَ/ هەواڵی بڵاوکردەوە. ئاشکرای کردن ڕایگەیاند.

شاعَ فيه الشيبُ: إنتشرَ/ مووی سپی تێکەوت.

شاعَهُ: تَبِعَهُ ورافقه/ شوێنی کەوت. لەگەڵی ڕۆیشت.

شاعر: ناظم الشعر/ هۆنەر. بوێژ. شاعیر.

شاعر بـ: يَحُسّ بـ. يُدرك/ هەستیار.

شاعري: خيالي. رواني/ خەیاڵاوی.

شاغَبَ: أحدث شَغَباً. هَيَّجَ الشرّ/ (گێچەڵ. ئاژاوە. پشێوی) نایەوە. گێرەشێوێنی کرد.

شاغِر: خالٍ. فارغ/ بەتاڵ. بۆش. چۆڵ.

شاغل: مَن يَشغل منزلاً/ نیشتەنی. جێگیر.

شاغور: شلّال/ تافگە. ڕێژگەو. ڕێژاو. سوولاو. ئاوشار.

شافٍ: قاطع. مُقنع. مُرضٍ. بات/ وەڵامی بە مەبەستی کۆتایی هێنەر پەسەند.

جَوابٌ شافٍ: قاطع/ وەڵامی یەک لایی کەر.

شافة: أصل/ بنەڕەت. ڕەگ. ڕەگ و ڕیشە.

شـائِلَة: القُرحَـة في أسفل القـدم/ برين و بزمـاره و مێخەکەی بنی پێ.

شائِلَة: عَداوَة/ دوشمنایەتی.

إستاصل شأفَتَهُ: أزالَهُ من أصله/ ریشەکێشی کرد. لە بن دەری هێنا. لە ڕەگ و ریشە دەریهێنا.

شافِع.. شَفيع/ تکاکار.

شـافَهَ: خَطَـبَ فـاهُ إلی فيـه/ دەم بـە دەم دووان و قسەیان کرد. دەمیان نابوو بە یەکەوە.

شـاقَ الی: إشتـاقَ إلی. حَنَّ الی. أظهر الـشوق. تـاقَ/ بیری کرد، ئارەزووی کرد. بۆی بە پەرۆش بوو.

شاقَهُ شَوْق. حَمَلَهُ علی الـشوق/ سـەرنجی ڕاکێشاو هەژانی. ئارەزووی جوڵان.

شــاقَ الــشيءَ: نَــصَبَهُ مُــستَنِداً إلی الحــائط/ هەڵیپەسارد.

شاق: صَعب. مُرهِق. مُتعِب. عسير/ گران. شەکەتکار. دژوار. سەخت. دوخشار.

أشغال شاقَّة/ کاری گران و سەخت و بە ئەرك.

شاقول: ميزان أو فادن البَنَّاء/ شاووڵ.

شاقولي: عَمودي/ ستوونی.

شاكَ: وَخَزَ. نَخَسَ/ پیاچەقان. پیاکرد.

شاك: مُرتـاب/ بـە گومـان. دوودڵ. دڵ کرمـێ. دڵ پیس.

شاكُ السِلاح. شـاكٌ في الـسلاح: لابِـس سلاحاً تـامـاً/ پڕچەك.

شــاكٍ. الــشاكي: مُـشتَكي/ داواکـەر. سـکاڵاکەر. شکاتکەر.

شاكِر: شكور. مَن يَشكُر. مُمتَن/ سوپاسکار. پێزان.

شـاكَسَ: شـاجَرَ. خاصَمَ/ شـەڕی فرۆشت. گـرژی کرد. ڕقی گرت.

شاكَلَ: ماثَلَ. شابَهَ/ لێچوو. لێی چوو. لەو چوو. وەکو ئەو بوو.

شاكِل. شاكِلَة: شَبَه. هَيئة. صورَة/ شێوە.

فيه شاكِلَةٌ من أبيه/ شێوەی باوکی تیایە.

شاكِلَة: الطريقة المذهب/ ڕێباز.

شاكِلَة: خاصِرَة/ تەنیشت. لا. قەبرغە.

شالَ: إنشال. إرتَفَعَ/ بەرزبووەوە. هەڵچوو.

شالَ: أشالَ. رَفَعَ. حَمَلَ/ بەرزی کردەوە. هەڵیبڕی.

شـالَت نَعامَتُهُ: غَـضِبَ ثـمَّ سَكَنَ/ ڕقـی هەڵـسا و دامرکایەوە. ڕقەکەی نیشتەوە.

شالَت نَعامَةُ القَوم: أخلوا منازلهم وتَفَرَّقوا/ ماڵیان بەجێهێشت و بڵاوبوونەوە.

شـالَت نعامَـةُ القَـوم: تفرقـت كلمَـتهم/ بڵاومیان لێکرد. تێکچوون. لەناو خۆیانا.

شال: رداء الأكتاف/ دەسماڵ. کۆڵوانە. شاڵ.

شامَ: ظَهرت في جلده شامَة/ خاڵی دەرکرد.

شــامَ في الــشيء. شَـئِم: دخَـلَ فيــه/ چـووە نـاو شتەکەوە. خۆی پیاکرد.

شــامَ الــشيءَ في الــشيء: خَبَـأَ فيــه/ چـووە نـاو شتەکەوە. خۆی پیاکرد.

شـأَمَ: جَـرَّ عليـه الـشُؤم/ بـەدیهێناز بەدبـەختی و شومی گرتی.

شُؤم: ضد يُمن/ بەدبەختی. بەدی. شوم.

شامَة: خال/ خاڵ.

شامَة: حاسَّة الشَمّ/ هەستی بۆنکردن.

شـامِت: حَسود. فَرِح ومُبتَهِج ببَلِيَـة الآخرين/ بـەد. ئەوەی بە خەمی یەکێکی تر شاد ئەبێ.

شامِخ: عالٍ/ بەرز. بڵند.

شـامِخ: مُتَشامِخ. مُتَكَبِـر/ لووت بەرز. تـەرزل. پـۆح زل. بەفیز. بایی. خۆبەزل زان.

شامِس. مُشمِس. شَمِس/ هەتاو. سایەقە. کەوەرێژ. بێ هەور.

شامس: شموس. حَرون/ کەللەڕەق. سەرسەخت. سەرکەش. قیرسچمە. لاسار. سەرکێش.

شامل: جامع. کامل. کُلّي. عام/ گشتی. گشتگر. هەموان ئەگرێتەوە.

شامل: مُشتمِل على. حاوٍ/ تیایەتی. پێکهاتووە لە. بریتیە لە.

شانَ: وَصَمَ. عابَ/ گاڵتەی پێکرد. شکانی. ئابڕووی برد. تێزی پێوەکرد.

شأن: مَسألَة. أمر. حاجَة/ کار. کێشە. کاروبار. پێویستی.

شأن: غَرَض/ ئارەزوو. مەبەست.

شأن: طبع/ خوو. ڕەوشت.

شأن: حال/ چۆنیەتی. بار. دۆخ.

شأن: علاقَة. صِلَة. دَخل/ پەیوەندی. پێوەندی.

شأن: مَنزِلَة. مَقام. إعتبار/ پایە. پلە. شوێن جێ و ڕێ.

شأن: أهميَة/ بایەخ. گرنگی.

ذو شأن: هام/ گرنگ. بایەخدار. بە بایەخ. پایەدار.

ذو الشأن. صاحِب الشأن: مَعني/ خاوەن مەبەست.

بشأن: فيما يَخُصّ/ دەربارەی.

أنت وشأنك: إعمل ماتشاء/ خۆت و ئارەزووت. ئارەزووی خۆتە. کەیفی خۆتە.

ليس من شأنك/ لايَخُصك/ ئیشی تۆ نیە. پەیوەندی بە تۆوە نیە. کاری تۆ نیە.

ماشأنك: ماذا تُريد/ چیت ئەوێ.

ماشأنك: ماحالُك/ لە چیدای. بارودۆخت لە چیدایە.

من شأنه كذا. من طَبعه/ ئەمە ڕەوشت و خوویەتی. ئەوەی لێ ئەوەشێتەوە.

على شأن. علَشان. منشان. لأجل/ بۆ. لەبەر. لەبەر خاتری.

غضّ من شأنه: حطّ من قدره أو مقامه/ بێبایەخی کرد. لە نرخی کەم کردەوە.

ترکه وشأنه: تَخلّى عنه/ وازی لێهێنا بەرەڵای کرد. دەستی لێهەڵگرت.

في هذا الشأن: في هذا الخصوص/ لەم ڕووەوە. لەم بابەتەوە. لەم بوارەدا.

شأنهُ ذلك شأنُ: لهُ باعٌ/ دەستی ئەڕوا.

شانق: جلّاد/ کوژەر. پیاوکوژ. جەلاد

شاه: إمبراطور/ پاشا.

شاه: من قطع الشطرنج/ شای شەترەنج.

شاه: بلوط: کستنة/ کەستەنە.

شاهترج: نبات/ شاتەرە.

شاهد: رأى. راقب. حضَر/ بینی. بە چاوی خۆی بینی لەو شوێنەدا بوو.

شاهِد: مَن يُدلي بشهادة. من يَحضر أو يوقع عقداً. من شاهد شيئاً/ شایەت. گۆڤان.

شاهد: بَيِّنَة. دليل/ بەڵگە.

شاهد: إقتباس. إستشهاد/ پەنابردنە بەر قسەیەك. ڕووداوێك.

شاهد: مَثَل. نُموذَج/ نموونە.

شاهد: بَلاطَة الضريح/ بەردی سەرگۆڕ. کێل.

شاهد: لسان/ زمان. لە دەم دەرچوون.

شاهد إثبات/ شایەتی جێگیر.

شاهد دفاع/ شایەتی بەرگری.

شاهد سمع. يُقال/ ئەڵێن. شایەتی کە بڵێ بیستم. بیستوومە.

شاهد عَين. عياني/ بەچاوبین. بینەر. بە چاوی خۆی بینی.

شاهد نفي/ شایەتی ناجێگیر.

شاهد زُور: كَذَّاب. أفَّاك/ شايەتی درۆ. درۆزن.

شاهدة: شاهد. بَلاطَة الضريح/ كێل. بەردی سەرگۆڕ.

شاهَرَ: إستأجر بالشهر/ بە مانگانە گرتی.

شاهق: مُرتَفِع/ بەرز. بڵند. گەردن كەش.

شاهوق. سعال ديكي/ كۆكەڕەشە.

شاهيّة: شهيّة. قابلية/ دڵ بردن.

شاهيّة: طلب النفس. حركة النفس. رَغبَة/ ئارەزوو. داواكردن. حەزكردن.

شاهين: صقر. باز/ شاهۆ.

شأن: أمَد. شوط/ ماوە. كات.

بعيد الشأن: ناظر لبعيد/ دووربین. بیر لە دوور ئەكاتەوە.

بعيد الشأن: عالي الهِمّة/ بەرزخواز. بەخۆناز.

جَرى شأواً: قَطَع شوطاً/ ماوەیەكی بڕیوە.

شاوَرَ في: إستشار. طلب المشورة/ ڕاوێژی كرد. پرسی كرد.

شاي: المشروب المعروف/ چا. چای. چایی.

إبريق الشاي/ قۆری. كتلی. كتری.

حفلة شاي/ قوبولێ. سووكە دانیشتن.

شايخ: ضد غضّ/ پیر. تۆوكردوو.

شايخ: مُتَزَعِم/ كەڵەگاز كەڵە.

شايَع: شايَعَهُ. تابَعَهُ. أيدَ. تَحَزَّبَ/ شوێنی كەوت. برشوای پێكرد. چووە پاڵی.

شايَع: شَيَّعَ. رافَقَ مُودعاً/ بە ڕێی كرد.

شَبَّ. اشَبَّ: صار فَتياً/ گەورە بوو. پێگەیی. گونی كرد. بيوو بە لاو.

شَبَّ: إرتَفَعَ/ بەرزبووەوە. هەڵچوو.

شَبَّ الحصانُ: رَفَعَ يَدَيه/ هەر دوو دەستی بەرزكردەوە. ئەسپ هەستایە سەر پاشو. هەڵسڵەمیەوە.

شَبَّ الشيء: زَيَّنَهُ/ ڕازاندیەوە.

شَبَّ النارَ أوقَدَها/ ئاگری كردەوە. دایگیرسان.

شَبَّ النارُ والحربُ: إتَّقَدَت/ ئاگر و جەنگ هەڵگیرساز داگیرسا.

شَبَّت فيه النار: إحترَق/ ئاگری تێبەربوو. ئاگری گرتز سووتا.

من شَبَّ الى دَبَّ: من الشباب الى الدَبّ على العصا/ لە لاویەوە بۆ پیری و بە دار ڕۆیشتن.

شَبّ: شاب. فَتى/ گەنج. لاو. لاڵ. لەومند.

شَبّ. شَبَب: عجلٌ كبير/ پارێنز گوێرەكەی گەورە.

شَبّ: حجر الشَبّ. ملح معدني/ زاخ.

محلول الشَبّ/ زاخاو.

شَبُّ الليل: نبات مُزهر/ لالعباس.

شباب: شُبّان. نَشء. من سنّ البلوغ الى الثلاثين. فُتُوَّة/ گەنج. لاو. سێرە و تەمەنی لاوێتی و گەنجێتی.

جَدّد شبابَهُ: تصابى/ خۆی گەنج كردەوە.

تَجَدّد شبابُهُ: رَجَع شاباً/ گەنج بووەوە.

حَبُّ الشباب: حَبُّ الصبا الدهنية/ عازەبە.

شَبّابَة: مزمار/ زوڕنا.

شُباط: فبراير. الشهر الثاني الميلادي/ مانگی شوبات. ڕەشەمێ. چلە.

شُبّاك: نافذة/ پەنجەرە.

شُبّان. شباب/ لاوان. لاو. گەنج.

شَبَّبَ. تَشَبَّبَ/ خۆی گەنج كردەوە. خۆی بەگەنج دانا.

شَبَب: شَبّ: عجل كبير/ پارێن. گوێرەكەی گەورە.

شَبَّة الفرس: وقوف الفرس على مُؤخِرَتِه/ هەستانە سەر پاشو.

شَبَّة: شابَّة. فتاة/ كچ. دەستە كچ. عازەب.

شَبَت: نبات/ شوێت.

شَبِثَ بـ. تَشَبَّثَ بِـ/ هەخۆساز. ماستاوچی.

شَبِث. رَجُل شَبِث. مُتَشَبِّث. طَبعُهُ التَشَبُّث/ خۆهەڵواس. چنۆکە. چلێس.

شَبَث: منكبوت/ جاڵجاڵۆکە.

شَبَث. شَبَت. نبات/ شوێت.

شَبَحَ الشيءَ: مَدَّهُ. مَدَّدَهُ/ درێژی کرد. رایکێشاز پاڵیخست.

شَبَحَ الرَجُلَ: مَدَّ يَدَيه/ دەستی درێژ کرد. دەستی پانکردەوە.

شَبَحَ الرَجُلَ: مَدَّهُ/ پاڵیخست. بۆ دارکاری.

شَبَح. شَبح: شخص/ زەلام. کەس.

شَبَح. شبح: خيال/ تارمایی. خێو. سوێس.

شَبَحُ الحَرب: مَخاوف الحرب/ مەترسی. مەترسی جەنگ.

شَبحَة: قَيد. أصفاد/ کۆت.

شَبَرَ. شَبَّرَ: قاس بالشِبر/ بە بست پێوای. بە بست گرتی.

شِبر: مابين طَرَفَي الإبهام والخنصر مُمَدَّين/ بست. بنگوست.

شَبر: مَهر/ مارەیی.

شَبر. شَبرَة: عَطيَّة/ بەخشین. بەخششیش.

شَبر: خَير/ بەخشین. خێرکردن. چاکە.

شَبرَقَ: طَقَّعَ ومَزَّقَ/ لەتلەتی کرد. لەتوکوتی کرد. ونجڕونجڕی کرد.

شَبرَقَ الموسَى على الجلد: سَنَّهُ/ گوێزانی بە قایش تیژکرد. لە قایش دا. هێنای بە قایشدا.

شِبرِق: وَلَد الهِرَّة/ بێچوە پشیلە.

شِبِب: خُفّ. مَشايَة/ سوڵ. نەعل.

شَبِعَ من الطَعام: تَمَلأ. ضد جاعَ/ تێر بوو. تێری خوارد. مر بوو.

شَبِعَ من أمر: مَلَّ. إلتَقَى/ بێزار بوو. لەبەرچاوی کەوت. لێی تێر بوو.

شَبَّعَ: اشبَعَ: جَعَلَهُ يَشبَع/ تێری کرد. مری کردن

شِبَع. شَبع. شَبعَة: قدرما يُشبِع/ تێرکەر. تێرمخۆر. ژەمێکی تێروتەسەل.

شِبَع. شَبع: إمتلاء. إكتظاظ. إكتفاء/ تێربوون. تێرخواردن. مربوون.

شَبعان: ضد جائع/ تێر. مر.

رَجُل شَبعان: غَني/ بەرچاوتێر.

شَبِقَ: إشتَدَّت شَهوَتُهُ. غَلِمَ/ زۆربەمێ. بە ئاڵۆش. چلێس. قازرە؟ گانکەر.

شَبَق: شَهوَة. غُلمَة/ ئارەزوو هەڵسان. ئارەزووکردن. شارەزووی گان و پەڕین.

نور الشَبَق: طلب الأنثى للذكر. عِلَّة حُبّ الجماع/ داواکردنی مێ بۆ نێر. با. بە باهاتن. هاتنە (با. قاڵ. کەل). تکەگرتن.

شَبَك. شَبَك.. شابَكَ/ پێکاهەڵپژان.

شَبَكَ الفتاةَ: خَطَبَها/ خوازبێنی کچی کرد. داوای کرد. نیشانەی کرد.

شُبُك: غليون/ سەبیل. پایپە.

شَبَكَة: شراك/ تۆڕ.

شَبَكَة: حبالَة. أحبولَة/ تەڵە. داو. تەپکە. فاقە.

شَبَكَة: قَرابَة/ خزمایەتی. خوێنشایەتی.

شَبكَة. هَديَّة الخُطبَة/ نیشان. نیشانە.

شَبكي: مُشَبَّك. مُتَشابِك/ ئاڵۆزکاو. بەیەکاچوو. تەنراو. لە شێوەی تۆڕدا.

شَبَكيَّة: شَبَكيَّة العَين/ توێژی تۆڕی چاو.

شَبَلَ الغُلام: نَشَأَ وتَرَعرَعَ وشَبَّ في نِعمَة/ بە نازداری بەخێوکراو گەورە بوو.

شَبِلَ الغُلام: نَشَأَ عِندَهُ/ لای ئەو بەخێوکراو پێگەیی.

شَبَكَت المرأةُ على أولادها: قامت عليهم بعد وفاة زوجها/ به بێوەژن كۆشی مندالەكانی بەخێوكرد.

شِبل: وَلَد الأَسَد/ بەچكەشێر.

شَبَّ الغلام: صار شابّاً (ناعماً مُمتلئاً)/ خڕوخەپان بوو.

شَبَّهَ بـ. شَبَّهَهُ إيّاه. سَبَّهَهُ به: مَثَّل بـ. مَثَّلَهُ به/ شێوەی ئەوی لێكرد. بەوی زانی. لەو ئەچوو.

شُبِّهَ عليه الأمر: لُبِّسَهُ عليه/ سەری لێتێكدا. چەواشەی بوو. كەوتە گومانەوە. لێی بە گومان بوو.

شَبَه. شِبه: بَهان. شِبهان. نُحاس أصفر/ زەرد. براس.

شَبَه. شِبه: تَشابُه. مُشابَهَة/ لێكچوون. وێچوون. وێكچوون. هاوشێوەیی.

شِبه: شَبيه. مثيل/ لێچوو. هاو. هاوشێوە.

شِبه: الى دَرَجَة كبيرة. كَأَنَّهُ. تقريباً/ لەیەكچوونی تەواوی. جیاناكرێنەوە.

شِبه جَزيرة/ نیوەدوورگە. نیمچە دورگە.

شِبه جَريمة/ سووكە تاوان. گەنگە تاوان.

شِبه جُملة/ كەرتە ڕستە.

شِبه منحرف/ نیمچە لاتەریب.

شِبه رسمي/ نیمچە ڕەسمی.

شَبهان. شِبهان: شَبَه. شِبه. نُحاس أصفر/ زەر. براس.

شُبهَة. إشتباه. إلتباس. شَكّ/ گومان. گومان (لێ) كردن.

تَحتَ الشُبهَة: مَشبوه/ گومانی لێ ئەكرێ. جێگومان. سڵی لێ ئەكرێتەوە.

شُبوب: إنـــدلاع/ داگیرســـان. هەڵگیرســـان. كڵپەكردن.

شُبور: بُوق. نَفير/ شەیپوور. كەرەنا.

شَبّوط: سَمَك/ سووورەماسی.

شَبيبَة: شَباب. نَشء/ گەنج. لاو. هەرزەكار.

شَبين: إشبين. من يقوم بِخِدمَة العريس/ برازاوا.

شَبينَة: إشبينَة: المرأة التي تقوم بخدمَة العروس/ بەربووك.

شَبيه بـ: مثل. مُماثِل/ وەكو. هاو. هاو (شێوە. چەشن. جۆر. وێنە..).

شَتَّ: تَشَتَّتَ. تَفَرَّقَ/ بڵاوبووەوە. پەرش بوو. جیابووەوە. توونا بوو. تەفروتوونا بوو.

شَتَّ: شَتَّتَ. أشَتَّ. فَرَّقَ/ بڵاویكردەوە. پەرشی كرد. جیای كردەوە. تەفروتووناى كرد.

شَتّ: مُشَتَّت. مُتَشَتِّت. مُتَفَرِّق/ بڵاو. جیاجیا. پەرش. تەفروتوونا. پەرەوازە.

شَتّ: تَشَتُّت. تَفَرُّق/ بڵاوبوونەوە. بڵاوملێكردن. پەرش بوون. جیابوونەوە.

شَتّى: مُتَنَوِّع. مُختَلِف. أنواع/ هەمەجۆر. جیاواز. هەرەمە.

اشياءُ شَتّى: اشياء مُتَنَوِّعَة/ شتومەكی هەمەجۆر. زۆر چەشن.

شَتا. شَتّى: تَشَتّى. أقام الشتاء في المكان/ لە شوێنەكەدا مایەوە. جێگیر بوو. نیشتەنی بوو.

شِتاء. شَتاة. شَتوَة. أحد فصول السنة. من ٢١ الاول الى ٢١ آذار/ زستان. زسان. زڤسان.

شِتاء: شَتا. قَحط/ قات و قڕی.

فاكِهَة الشتاء: النار/ ئاگر.

شِتائي: شَتَوِي. شَتوي: مُختَصّ بالشتاء/ زستانە. زستانی.

شَتات: تَشَتُّت. تَفَرُّق/ بڵاوبوونەوە. بڵاوملێكردن. پەرش بوون. جیابوونەوە.

شَتات: شَتّ. مُشَتَّت. مُتَفَرِّق/ بڵاو. جیاجیا. پەرش. تەفروتوونا. پەرەوازە.

شَتّام. شَتّامَة: كثير الشتم. سَبّاب/ جنێوفرۆش. دەم شڕ.

شَتّام. شَتّامَة: السيء الخُلق/ بێنابڕوو. تڕۆ.

شَتّان: بَعُد. شَتّان. بَعُد بينهما/ زۆر دووربن لە یەکتری. زۆر جیاوازن.

شَتَّتَ: فَرَّقَ. بَدَّدَ/ بڵاویکردەوە. جیایکردەوە. پەرشی کرد. تەفروتووناى کرد.

شَتَرَ: قَطَعَ/ بڕی. پچڕی. دڕی. دڕانی.

شَتَرَ العَينَ: قَلَبَ جِفنَها/ چاوی هەڵگێڕایەوە.

شَتَلَ: زَرَعَ/ نەمامی چاند. نەمامی گواستەوە.

شَتل. شَتلَة: غَرسَة. غَريسَة/ شەتڵ. نەمام.

شَتَمَ. شَتْمَ: سَبَّ/ جنێوی دا. جوێنی دا. دژوێنی دا.

شَتم. شَتيمَة: مَسَبَّة/ جنێودان. جوێندان. دژوێندان.

شَتم: سَبّ/ جنێو. جوێن. دژوێن.

شَتوَة: مَطرَة. دَفعَة من المطر/ تاومباران.

شَتوِي: شَتوِي: مُختَصّ بالشتاء/ زستانە. زستانی.

شَتيت: مُشَتَّت. مُتَشَتِّت. مُتَفَرِّق/ بڵاو. جیاجیا. پەرش. تەفروتوونا. پەرموازە.

شَتيمَة: مَسَبَّة/ جوێن. جنێو. دژوێن.

شَثِلَت. شَثُلَت أصابِعُه: خَشُنَت وغَلُظَت/ پەنجەکانی زبر و ئەستوور بوو.

شَجّ: كَسَرَ. شَقَّ/ شکانی. ترنجانی.

شَجٍ: شَجِي. حزين. مهموم/ خەمناک. دڵگیر.

شَجا.. اشجى/ دڵتەنگی و بێزاری.

شَجا: حُزن. غَمّ/ خەم. خەفەت. پەژارە. دڵگیری.

شَجا: ماعارض في الحلق/ ئەوەی لە قورگ ئەگیرێ. لە بین گیران.

شَجا: عاطفَة/ سۆز.

شَجابك مشجب. شَمّاعَة/ هەڵواس. بەرگ هەڵواس.

شِجاب: سِدادَة القارورة/ سەرقاپ. دەمەوانە. دەمبەست.

شَجّار: زارع الأشجار/ دار ڕوێن.

شِجار: مُشاجَرَة. عراك/ دەم قاڵی. شەڕ. جەنگین.

شِجار: سَقّاطَة الباب. مِزلاج. تِرباس/ ئەڵقەڕێز. کلۆم.

شِجارَة: زِراعَة الأشجار/ دار ڕواندن.

شُجاع. شِجاع. شَجاع: جريء. مِقدام/ ئازا. مەرد. نەبەرد. بێ پەروا. جوامێر. دلێر. دلاوەر. گوستاخ. چاونەترس. بەزات.

شَجاعَة: إقدام. جرأة/ ئازایەتی. جوامێریو زات. نەترمش.

شَجَبَ: إستنكر/ ناڕەزایی دەبڕی. بێزاری پیشاندا.

شَجَبَ: سَدَّ/ سەری نایەوە. دەمەکەی داخست. سەرەکەی گرت.

شَجَبَ: اشجَبَ. أحزن/ دڵگیری کرد. خەفەتباری کرد. خەمی دایە. پەژارەداری کرد.

شَجب: إستنكار/ ناڕەزایی. بێزاری.

شَجَب: شُجوب: حُزن/ خەم. پەژارە. خەفەت. دڵگیری.

شَجَّة في الرأس: كَسر. جِراحَة/ برین و شکاوی لەسەر.

شَجَرَ ما بينهم: تَشاجَروا. تَنازَعوا/ تێکچوون. دەم قاڵیان بوو.

شَجَّر: حَرَّجَ. زَرَعَ الأشجار/ درەختی ڕووان. چەقان.

شَجِر: مُشجِر/ داریۆش. چڕە. دارستان.

شَجَر. شَجَرَة: نبات خشبي عال/ درەخت.

شَجَر: نبات/ کوولەکە.

شَجَرَة: واحدة الشَجَر/ درەخت. درەختێک. دار.

شَجَرَة عقيمة/ داری بێبەر. زڕ. پەرك.

شَجَرة مُثمِرة/ بەردار.

شَجَرة العائلة. شجرة النَسَب. سلسلة النَسَب/ ڕەگەزنامە. سەجەرەی خێزان.

شَجَري: مُختَصٌ بالأشجار/ شارەزا و پسپۆڕی دار و دارستان.

شَجَري: يعيش في الأشجار والغابات/ دانیشتوی دارستان.

شَجُعَ: كان شجاعاً/ ئازا بوو. نەترس بوو. بە غیرەت بوو.

شَجَّعَ: عَضَدَ/ یارمەتی دا. پشتگیری کرد. باریوی کرد.

شَجَّعَ: حَرَّضَ/ هانیدا.

شَجَّعَ: قَوّى الأمل/ هیواداری کرد. هیوای بەهێزکرد.

شَجِع.. شُجاع/ ئازاو قارەمان.

شَجِعة: رَجُل شَجِعة وشَجعاك طويل مُضطَرِب/ درێژی شلەپەتێ.

رَجُل شَجِعة وشِجعة: عاجِز جبان/ ترسنۆک و بێغیرەت.

شَجَنَ. شَجَنَ: أشجَنَ. أحزَنَ/ دڵگیری کرد. خەفەتباری کرد. پەژارەداری کرد. خەمی دایە.

شَجَنَ. شَجِنَ: تَشَجَّنَ. حَزِنَ/ دڵگیر بوو. خەفەتی خوارد. پەژارەدار بوو. پەست و خەمگین بوو.

شَجَن. شُجون: أشجان. هَمّ. حُزن/ خەفەت. داخ. خەم. پەژارە. دڵگیربوون.

شَجَن: غُصن. فرع/ لق.

شَجو.. شَجا/ ناخۆشی و خەفەت.

شَجِيَ: حَزِنَ/ دڵگیر بوو. خەفەتی خوارد. پەست بوو. خەمناک بوو. پەژارەدار بوو.

شَجِيَ: حَزِنَ/ دڵگیر بوو. خەفەتی خوارد، پەست بوو. خەمناک بوو. پەژارەدار بوو.

شَجِيّ: حَزين. مهموم. قَلِق/ خەمناک. دڵگیر. پەست و شپرزە. پەژارەدار.

شَجِيّ: مثير الشجون. مثير للعاطفة/ هەست جوڵێن.

شَجِيّ: مَشغول البال/ سەرقاڵ. شپرزە.

شَجِيّ: رَخيم. مُطرِب. عَذب/ خۆش. دەنگی خۆش. هەست جوڵێن.

شَجير: صاحِبٌ رَديء/ هاوڕێی خراپ.

شَجير.. مُشجَّر/ داستاناوی.

شَجيرة: جُنَيبة. شَجَرة صغيرة/ دەوەن.

شَجيع.. شُجاع/ ئازا.

شَحَّ: بَخِلَ. تَباخَلَ/ کەمی کردەوە. دەستی گرتەوە. لێی گرتەوە. ڕژدی کرد.

شَحَّ: تَضاءَلَ. قَلَّ/ کەم بووەوە.

شُحّ. شِحّ: بُخل/ پیسکەیی. ڕەزیلی. ڕژدی.

شُحّ. شِحّ: قِلّة. نُدرة/ کەمی. دەگمەنی.

أيامُ الشحائح: جَدب. جَفاف/ بێ ئاوی. بێ بارانی. وشکە ساڵ.

شَحّ: شحاح. شَحيح. بَخيل/ چرووک. ڕژد. دەخەس. پارەپیس. ڕەزیل. چکوس. شتێن. دەست قوچاو. پیسکە. نان کوێر. قەمتەر. پوولەکی. لەچەڕ.

شَحّاذ: مُتَسَوِّل/ سواڵکەر. دەروەزەکەر.

شَحّاذ العَين: شَعيرة أو دُمّل الجفن/ سیچکە سلاوە. قنچکە سلاوە. باپشکێو.

شِحاذة: تَسَوُّل/ سواڵکردن. دەروەزەکردن. سواڵکەری. دەست پانکردنەوە.

شَحاطة: حذاء يُلبس في البيت/ سۆل پاپوچ. پانی بەرز.

شَحَبَ. شَحُبَ. شَحَبَ وَجهُهُ او لونُه : تَغَيَّر/ ڕەنگ و ڕووی پەڕی. بزڕکا. گۆڕا. تێکچوو. سپی هەڵگەڕا.

شَحَذَ : اشحَذَ. سَنَّ. جَلَخَ. احَدَّ/ تیژی کرد. لە هەسانی دا. لە قایشی دا.

شَحَذَ : تَسَوَّلَ. إستجدى/ سواڵی کرد. دەروزەی کرد. دەستی پانکردەوە.

شَحَذَهُ بِبَصَرِه : أحَدَّهُ اليه ورماه به/ چاوی تێبڕی. بە چاویەوە کرد. کردی بە چاوەوە.

شَحذ : سَنّ. جَلخ/ تیژکردن. دەمەزەرنکردن. لە هەساندان.

شَحَرَ : سَخَّم. سَوَّدَ بِسَوادِ الدُخَان/ هێس (گرتی. ی لێ نیشت). دووکەڵی گرت. ڕەش بوو.

شَحرور. شُحرور. طائر اسود اكبر من العصفور/ ڕەشۆڵە.

شَحَطَ. شَحِطَ المكانُ : بَعُدَ/ دووروکەوتەوە. دوور بوو.

شَحَطَهُ : سَبَقَهُ وتباعَدَ منه/ پێشی کەوت. لێی دوورکەوتەوە.

شَحَطَهُ على الارض : سَحَبَه/ ڕایکێشا. خشانی.

شَحَط عود الثِقاب : أشعَلَه/ شقارتەی داگیرسان.

شحط : مِشحَط : عود يُرفَع عليه الكرم/ کۆڵەکەی مێو. دەستەک.

شحطة. شحيطة : عود الثقاب/ دەنکە شقارتە.

شحطة : شرطة ( - )/ داش.

شَحَلَ الكَرم : قَضَب. قَطَعَ اغصانَهُ ونَقّاه/ مێوی بڕی.

شَحُمَ : كَثُرَ شَحمُهُ/ بەز و چەوری زۆر بوو.

شَحَمَ الآلةَ : زَيَّتَها. دَهَنَها/ چەوری کرد.

شحم : دُهن/ ڕۆن. چەوری.

شحم : الابيض من لحم الحيوان/ پیو. بەز.

شحم المكائن/ گریز.

شحم الثمر : لُبّه/ کرۆک. دەنک. کاکڵە. گۆشت.

شَحِمَ : شَحيم. كثير الشحم/ چەور. قەڵەو. پڕبەز.

شَحمَة : قطعة الشحم/ پارچە بەز. پیو. دوگ. چەوری.

شَحمَة الاذن : الجزء اللين من الاذن/ نەرمەی گوێچکە. چیچیلە. لیلۆک.

شَحمَة الارض : كَمأ/ دومەڵان.

شَحمَة العين : مُقلَتُها/ گلێنە. گلێنەی چاو. بیبیلە. بیلبیلە.

شَحَنَ : اشحَنَ. ملأ/ پڕی کرد. دووری خستەوە.

شَحَنَ السفينة او السَيارة. مَلأها/ باری کرد. باری لێنا.

شَحَنَ البَضائع : ارسلها/ کەلوپەل نارد.

شَحَنَ البَطاريَة : ملأها بالشحنة الكهربائية/ پڕی کردەوە. بارگەی دا.

شَحِنَ عليه : حَقَدَ عليه/ ڕقی لێهەڵگرت. کینەی لێکرد.

شحن : مَلء/ پڕکردن. پڕکردنەوە. لێکردن.

شحن السفينة او السَيارة : ماشُحِنَ به/ بار. بارگە.

شحن البَطارِيَة : مَلئها/ پڕکردنەوەی پاتری.

سَيارَة شحن. سيارة نقل البضائع/ لۆری. تومبێلی بار.

شحناء : مُشاحَنَة. شَحنيَة. عَداوَة. حِقد/ دوشمنایەتی. کینە. ڕقەبەرایەتی.

شَحنَة. شِحنَة. حِمل. حمولة/ بار. بارگە. کەلوپەل نێرراو. بارونە.

شحنَة : شحنة كهربائية/ بارگەی کارەبایی.

شحنَة : شرطة. بوليس/ پۆلیس.

شِحنَة : شحناء. مُشاحَنَة. عَداوَة. حقد/ دوشمنایەتی. کینە. ڕقەبەرایەتی.

شحُوب: إصفرار اللون وتغيره. إمتقاع الوجه/ ڕەنگ پەڕین. زەرهەڵگەڕان. هەڵبزركان.

شَحيح: بَخيل/ پیسكە. پارەپیس. چروك. ڕژد. دەخس. ڕەزیل. چكوس. شتێن. دەست قوچاو. نان كوێر. قەمتەر. پوولەكی.

شحيح: ضئيل. قليل/ كەم. نەخت.

شحيم: سَمين/ قەڵەو. چەور.

شَخَّ: بالَ/ میزی كرد.

شَخَّ في النوم: غطَّ/ پرخانی. پرخەی هات.

شَخَبَ: سالَ وتَدَفَّقَ/ ڕژا. فیچقەی كرد. بەر بوو. هەڵقوڵی.

شَخب: دَم/ خوێن.

شَخب: شُخب. شُخبَة: مايَخرُج من تحت الحالب عند كل عَصرَةِ الضَرع/ شیری گوان گوشینێك لە كاتی دۆشیندا.

شَخبَطَة في الكتابة/ نووسینی تێكەڵ و پێكەڵ. شەرە پشیلە.

شَختور. شَختورة: بَلَم. زورق/ بەلەم. كەشتی.

شَخَرَ: غطَّ. صاتَ من حَلقه أو فَمه/ پرخەی هات. پرخانی. پرمەی هات.

شَخشَخَ: خَشخَشَ. صَلصَلَ/ خشەی هات. ورشەی هات.

شَخشَخة: خَشخَشة. جَلجَلَة/ خشەخش. ورشە. تەق و هوڕ.

شَخشيخة: لُعبَة للأطفال/ شەقشەقە.

شَخَصَ الشيءُ: إرتَفَعَ. طَلَعَ/ بەرزبووەوە. هەڵسا. هەڵچوو. دەركەوت. ئاشكرا بوو. هەڵهات.

شَخَصَ بَصَرُهُ وببَصَره: رَفَعَهُ/ چاوی كردەوە. چاوی هەڵهێنا.

شَخَصَ (عن من) بَلَدِه: ذَهَبَ/ وڵاتی بەجێهێشت. كۆچی كرد. ڕۆی.

شَخَصَ الى بلده: رَجَعَ/ گەڕایەوە. هاتەوە.

شَخَّصَ: عَيَّنَ/ دیاردی كرد. دۆزیەوە. ناسیەوە.

شَخَّصَ الطبيبُ المرض: عَيَّنَهُ. حَدَّده/ پزیشك نەخۆشیەكی دۆزیەوە.

شَخص: إنسان/ مرۆڤ. زەلام. كەس.

شَخص: سواد الانسان تَراه من بعيد/ تارمایی.

شَخص غير مرغوب فيه: لايُستَحَبّ/ كەسێكی نەویستراو.

شَخصٌ ما: أحَدُما. واحد/ كەسێك. هەركەسێك.

شَخص مَعنوي. وَهمي/ كەسی خەیاڵی. پەیكەر. دەسكرد.

شَخصي: ذاتي. خُصوصي. خاص/ تایبەتی.

شَخصياً: بالذات/ هەر خۆی. كەسەكە خۆی. هەمان كەس.

شَخصيَّة: ذاتيَّة/ كەسایەتی. خۆیەتی. خودی. كەساتی.

شَخصيَّة بارزة: ذو شأن/ كەسایەتی ناودار. گرنگ. زانراو. ناسراو.

شَخصيَّة مَعنَويَّة: وَهميَّة/ كەسایەتی واتایی.

شَخير: غَطيط. الصوت من الحلق أو الأنف/ پرخە. پرخاندن. پرخەپرخ. خرین.

شَخير: كثير الشَخير/ ئەپرخێنێ. پرخەی دێ. مرخن.

شَخيص: جَسيم/ كەتە. زەلام. زەبەلاح. چەتەوڵ. تەراح. دێوی.

شَدَّ: وَتَّرَ. ضد أرخى/ (توند. تونگ. قایم)ی كرد. جەڕانی.

شَدَّ: رَبَطَ. أوثَقَ. أحكَمَ/ بەستی. بەستیەوە. گرێی دا.

شَدَّ: جَذَبَ. سَحَبَ. جَرَّ/ ڕایكێشا.

شدّ أزرَه. شدّ من أزرِه. شدّ على يَدِه: أعانَه/ یارمەتی
دا. دەستی یارمەتی بۆ درێژ کرد. پشتگیری
کرد.
شدّ عَضُدَه: قوّاه/ بەهێزی کرد. غیرەتی نایەبەر.
شدّ على: ضغط/ دەستی پیانا. پەستاوتی.
گوشی.
شدّ الرِحالَ: سافَرَ/ رۆی. سەفەری کرد. کۆچی
کرد.
شدّ الحِزام: إقتَصَد/ پشتێنی بەست. دەستی
گرتەوە.
شدّ: تَوتير. ضد إرخاء/ (توند. تونگ. قایم)
کردن. چەرانن.
شدّ: رَبط/ بەستن. بەستنەوە. گرێدان.
شدّ: سَحب. جَرّ/ راکێشان.
شدّ الرِجال: سَفَر/ رۆیشتن. کۆچکردن.
سەفەرکردن.
شدّ الحَبل: لُعبَة جَرّ الحَبل/ گوریس کێشەکێ.
شدا: غَنّى. فَرَدَ/ گۆرانی وت. جریوانی.
خوێندی.
شدائد: شِدَّة. ضیق. عُسر/ تەنگانە. تەنگ و
چەڵەمە.
شدّة (المرّة من شدّ): سَحبة جَرّة/ راکێشانێك.
شدّة: نَبرَة الصَوت/ زمان گرتن. زمان گوشین.
شدّة: رَبطة. حِزمَة/ پێچرا. دەسە. گورزە. قول.
شِدّة: قُوَّة/ هێز. توانا. زەبر. تین. تاو. قرچە.
تەشق.
شِدّة: عُنف/ توندوتیژی. دڵرەقی. زەبروزەنگ.
شِدّة: صَلابَة/ رەقی.
شِدّة: بَليَّة/ بەلا. کارەسات. تەنگ و چەڵەمە.
کۆستکەوتن. ناڕەحەتی.

شِدّة: ضیق/ تەنگانە. تەنگ و چەڵەمە.
نەداراییی.
شدَخ. شدَغ: كَسَرَ/ شكانی. سەری شكان.
شدّد على: أكّدَ. رَكّزَ على. أبرَزَ/ دووبارەی کردەوە.
وتیەوە.
شدّد على: ضَيّقَ على. ضَغَطَ على/ تەنگی
پێهەڵچنی. زۆری لێکرد.
شدّد على: تَشَدّدَ في. كان قاسياً صارماً/ دڵرەق و
بێبەزەیی بوو.
شدّد (على. في): أصَرّ. ألَحّ/ سوور بوو لەوسەر.
پێی داگرت. پێی دا بە زەویدا. قیرسچمە بوو.
شدّد: قوّى. جَعَلَهُ أكثر حِدّةً/ (توند. تونگ. قایم)ی
کرد. چەرانی.
شدّد الحَرف: نَقيض خَفّفَه/ پیتەکەی گران کرد.
چەرانی.
شدّد الضَرب: بالَغَ فيه/ تونگ تر پیاکێشا. زیاتر
لێی دا.
شدَف: المَيلُ في الخَدّ. إلتِواء في الرأس/ مل خوار.
خواری و گێری لە ڕووومەت و سەردا.
شدفة: قِطعَة/ پارچە. کوت.
شِدق. شُدق: زاويَة الفَم/ ناو ڕووومەت. ناو گووپ.
شەویلك. لالقاو.
شدَهَ: أشدَه. أدهَشَ وحَيّرَ/ سەری سووڕمان.
سەرسامی کرد. شڵەژانی. وڕی کرد.
شده. شده. شَدَه: الحيرة والدَهَش/ سەرسووڕمان.
سەرسامی.
شدْو: غِناء. تَغريد/ گۆرانی. خوێندن. ئاواز.
جریوە.
شدید: قَويّ. عَنيف. حادّ/ بەهێز. بەتوانا. بەتین.
تیژ. توندوتیژ. ڕەق. دڵرەق. سەخت.
شدید: بَخيل/ رژد. بەرچاوتەنگ.

شـديد البـاس: شـجاع. جَـسور/ ئـازا. بەجـەرگ. جەربەزە. چاونەترس.
شديد: الأسد/ شێر.
رَجُل شديد العَين: لايَغلِبُهُ النوم/ خەوقايم. ئانوێ. ناخەوێ. خەونايباتەوە.
شذَّ عَن الأحوال والأصوُل: خالَفَها/ ناوازەیی کرد. لە ئاسایی لایدا. پێچەوانەیی کرد. سەرپێچی کرد.
شذَّ عن الجماعَة أو الجمهور: نَدَر عنهم وإنفرد/ لە ئاسایی کۆمەڵ لایدا.
شذَّ. شذوذ/ ناوازە. لەرێزدەرچوو.
شذا: تَطَيّبَ بالمِسك/ بۆنی لە خۆی دا. خۆی بۆن خۆش کرد.
شذا: أريج. عُطر. عَبير. رائحة زكية/ بۆنی خۆش. بۆن و بەرامەی خۆش. عەتر.
شذاة: ذُبابَة مرض النوم/ جۆرە مێشولەیەکە. تس تس.
شـذبَ. شـذّبَ: قَلَّـمَ. قطـع الاطـراف الزائـدة/ هەڵیپاچی. توێکڵ و لقی زیادەی لێکردەوە.
شذب: تقليم. قطع الاطراف الزائدة/ هەڵپاچین. لق و پۆپ کردن. بڕینی لقە زیادەکان.
شذَب: متاع البيت/ کەلوپەلی ناوماڵ.
شذر الشيء: أدخل بين أجزاءه/ شتی تری تێخست. تێهەڵکێشی کرد.
شذر: شذرة: لؤلؤة صغيرة. خرَز/ مرواری. مورو.
شذر مذر. شذر مذر: خلط ملط/ تێکەڵ و پێکەڵ.
تَفرّقوا شذر مَذر أو شِذر مِذر: ذهبوا كل في وجهه/ هەریەك بە لایەكدا بڵاوەیان لێکرد.
شذو: مسك. رائحة المسك/ بۆنی عەتر. بۆنی مسك. بۆنی خۆش.

شذّ: شذّ. مُخالَفة القاعدة والأصول/ نائاسایی. ناوازەیی. بەدەربوون لە دام و نەریت.
شـذّ جنـسي. شـذّ. إنحـراف/ نائاسـایەتی لـە سەکسدا.
شرّ: إتّصفَ بالشرّ. اي منه الشرّ/ شەری (لێ) ئەباری. شەرفرۆش بوو. پیاوخراپ بوو.
شرّ: عابَ وازدرى/ گاڵتەی پێکرد. لاقرتێ پێکرد. سووکی کرد.
شـرّ الثـوب. شـرّرَ. وَضَـعَهُ في الـشمس لتجِـف/ هەڵیخست لەبەر خۆر بۆ وشکبوونەوە.
شرّ: نقيض الخَير/ شەر. بێحەیایی. خراپە. زیان.
شرّ: إثم/ گوناه. تاوان. گۆتاوەروو.
شـرّ: سُوء. سُوء الخُلق/ خراپە. خراپی. بەدی. بەدرەوشتی. بەدخویی.
شرٌ من: اكثر شرّا. اسوا/ خراپتر.
هُوَ شرُ النـاس. هُم شِرار وأشرار وأشِرّاء النـاس: اكثـرهم شـرّاً/ ئـەوە پیاوخراپەکـە. ئـەوانن پیاوخراپان. شەرفرۆشان. زیانگەیەنن.
شرَىَ: إشتَرَى. إبتاعَ/ کڕی. ساندی.
شـرَى. شـرِىَ: عـرَض الـشمس/ هەڵیخست. خستیە بەرخۆر.
شرى: طَفَحٌ جلدي يُسبب حكاكاً/ بیزۆ. زیپکەی تەر.
شراء: شرىَ: إبتياع/ کڕین.
شراب: مَشروب. كا مايُشرَب/ خواردنەوە.
شراب: شرباب. مَشروب حُلو/ شەربەت. خۆشاو.
شراب مُسكر: خمر/ مەی. بادە. سەرخۆشکار.
شـرّاب: شـرّابَة: شـروب. شـريب: كـثير الـشرب/ زۆرخۆرەوە. زۆر ئەخواتەوە.
شـرّابَة: رِسـاعَة. عَذبَـة. شـرّافَة/ گوڵنکـە. گێزوگوڵنك. پلپلە.

شرارة: مایتطایر من النار/ پریشك. پزیسك. کریسك.

شراسة: شَرَس. تَوَحُّش. حُبّ العراك والخصام/ دڕی. بە زبانی. زبانگەیەن. زبانەخوڕ.

شراشِب: هُداب/ ریشوە. ریشوو. ساجلخ. گێزوگولنك. پلپلە. گێلگێلە.

شِراع. شِراع المركب او السفينة: قِلع/ چارۆکە. بایەوان. چارۆکەی کەشتی.

شَرافَة: شُرابَة. رِساعَة. عَذبَة/ گولنکە. گێوگولنك.

شِراك. شريط الحذاء/ قەیتانی پێلاو.

شراکة: مُشارَکة. إشتِراك/ هاوکاری. بەشداری. کاربرایەتی.

شَراهَة: شَرَه. نَهَم/ چلێسی. هەلپە. زۆر خواردن. سك بەردان.

شَراهَة: شَرَه. جَشَع/ چاوبرسێتی. تەماع.

شَرِبَ: جَرَعَ/ خواردیەوە. نۆشی کرد.

شَرِبَ السجارة او الدُخانَ: دَخَّنَ التَبغَ/ کێشای. توتن و جگەرەی کێشا.

شَرِبَ نَخبَهُ: شَرِب لِصحّتِه/ نۆشی کرد. بەخۆشی ئەوەوە خواردیەوە.

شَرِبَ به: أشرَبَ به: كَذَبَ علیه/ درۆی لەگەڵ کرد. پێکرد. بە دەمەوە هەڵبەست).

شَرَّبَ: أشرَبَ. سَقَى. رَوّى/ ئاوی دا. ئاوی دەرخواردەدا. تێرئاوی کرد.

شَرَّبَ: أشرَب بسائل. نَقَعَ/ ئاوی مژی. تێرئاو بوو. پاراو بوو.

شَرَّبَ في الذهن: غَرَس في الذهن والنفس: لَقَّنَ/ دەرسی دادا. فێری کرد. تێیگەیاند. خستیە مێشکیەوە. مێشکی پڕکرد.

شَرّب: تَشَرُّب. إمتصاص/ مژین.

شُرب. شَرب. شِرب: جَرع/ خواردنەوە. نۆشین. نۆشکردن. هەڵقوڕان.

شَربَة: شُربَة. جُرعَة/ قوم.

شَربَة: دواء مُسهل/ دەرمان. دەرمانی ڕەوانی.

شِرّة.. شَر/ شەڕ. شەڕەنگێز.

شَرِثَت یَدُهُ: تَشَقَّقَت/ پێستی دەستی قڵیشا.

شَرَث: شَقْف. تَشَقُّف والتهاب جلدي/ قڵیشانی پێستی دەستز قڵیشاوی.

شَرث: الخَلَق من کل شيء/ کۆنە. شتومەکی کۆنە و بێکەڵك. سکراپ.

شَرَجَ. شَرَّجَ: جَمَعَ/ کۆیکردەوە. گردیکردەوە. خستیە سەریەك. کەڵەکەی کرد.

شَرَّجَ الثوبَ: سَرَجَ. خاطَهُ خیاطَة مُتباعِدَة/ بە تەقەڵی زل زل دیرووی. کۆکی گرت. تەربی دا. شەڵتەدرووی کرد.

شَرج. شَرَج: إست. بابُ البَدَن/ کۆم. قنگ. تریزە.

شَرَج: فُرقَة/ جیابوونەوە. دووبەرەکێتی.

شَرَج: نوع/ جۆر. هاو. وەکو.

شَرَج. شَرجَة: مَسیل الماء/ ئاوەڕۆ.

حُقنَة شرجیة/ دەستوور.

شَرَج: أنشوطَة/ گرێ. گرێ قوڵفە.

شَرَحَ: فَسَّرَ. بَیَّنَ/ لێکی دایەوە. ڕاڤەی کرد. توێژیەوە. ڕوونی کردەوە.

شَرَحَ: عَلّقَ الحَواشي علی کتاب/ پەراوێز نووسی کرد. لەسەر پەراوێز ڕاڤەی کرد.

شَرَحَ صَدرَهُ للشيء وبالشيء: سَرّه بِه. أراحَه/ دڵی پێکرایەوە. پێخۆشحاڵ بوو. گەشایەوە.

شَرَحَ. شَرّح لتحدید سَبَب الوفاة: فَحصَها/ لاشەکەی هەڵدڕی بۆ زانینی هۆی مردن.

شَرح: تَفسیر/ لێکدانەوە. لێکۆڵینەوە. ڕاڤەکردن. لێدوان.

شرح: تعليق الحواشي/ پەراوێز نوسین.

شرحة.. شريحة/ لابڕ. دەستە.

شَرَخَ الصَبيُّ: كَبُر. صارَ صَبياً/ گەورە بوو. هەڵچوو. پێگەیی.

شرخ: المثل أول الشباب وريعانه/ هەرەتی لاوی. تافی لاوی. سێرەی گەنجێتی.

شرخ: المثل والتراب/ وەك یەك. هاو (تەمەن. شێوە. جۆر).

شَرَدَ: نَفَر وهَرَبَ/ هەڵیتیزان. هەڵهات. بۆی دەرچوو. رایکرد.

شَرَدَ: ضَلَّ. تاهَ/ ونبوو. تەرە بوو.

شَرَدَ: هَرَبَ أفلَتَ/ پەلەسە بوو. خوێڕی بوو. ترازا.

شَرَدَ الفكر. شَرَد الذهنُ: سَرَحَ/ خەیاڵ بریەوە. خەیاڵی ڕۆی. بیری پەڕی.

شَرَدَ: أشرَدَ: هَجَر. هَرَبَ. نَفَر/ دەربەپەڕان. دەربەدەری کرد. پەرەوازەی کرد.

شَرَّدَ: فَرَّقَ. بَدَّدَ/ بلاوپکردەوە. پەرشی کرد. شێوانی.

شَرَّدَ: فَرَّقَ/ بلاوەی پێکردن. دووبەرەکی تێخستن. پەرشی کرد.

شِرذِمة: زُمرة. فِرقة. جماعة قليلة/ کۆمەڵ. دەستە. چەند کەسێك.

شَرِس: شراسة. تَوَحَّشَ/ دڕی. بەرزیانی. زیان گەیەن. زیانەخۆرۆ.

شَرِسَ: ساءَ خُلُقُهُ. تَوَحَّشَ/ هار بوو. خووی خراپ بوو. بەدخوو بوو.

شَرِس: شَرِيس. وَقِح. سيء الخُلق/ بەدخوو. بێئابڕوو.

شَرِس: ضارٍ/ دڕ. دڕندە. هار. بە زیان. زیانەخۆرۆ.

شرسوف: طَرَف الضلع/ کرکراگەی پەراسو. سەرەپەراسو.

شَرَشَ: سَنَّن/ دانی بۆ کرد. دانداربانداری کرد.

شَرَّشَ: مَدَّ جِذراً/ ڕەگی کرد. ڕەگی داکوتا.

شَرش: جِذر/ ڕەگ.

شرش اللبن: مَصله/ دۆوەو. سزك.

شرشف الفراش: مُلاءة/ سەرجێگە. چەرچەف. بەرگە (دۆشەك. سەرین. لێفە).

شرشف المائدة أو الطاولة: غطاء/ سەرمێز. سفرە.

شَرَطَ: إشتَرَطَ: عَيَّنَ شرطاً/ مەرجی (دانا. کرد. لەگەڵ کرد).

شَرَطَ: شَرَّطَ: خَدَش. بَضَعَ. شَقَّ/ ڕووشانی. نەشتەری لێدا.

شَرَط: عَلامة/ نیشان. نیشانە. خەت.

شرط (الجمع شروط): إلزام الشيء والتزامه/ مەرج.

شرط: إشتراط. تعيين الشروط/ مەرج دانان.

شرطاً أن. بشرط أن. على شرط أن/ بەمەرج. بەمەرجێك.

(بلا. دونَ. من دون) شرط/ بەبێ مەرج.

شرطة. شحطة: (-)/ خەت.

شرطة: بوليس/ پۆلیس.

دائرة الشرطة/ پۆلیسخانە.

ضابط شرطة/ ئەفسەری پۆلیس.

مُفَوَّض شرطة/ قۆمیسەر.

شرطة المرور/ پۆلیسی هاتوچۆ.

شرطة النجدة/ پۆلیسی فریا.

شرطي: رَجُل الشرطة/ پۆلیس.

شرطي: إشتراطي/ بەمەرج. مەرجاوی.

شَرَعَ: إشترَعَ: سَنَّ قانوناً/ یاسای دانا.

شَرَعَ: بَدَأَ/ دەستی پێکرد.

شَرَعَ. شَرَّعَ: صَوَّبَ. سَدَّدَ/ ئاراستەی کرد. پێوەی نا.

شَرَعَ في الأمر: خاضَ فيه/ خۆی خستە کارەکەوە. خۆی تێهاویشت.

شَرَعَ مَشروعاً: إختَطَّهُ/ نەخشەی پرۆژەی کێشا. بەرنامەی بۆ دانا.

شَرع: ماشَرَعَهُ الله لعِبادِه/ فەرمایشتی خوا. دابونەریتی ئاینی. شەرع. یاسا.

شَرع. شِرع: مِثْل/ وەکو. هاو.

شِرعَة: شَريعَة. قانون/ یاسا.

شِرعَة: عادَة/ دابونەریت.

شِرعَة: الطريق الى الماء/ ڕێگە بۆ ئاو. چوون بۆ ئاو. قەراخ ڕوبار.

شَرعي: قانوني/ یاسایی.

شَرعي: حَلال/ حەڵاڵ.

غير شَرعي: غير قانوني: حَرام/ نایاسایی. حەرام.

شَرعيَّة: قانونية/ یاساییانە.

لاشَرعيَّة: لاقانونية/ نایاساییانە.

شَرُفَ: كانَ ذا شَرَف/ خاوەن ئامووس و ئابڕوو بوو. بە تەنگ ئاوروسەوە بوو. بەشەرەف بوو.

شَرَّفَ: كَرَّمَ. عَظَّمَ. رَفَعَ مقامَه/ گەورەی کرد. پایەبەرزی کرد. شکۆداری کرد. ڕێزی لێنا.

شَرَف: كرامَة. مَجد. سُمُوّ. عُلُو/ ئابڕوو. ئامووس. ڕووسووری. سەربەرزی. شکۆ.

شَرَف: إستِقامَة. أمانَة/ دەست پاکی. سەرڕاستی. ڕاستی. ڕاستگۆیی.

شَرَف: عُلو الحَسَب/ خانەدانێتی.

شَرَف: فَخر/ شانازی. شەرەف.

عَضو شَرَف/ ئەندامی شانازی. ئەندامی شەرەف.

كَلِمَة شَرَف. كلام شَرَف/ قسەی پیاو.

شُرفَة: بَلكون/ تەلار. پێش هەیوان. شانشین.

شَرَفي: فَخري. إكرام/ شکۆدار. شکۆداری.

شَرَقَ. اشرقَ/ ڕۆژهەڵات. ڕۆژهەڵاتن.

شَرِقَ بِريقِه او بالماءِ: غَصَّ/ (تف. ئاو) لە بینی گیا. بە تفی خۆی وەختەبوو بخنکێ.

شَرَّقَ: إتَّجَهَ نحو الشرق/ ڕووی کردە خۆرهەڵات.

شَرَّقَ البناء طَيَّنَهُ بالشاروق/ دیواری سواخدا. تەپاوی کرد. سپیکاری کرد.

شَرق. مَشرِق: جِهَة شروق الشمس/ خۆرهەڵات. ڕۆژهەڵات. خاوەر.

شَرق: مَشرِق: بلاد الشَرق/ وڵاتانی خۆرهەڵات. خاوەرزەمین.

الشَرق الأدنى/ خۆرهەڵاتی نزیک.

الشَرق الاقصى/ خۆرهەڵاتی دوور. خاوەر زەمین.

الشرق الأوسط/ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.

شَرقاً: نحو الشَرق/ ڕووە و خۆرهەڵات. بەرەو خۆرهەڵات.

شَرقي: مَنسوب الى الشرق/ خۆرهەڵاتی. لە وڵاتانی خۆرهەڵاتەوە.

شَرقي: أحد ابناء الشرق/ خۆرهەڵاتی.

شَرَك: شَبكَة. احبُولَة/ تۆڕ. داو. تەپکە. فاقە.

شِرك: الإيمان بِعِدَّة آلِهَة او عبادتها/ شەریک بۆ خوا پەیداکردن.

شَركَة. شِركَة: عمل جماعي على اساس حِصَص/ کۆمپانیا. کاریرایەتی.

شَرَمَ: شَقَّ/ قلیشانی. دایهێنا. دایدڕی. قلیشی (تێبوو. تێکرد).

شَرم: عَمَل شَقّ. تَفليق/ قلیشاندن. داهێنان. دڕز (بردن. تێبوون).

شَرم: شَقّ. شِق/ قلیش. دڕز.

شرم: خليج/نۆکەند. کەنداو.

شـرنقة الـدودة: فيلجـة. صـلجة/قوزاخـه. قـاوخ. سارمه. پیلە.

شرانق: جلد الحية/کاژی مار.

شرِهَ (إلى أو على): إشتدّ ميلهُ. نَهم/چلێس بوو. نۆری خوارد. چاوبرسێتی نواند.

شرَه: جشَع/تەماع. چاوبرسێتی.

شرِه: نَهِم/چلێس. زۆرخۆر. قارزە. چەڵماس.

شـرِه: جَشِع/بە تـەماع. تـەماعکار. چاوبرسـی. چاوچنۆك. چاوچلێس.

شُرو. شرُو: عَسَل/هەنگوین.

شروَى: مِثْل/وەکو. هاو.

لايَملـك شـروى نَقـيرٍ: لايَملـك شيئاً/هیچی نیە. قنچکی نەنکە خورکایەکیشی نیە.

شـروب: شـريب. صـالح للـشُرب/بـۆ خواردنـەوە ئەشێ. دەست ئەدات.

شـروب: شِـرّيب. كـثير الـشُرب/زۆر خۆرەوە. زۆر ئەخواتەوە. حەز لە خواردنەوە ئەکا.

شرود.. شارِد/ئاوارە.

شرُد: هَرَب. ضَلال/ڕاکردن. هەڵهاتن. هەڵتیزان. ونبوون. دەربەدەربوون. پەرەوازەبوون.

شرُ والفِكر أو الذِهن: سَرحان الفِكر/خەیاڵبردنەوە. بیرۆچوون.

شروع: بَدء/دەستپێکردن.

شروق. شروق الـشمس: بـزوغ. طُلوع/بەیان. کاتی خۆرهەڵاتن. گرنگدان. هەڵهاتن.

شـری: حَنظَل. نبـات مُر/گوژاڵە. گوژاڵە. تاڵکە. زرکەتاڵ.

شـريان. شـريان (واحـدة الـشرايين): عِـرق نـابِض/خوێنبەر.

شريان أورطي أو أبهر/شاخوێنبەر.

شريان تـاجي/خوێنبەری دڵ.

شريان رئوي/خوێنبەری سی.

شـريب: شـرُوب. صـالح للـشُرب/بـۆ خواردنـەوە ئەشێ. دەست ئەدات.

شـرّيب: شـروب. كـثير الـشرب/زۆرخـۆرەوە. زۆرئەخواتەوە. حەز لە خواردنەوە ئەکا.

شريحة: قِطعَة مستطيلة/تویَ. پارچەی لاکێشی.

شريحة: قِطعَة لحم/پل. کوتەگۆشت.

شريحة المكروسكوب: زُجاجة/شووشەی سلاید.

شريحة من شرائح المجتمع: قِسم. قِطاع/توێژ.

شريد: مُتشرِد. مُشرَّد. تـائـه/ دەربـەدەر. ڕەهەندە. لانـەواز. دەرکـراو. بـەرەڵا. هـەڵهاتوو. بەلەسـە. ئاوەکی تەرا.

شـرّير. شـرّير: ذو شـرّ. مُـؤذٍ/بـەزیان. زیانـدار. زیانگەیێن. دەروون ڕەش.

الشرير: إبليس/شەیتان.

شريس: شرِس: وَقِح. سَيّء الخُلق/بەدخو. بێئابڕوو. دڕ.

شريس: شِراس. صَمغ/سرێش.

شريط: حَبل مُنبسِط/کەڕوو.

شريط الحذاء: رِباط/قەیتانی پێڵاو.

شـريط تـسجيل. شـريط فيـديو/شـريتی فيـديۆ. کاسێت.

شـريط المـصباح: مـشعَلة/پلیتـە. پلیتـەی چـرا. پلیتەی تەباخ.

شريط: تمييز رُتبة العسكر/خەت. خـەت و پلـەی سەربازی.

شـريط القيـاس. شـريط مـدرج/شـريتی پێـوان. پێوەر.

شريط وثـائقي: كتاب خطي/بەڵگەی نوسراو.

شريط سينمائي/فیلم.

شریطة.. شرط. شریطة أن.. شرط أن.

شریطیة: دودة شریطیة/ کرمی قەیتانی.

شریعة: قانون. سُنَّة/ یاسا.

شریعة: ماشرَعَهُ الله لعباده من السُنَن والأحکام/ فەرمایشتی خوا. یاسای ئاینی.

شریعة الغاب: قانون الغاب/ یاسای دڕستان.

شریعة: مَورِد الشارِب/ شوێنی ئاوخواردنەوە. دەراوی ئاو. کەناری چەم و ڕووبار.

الشریعة الغرّاء: السَمحة/ یاسای موسڵمان.

شریف: نبیل. حسیب/ خانەدان. وەجاخزادە. مەزن. پایەبەرز. شکۆدار. پیاوماقووڵ.

شریف: من السُلالة النَبَویة/ سەیی. لەنەوەی پێغەمبەر.

شریف: مستقیم. أمین/ ڕاستگۆ. دەستپاک. باوەڕپێکراو. سەرڕاست. دڵسۆز. پاک.

الأشراف: الأعیان/ پیاوماقووڵان. پیاوگەوران.

شریك: مُشارِك/ هاوبەش. هاوکار.

شریك: صاحِب حِصَّة/ بەشدار. بەشتیا. خاوەن بەش.

شریك في الجریمة: متواطیء. مُساعد في الجریمة/ براتاوان. هاوبەش لە تاواندا.

شَزَرَ الیه شَزراً: نظر الیه بطرف العین/ لێی مۆڕبووەوە. بە تیلایی چاو سەیری کرد.

شَزَرَهُ: أصابَهُ بالعَین/ کردی بە چاوەوە.

شَزَر. شَزرَة: الحُمرة في العین/ سووری چاو. چاوسووربوونەوە.

عَین شزراء: مُحمَرّة من الغضب/ چاوی سوورەوە. مۆڕ.

شزراً: جانب العین مع اعتراض وغضب/ مۆڕبوونەوە. چاوسوورکردنەوە.

شَسَعَ: بَعُدَ/ دوور بوو.

شسوع: بعید/ دوور.

شِسع: سَیر في النعل/ قایشی سۆڵ. قایشی ناوپەنجە گەورەی نەعل.

شِصّ. شُصّ: سِنّارَة. صِنارَة/ قولاپ. قولاپی ماسیگرتن.

شَطَّ: بَعُدَ. أبعَدَ/ دوورکەوتەوە. دووری خستەوە.

شَطَّ: تباعَدَ عن الحق/ لە ڕاستی و ڕێی ڕاست لایدا.

شَطَّ عن الموضوع: خَرَجَ عنه/ لە باس لایدا.

شَطَّ في سلعَته: غالی في الثَمَن/ شتەکانی گران کرد. داوای نرخی زۆری کرد.

شَطّ. شَطء: شاطیء. جانب النهر/ کەناری ڕووبار. موزورك. کەنار.

شَطّ. شَطء: شاطیء. ساحِل البحر/ ڕۆخی دەریاز زەریابار. ڕۆخ.

شطارة: دَهاء وخُبث/ زیرەکی. چابوکی. بلیمەتی. وریایی. چالاکی. بەدی. فێڵ و تەڵەکەبازی.

شَطَبَ الشيء: قَطَعَهُ أو شَقَّهُ طولاً/ دایهێنا. دایدڕی بز شەقی کرد. قڵیشانی.

شَطَبَ: حَذَفَ. مَحا/ سڕیەوە. کوژاندیەوە. لایبرد. دەریهێنا.

شَطَبَهُ. شَطَبَ علیه: مَدّ خطاً علیه/ هێڵی بەسەرا هێنا. ڕەشی کردەوە.

شَطَبَ الدَعوی: أبطَلَها/ داوکەی ڕاگرت. وەستانی. وازی لێهێنا. پووچی کردەوە.

شطب: شَقّ. شَقّ. عمل شرائح/ داهێنان. دادڕین. قڵیشان. شەقکردن.

شَطب: حَذف. مَحو/ لابردن. کوژاندنەوە. سڕینەوە.

شَطب الدَعوی: إبطالها/ داوا ڕاگرتن. وەستانن. وازلێهێنان. پووچکردنەوە.

شطب: خَدَش/ ڕووشاندن.
شطَرَ. شطُرَ: نَصَّفَ. قَسَّمَ/ لەتی کرد. کردی بە دوو کەرتەوە. بەشی کرد.
شطَرَ: إنفصَل وإبتَعَدَ/ جیابووەوە. دوورکەوتەوە. لێی جیابووەوە.
شطَرَ. شطُرَ: إنَّصَفَ. قَسَّمَ/ لەتی کرد. کردی بە دوو کەرتەوە. بەشی کرد.
شطَرَ: إنفصَل وإبتَعَدَ/ جیابووەوە. دوورکەوتەوە. لێی جیابووەوە.
شطَرَ. شطُرَ: إتَّصَف بالدهاء والخَباثة. کان شاطِراً/ چالاک و وریا و چابوک بوو. فێڵباز و تەڵەکەباز بوو.
شطَرَ شطرَ فلان: قَصَدَ. قَصدَهُ/ چوو بۆ لای. چوو بۆ جێگەکەی ئەو.
شطر: تَنصيف. تَقسيم. قطع/ لەتکردن. کردن بە دوو کەرتەوە.
شطر: نِصف بَيت من الشِعر/ نیوە بەیتی شیعر.
شطر: شطير. نِصف/ نیو. کەرت. لەت.
شطر: قَسم. جُزء/ بەش. کەرت. پارچە.
شطر: جِهَة. وِجهَة. إتِّجاه/ شوێن. لا. ئاڕاستە. جێگە.
شطر: بإتِّجاه. صَوب/ ڕووەو.
شطر: بُعد/ دووری.
شطرنج: لُعبة/ یاری شەترەنج.
شطَطَ: أفرَطَ. جاوَزَ الحَدَّ/ لە ڕادەبەدەر بوو. لە ڕادەبەدەر بوو.
شطَط: تجاوُز. مُجاوَزَة الحَدّ/ لە ڕادە دەرچوون. لە ڕادەبەدەر بوون.
شطَفَ: ذَهَبَ وتباعَدَ/ ڕۆی. دوورکەوتەوە.
شطَفَ عن الشيء: عَدَلَ عنه/ وازی لێهێنا. دەستی لێهەڵگرت.
شطَفَ: غَسَلَ/ شتی. لە ئاوی هەڵکێشا. ئاوی پیاکرد. ئاوی تێوەردا. تاراتی گرت.
شطف: تشطيف. غَسل/ شتن. لە ئاوهەڵکێشان. ئاوپیاکردن. تارات گرتن.
شطفَة: شطِيَة. قِطعَة/ تەلەزم. پارچە.
شطير: نِصف/ نیو. نیوە. لەت. کەرت.
شطير: بَعيد. مُنفَرِد/ دوور. تەنها. دەرکەنار.
شطيرة: سندويش/ سانویچ.
شظَى: شَرَحَ. فَلَقَ. قَطَعَ/ قلیشاندی. پارچەی لێکردەوە.
شظِفَ العَيشُ: كان ضَيِّقاً/ ژیان و گوزەران سەخت بوو.
شظَفُ العَيش: ضيق. مَشَقَّة. عَناء/ نەبوونی. نەداری. گوزەرانی سەخت.
شظف: ضَيِّق العَيش/ نەدار. کەمدەست. کەم گوزەران.
شظِف: شيء الخلق. قاسٍ. شَرِس/ بێئابڕوو. ڕەق. بێحەیا. دڵڕەق.
شظِيَ: تَشَظَّى: إنشَقَّ. تَشَقَّقَ/ درزی برد. قلیشا.
شظِيَة: قِطعَة مُتَناثِرَة/ تەلەزم. چاڵ. پارچە.
شظِيَة: صُغرى عَظمَتَي الساق/ ئێسقانە بچووکەکەی لاق. سپیلە. قالور. ساقول.
شعَّ: اشعَّ. نَثَرَ. فَرَّقَ/ بڵاوی کردەوە. ڕووناکی (دایەوە. بڵاوکردەوە).
شعّ: شُعاع. شَريط ضَوئي/ تیشک. ڕووناکی و تیشکی خۆر. شەوق.
شعّ: بيت العَنكبوت/ هێلانە جاڵجاڵۆکە.
شعّ: شُعاع السُنبُل: سَفاه/ قەڵاس. پژان. داسک.
شعّ: المُتَفَرِّق من كل شيء/ بڵاو. پەرش و بڵاو. هەموو شتێک کە پەرش و بڵاو بێ.

شعائر (المفرد شعيرة): طقوس دينية/ نەریتی ئاینی.

شعار: علامة. عنوان. شارة. رَمز/ دروشم. نیشانە. ناونیشان. هێما.

شعاع: شع. شريط ضوئي/ تیشك. ڕووناكی و تیشكی خۆر. شەوق.

شعاع: نصف قطر الدائرة/ نیوەتیرەی بازنە.

شعاع: المُتفرق من كل شيء/ پەرش و بڵاو.

شعاع: شعَ السنبل: سفاه/ قەڵاس. پزان. داسك.

شعَب: شعّب. تفرّع. فرّع/ لقی كرد. پەل هاویشت.

شعَب: مات/ مرد. گیانی دەرچوو.

شعَب عنهُ: فارقهُ/ لێی جیابووەوە.

شعَب: بُعدُ مابين الكتفين/ پانایی ناوشان. دەفەی شان.

شعب: بُعد. صَدع/ ناكۆكی. ساردەیی دووبەرەكێتی. هاجزی. دووری.

إلتام شعبهم: تجمعوا بعدَ تفرّق/ كۆبوونەوە. ئاشتبوونەوە. یەكیانگرتەوە.

شعب: قوم/ گەل. میللەت. بەرە. هۆز. نەتەوە.

شعب: طريق في الجبَل/ ڕێگەی ناوشاخ.

شعبة مسيل الماء في الارض/ ئاوەڕۆ. چەم و جۆگە و ڕووبار.

شعبان: الشهر القمري الثامن/ مانگی شەعبان.

شعبة: فرع. غُصن/ لق. چل. پەل. پەلوپۆ.

شعبذ: شعوذ/ (فێڵ. ساختە. جادووگەری. جامبازی. چاوبەستی. جوكێتی) كرد.

شعبذة: شعوذة/ فێڵ ساختە. جادووبازی. جامبازی. جوكێتی.

شعبي: قومي/ نەتەوەیی. فۆلكلۆری. گەل. كەلەپووری.

أغان شعبيّة/ گۆرانی فۆلكلۆری.

حكاية شعبية/ چیرۆكی فۆلكلۆری.

رقص شعبي/ سەمای فۆلكلۆری. هەڵپەڕكێ.

ملابس شعبية/ جلوبەرگی نەتەوەیی.

شعث الشعرُ: تشعّث. تفرّق وتشوّش/ قژیژ بووەوە. ئاڵۆزاو ئاڵۆزكاو تێكئاڵا.

شعث. شعث: إنتشار الامر وخللهُ/ سەرلێتێكچوون. سەرلێشێوان. كارئاڵۆزان و شپرزەیی.

لمّ شعثهُ: جمع امرهُ/ خۆی كۆكردەوە. كەوتە خۆی.

شعث. اشعث: محلول الشعر. غير مُهندَم/ قژ بژژ شانە نەكراو. ئاڵۆزاو.

شعَرَ بـ: إستشعرَ. احسّ. ادرك/ هەستی پێكرد. پێیزانی. سوسەی كرد. تێیگەیی.

شعَرَ مع: عَطف على. رقّ لـ/ بەزەیی پیاهاتەوە. دڵی پێ سووتا.

شعَرَ: نظمَ الشعرَ. قالَ الشعرَ/ هۆنراوەی وت. هۆنراوەی هەڵبەست.

شعر: اشعَر. كثُر الشعر. شعراني. مُشعر/ تووكن. كژۆژ.

شعر. شعَر (الواحدة شعرة): مايَنبُت من مسام الجسم/ تووك. موو. قژ. پرچ. تیسك. ساچ.

شعرٌ خشن/ مووی زبر. ڕەق.

شعرٌ ناعم/ مووی نەرم.

شعر العانة: شعرة/ بەر. تووكی بەر. تووكەبەر.

شعرٌ مستعار: شعر إصطناعي/ كڵاوقژ. باڕۆكە.

شعر الضرع: الشعر الذي ينبت على ضرع الحيوان ولا يُقص/ ڕانكە.

شعر: قريض. كلام مُقفى/ هۆنراوە. چامە. هەڵبەست.

شعر حرّ: غير مُقفى/ هۆنراوەی سەربەست.

شعر رثائي/ هۆنراوەی لاواندنەوە.

شعر غزَلي/ هۆنراوەی دڵداری.

شعر غنائي/ هۆنراوەی گۆرانی.

شعر قصصي/ چیرۆك ئامێز.

شعر مُرسَل. غيرُ مُقفّى/ بێ سەروا.

شعرٌ ملحمي/ شیعری داستانی.

بيت شعر/ دێڕێك هۆنراوە.

شـعرىَ: نجـم الـشِعري/ گەلاوێـژ. ئەسـتێرەی گەلاوێژ.

أيـام الـشِعري: أحَـرّ أيـام الـسَنَة/ چلەی هـاوین. (١٥/٧-٢٥/٨).

شعرَة (واحدَة الشَعر)/ تاڵێك موو. مووچك.

شعرة عانه: الشَعر تحت السُرّة أسفل البطن/ بەر. تووكەبەر. ڕووڤ. ڕووم. ڕووڵك. ڕانكا.

شَعرَة العَين: مرض إلتـواء الرمـوش/ مـوو. مووی چاو.

تُعَلّق بشَعرَة: مُتَعلّق بشعره/ بە موویەك بەندە. بە موویەك خۆی گرتووە.

على الشَعرَة: بتَمام الدقّة/ بە موو كەم و زیادی نیە.

شعري: كالشَعر أو مصنوع منه/ موویین. وەك موو. لە موو دروستكراو.

أنبوب شعري: وعاء شعري/ موویینە بۆری.

تجـاذُب شـعري. الجاذبيـة الـشَعرية/ موویینـە كێش.

شَعرِيَة: نافِذَة مُشبّكَة/ پەنجەرەی كون كون وەك تۆڕ.

شـعرِيَة: فَتائـل رفيعـة مـن العجـين/ هەرشـتە. شەعریە.

شـعرِيَة: دودة رفيعـة تعـيش في الأمعـاء/ كرمـی دەزوولەیی ناوسك.

داء الـشَعرِيَة: مـرض يُـشبه التيفوئيـد/ گرانـەتێی ناوسك.

شَعشَعَ: أشعَّ. أشاع. نَشر أشعَّة/ ڕووناكی دایەوە. ڕووناكی كردەوە. شەوقی دایەوە. بریسكایەوە.

شَعشَعَ: خَفّفَ. مَزَجَ بالمـاء/ ئاوی تێكرد. ڕوونی كردەوە.

شَعشَعَ الشيء: خَلَط بَعضَهُ ببَعض/ تێكی دا. تێكەڵی كرد.

شَعـشَعَة: تَخفيـف. مَـزج بالمـاء/ تێكـەڵكردن. ڕوونكردنەوە.

الشَعـشَع. الشَعـشَع. الشَعـشاع. الطويـل. اللبـِق. الخفيف/ درێژ. زۆرزان. قسەزان. سووكەڵە.

شَعَطَ: شَيّط. حَرَق/ هەڵیكرووزان.

شَعطَة: حَرقَة في الحَلق أو الصَدر. حَزّة/ دڵەكزی. سووێی دڵ. سووتانەوەی ناودەم.

شَعَل. شَعَّل. أشعَل/ كڵپەی كرد. گڕی گرد.

شُعلَة: لَهَب. لُهبَة/ گڕو بڵێسە. كڵپە.

شَعواء: عنيـف. حـاد. قـاس. صـارم/ ڕەق. بەزەبر. توندوتیژ. چەپگەر. دڵڕەق. بێبەزەیی.

شُعَب (المفرد. شعب)/ گەلان. میللەتان. نەتەوەكان.

شُعوبي: طائفي/ نەتەوەپەرست. ڕەگەزپەرست.

شـــعُوبية: طائفيّـــة/ نەتەوەپەرســـتی. ڕەگەزپەرستی.

شَعير: نبات/ جۆ.

نَضج الشعير/ كڵۆشە بوون.

شَعيرة (الجمع شَعائر/ طَقس ديني/ نەریتی ئاینی.

شُعَيرَة: شَعرَة صغيرَة/ مووی بچووك و زۆر باریك. دەزوولە.

شُعَيرَة: أنبوب شَعري/ بۆریلەی زۆر باریك.

شُعَيرَة جَذريَة/ مووڕەگ.

شُعَيرَة دَمويَة/ دەزوولەی خوێن.

شَعيرَة العَين: شعاذ العَين/ سیچکە سلاوە. قنچکە سلاوە.

شَغّاب: مُشاغِب. مثير الفتَن. مُهَيِّج للشر/ دووبەرەکی دروستکەر. تێچێنەر ئاژاوەگێڕ. گێرەشێوێن.

شَغَف: شَغاف القلب. غِلافه الخارجي/ پێستی دڵ.

شَغّال: شَغيل. عامِل. أجير/ کرێکار. مزور. ئیشکەر.

شَغّال: مُشتَغِل. لديه شغل/ ئیش ئەکا. ئیشی هەیە. ڕەنج ئەدا. کاسپی ئەکا.

شَغّال: مُشتَغِل. ضد بطال. يَعمل/ لە ئیشدایە. لەسەر ئیشە. لە کاتی ئیشکردنایە.

شَغّال: مُجتَهِد/ تێکۆشەر. چالاک. بە چنگ. ڕەنجدەر.

شَغّالة: خادِمَة/ کارەکەر. تەیان. کلفەت. ئیشکەری ئافرەت.

شَغَبَ. شَغِبَ. شَغَبَك شاغَبَ/ (گێچەڵ. ئاژاوە. پشێوی) نایەوە. (دووبەرەکی. دوو مانی. گێرەشێوێنی) کرد.

شَغَب: إضطراب. الإخلال بالأمن. هيجان/ ئاژاوە. پشێوی. یاخیبوون. یاخێتی. هەراو هەراوهوریا. ژاوە. هاندان.

شَغِب: شَغّاب. مُشاغِب. مثير الفتَن/ دووبەرەکی دروستکەر. تێچێن. ئاژاوەگێڕ. گێرەشێوێن. سەرە گێچەڵ.

شَغِر: شَغّاب. مُشاغِب. مثير الفتَن/ دووبەرەکی دروستکەر. تێچێنەر ئاژاوەگێڕ. گێرەشێوێن. سەرە گێچەڵ.

شَغَرَ المكانُ: خَلا/ جێگەچۆڵ بوو. بەتاڵ بوو. بۆش بوو.

شَغَرَ الناسُ: تَفَرَّقوا/ بڵاوەیان لێکرد. کەس نەما.

شَغِفَ بـ: إنشَغَفَ. أولَعَ بـ. أحَبَّ/ خۆشەویستیەر حەزلێکردن. شەیدایەر سۆزی بەتین. هۆگربوون.

شَغِف بـ: مَشغوف بـ. مُولَع بـ. مجنون/ شەیداز شێت. هۆگر.

شَغَلَ: جَعَلَهُ مَشغولاً. ملأ وَقتَهُ. إستحوذ على نشاطه أو إهتمامه/ خەریکی کرد. خەڵەتانی. خلافانی.

شَغَلَهُ الأمرُ: شَغَل بالَهُ: أقلَقَهُ. ازعَجَهُ/ سەری لێ چەواشە بوو. نەیئەزانی چی بکا.

شَغَلَ عن: ألهى/ لەبیر خۆی بردەوە. خستیە پشتگوێ. خۆی لێ کەڕ کرد.

شَغَل مكاناً او حَيِّزاً: ملأهُ. إحتل/ شوێنی گرتز جێگەیەکی گرت. جێگەیەکی داگیر کرد.

شَغَل منزلاً: سَكَنَ. أقامَ/ چووە ماڵەکەوە. خانووی گرتز چووە ناوی.

شَغَلَ منصباً: تَعَيَّنَ/ دامەزرا لە کارێکدا.

شَغَّل: إستخدم. أعطاه عملاً/ خستیە ئیشەوە. دایمەزراند. ئیشی پێکرد.

شَغَّلَ: أدار. سَيَّرَ. أعمَلَ/ ئیشی پێکرد. خستیە (گەڕ. ئیش. کار).

شَغَّل المال: وَظَّفَ المال. إستثمر/ دراو و ماڵی خستە ئیشەوە. بەکاری هێنا. کاسپی پێوەکرد.

شَغَلَك إنشَغَلَ. صار مشغولاً/ خەریکبوو. دەستی گیرابوو.

شَغِل. مَشغول/ سەرقاڵ. دەستگیراو بەکارێکەوە.

شُغل: إشغال. إحتلال/ شوێن گرتن. تێخستن. داگیرکردن.

شُغل: عَمَل. صَنعَة. مِهنَة. وَظيفَة/ کار. فرمان. ئیش. پیشە.

شُغل: عَمَل. كَدّ/ ڕەنجدان. تێکۆشان. کارکردن. هەوڵدان.

شُغلُ الإبرة. تطريز/ چنين. دروومانی دەست.

شُغلٍ شاغلٍ: مَشغوليّة. إنشغال/ خەریکبوون. دەست نەپەرژان.

شُغل شاق: عمل شاق/ ئیشوکاری گران و بە ئەرک. کاری گران.

شُغل يَد: مصنوع باليد/ ئیشی دەستکرد.

مَشغوب: مُشاغب. مثير الفِتَن. مُهَيِّج للشَرّ/ سەر بە (گۆبەن. گێچەڵ). گێرەشێوێن. دووبەرە. تێچێن.

شُغور: خُلوّ. فراغ. كَون الشيء شاغِراً/ بەتاڵ. چۆڵ. بۆش.

شَغُوف بـ: مَشغوف بـ. مُولَع. مجنون/ هۆگر. شەیدا. شێت.

شَغيل: عامل. أجير/ کرێکار. ئیشکەر.

الشَغيلة. طبَقَة الشغيلة. الطبقة العامِلَة/ چینی کرێکار.

شَفّ: رَقّ. كان شفّافاً/ تەنک.

شَفَّهُ. شَفَّهُ المرضُ أو الهم: أوهَنَهُ/ لاوازی کرد. بێهێزی کرد. هێزی لێبڕی.

شَفّ. إشتَفَّ مافي الإناء: شرب كل مافيه/ هەمووی خواردەوە. هەڵیقوڕاند. هەڵیلووشی.

شَفّ. شِفّ: نسيج رقيق/ جاجم. پۆپەشمین. چەرداوی تەنک.

شُفي من مَرضِه: ابرأ/ چاکبووەوە.

شَفَى غليلَهُ: إنتقم. اخذ بالثأر/ تۆڵەی کردەوە.

شَفاً: حافّة/ کەنار. لێوار. قەراخ.

على شَفاكَنا: علاج. دواء/ چارە. چارەسەر. دەرمان.

شِفائي: علاجي. دوائي/ بۆ چارەکردن و پەیوەندیدار بە چارەکردنەوە.

شَفاعَة: تَوَسُّط. وَساطَة/ ڕوولێنان. تکاکردن. ناوەندیار.

شَفّاف: لايَحجُب ماخَلفَهُ/ ڕۆشن. ڕوون. دیوبیار.

وَرَق شفّاف/ پەڕەی ڕۆشن.

شَفافِيّة: شَفَف/ ڕۆشنی. ڕووناکێتی. ڕووناک بینی. تەنکی.

شَفاهاً: شَفَهِياً. مُشافَهَةً/ هەر بە دەم. دەمی.

شَفاهي: شَفَهي. ضد كتابي/ نووسینی تیا نیە. لەبەر.

شَفَة. شَفَة: القسم اللحمي الخارجي من الفم/ لێو. لچ. لەوس.

شَفَة. شَفَة: حافّة. شَفير. طرف/ کەنار. لێوار. لێو. لەملاولای شت.

شَفَة عُليا/ لێو.

شَفَة سُفلى/ لچ. لەوس.

شَفَة مُتَدلاة/ لچ شۆڕ. لچە. لەوس شۆڕ.

بِنت شَفَة: كَلِمَة/ وشە.

شَفَرَ: نَقَصَ وقَلَّ/ کەمبووەوە. کەمی کرد. کەمی هێنا.

شَفر. شُفر: حَدّ. طرف. ناحِيَة/ کەنار. لێوار. قەراخ.

شَفرَة: نَصل/ تیغ. دەمە تیغ. گوێزان. شفرە.

شَفرَة الحلاقة: موس/ گوێزان.

شَفرَة المحراث: الحديدة/ گاسن.

شِفرَة: كتابة سِرِّيَة/ چفرە. بەهێما نووسین. پەرلە.

شَفشاف: مَطَر فيه بَرَد/ باران بە تەرزەوە.

شَفشَف: جَفَّف. أحرَقَ/ وشکی کردەوە. هەڵیبڕوکان. سووتانی. لەڕی کرد. سیس کرد.

شَفَطَ: مَصّ. إمتَصّ/ مژی. ڕایکێشا. هەڵیلووشی. مژرا. ڕاکێشرا. هەڵلووشرا.

شَفَعَ (لـ. في): تَشَفَّعَ. توسط. طلب منه ان يعاونه/ داوای یارمەتی بۆ کرد. تکای بۆ کرد. بۆی

پاڕایـەوە. پزیشکی بـۆ هێنایـەوە. پاکانـەی بـۆ کرد.

شَـفَعَ: أعطـاه حَـقّ الـشُفعَة/ مـافی کـڕین و هەڵگرتنەوەی پێدا.

شَـفَعَ: ضـاعَفَ. أضـافَ. قَـرَنَ/ کـردی بـە دوو ئەوەندە. ئەوەندی تـری خستەسەر. کردی بە جووت.

شَفَعَ: إشترى بالشفعَة/ کڕی. هەڵیگرتەوە.

شَـفَعَ: إزدواج البَـصَر/ جـووت بینیـ-ز بیـنین و تارمایی لەگەڵیا.

شَفع: زَوجي. مُنقَسم على إثنين بدون باقٍ/ جووت. ژمارەی جووت.

كانَ وَتراً فَشَفَعَهُ/ تاك بوو كردی بە جووت. بە دوو ئەوەندە.

شُفعَة: حَقّ الـشُفعَة. حَقّ الإبتيـاع او التملك قبـل الغَـير/ مـافی کـڕین پـێش کەسـانی تـر. مـافی هەڵگرتنەوە.

شَفعي. زوجي. مُنقَسِم على إثنين بدون باقٍ/ جووت. ژمارەی جووت.

شَـفَّ: شَـفافيَّة. رِقَّـة/ ڕۆشـنی. ڕووناك بینـی. تەنکی.

شَفِقَ: أشفَقَ على. عَطفَ/ بەزەیی پیاهاتـەوە. دڵـی پێ سووتا.

شَـفِقَ: أشـفَقَ علـى. حَـرِصَ/ بە تەنگیـەوە هـات. ئاگاداری بوو.

شَـفَقَ: جَعَلَـهُ يَـشفَقُ/ دڵـی نـەرم كـرد. ڕەحمـی جووڵان.

شَـفَق: بَقيَـة ضـوء الـشمس بعـد غُروبهـا/ ئێوارە. خۆرئاوا. زەردەپەڕ.

شَفَق: سَدَف. ضَوء الفَجر/ بەیان. سپێدە. شەبەق. تاریك و ڕوون.

شَفَق: خَوف/ ترس. باك.

شَـفَقَة: حَنـان. رَحمَـة. عَطـف/ بـەزەیی. بـە تەنگەوەهاتن. دڵنەرمی.

عديم الشَفَقَة: صارِم. لايَرحم/ بێبەزەیی. دڵڕەق. بێڕەحم. چەپگەر. زۆردار.

شَفَهي: شَفَوي. شَفاهاً: ضد كِتابي/ نووسینی تیا نیە. بە دەم.

شَفَهياً: مشافَهَة. شَفاهاً/ هەر بە دەم. دەمی.

شَفوق: شَفيق. رَؤوف. رَحيم/ بە بەزەیی. دڵنەرمز میهرەبان.

شَفيَ: تَعافى. بَرِءَ/ چاكبووەوە.

شَفير الجفن. شَفر. حافَةّ الجَفن/ لێواری پێڵوو.

شَـفير: شَـفر: حَـدّ. طَـرف. حافَّـة/ كـەنار. لێوار. قەراخ.

شَفيع: مَن يَشفَع/ تكاكار. ڕوولێنەر. ناوبژیكەر.

شَـفيع: صـاحِب حَـقّ الـشُفعَة/ ئـەوەی بـۆی هەیـە بیكڕێتەوە. هەڵی گرێتەوە.

شَفيعٌ من العَدَد: زَوج/ ژمارەی جووت.

شَفيف: شَفافيَّة/ تەنكی. ڕۆشنی. ڕووناكبینی.

شَـفيق: شَـفوق. رَؤوف. رحـيم/ بەبـەزەیی. دڵنـەرمز میهرەبان.

شَقّ: شَقَّقَ. قَلَعَ. مَزَقَ. بَضَعَ/ قڵیشاندی. دوولەتی كرد. درزی تێكرد. دڕاندی.

شَـقَّ طريقـاً او شـارعاً: بَنَـى. شَيَّدَ/ جادەی لێدا. شەقامی لێدا.

شَـقَّ طريقَـهُ/ تَقَـدَّمَ بنجـاح/ ڕێگـەی ژیـانی بـڕی. پێشكەوت. سەركەوتوو بوو.

شَقّ الصُبحُ: طَلَعَ. بَزَغَ/ ڕۆژ بووەوە. سپێدەی دا.

شَـقّ الـزَرعُ: خَـرَجَ مـن الأرض/ ڕووەك ڕوا. بەلەسە بوو. لەڕێ لایدا.

شق عصا القوم: فرّق شملهم وكلمتهم/ئاژاوە و دووبەرەکی تێخستن.

شقّ عليه الأمرُ: صَعُبَ. ثَقُلَ/کارەکەی لێ گران بوو. چەوانشە بوو. قورس بوو.

شقّ السنُّ: طَلَعَ/دان دەرهات.

شقّ عليه: أوقعَهُ في المَشقّة/خستيە نارەحەتيەوە. کێچەڵی بۆ نایەوە.

شقّ نفقاً أو قناةً: حَفَرَ/(خەنەك. جۆگە. چاڵ..)ی هەڵکەند.

شَقّ: فَلع. فَلْق/درز. قڵیش. درزتێبوون. قلیشبردن. دەمکردنەوە. دوو کەرتبوون.

شَقّ: فَجوَة/دەلاقە. کەلێن.

شَقّ: مَزَق/دڕان. دڕاوی. زەنگ.

شَقّ: فَجر. صُبح/بەيان. بەرەبەيان. سپێدە.

شِقّ. شِقّ الشيء: نِصفُهُ/لەت. کەرت. نیوە.

بِشِقّ النفس: بِصعوبَة/زۆر بە گران. بە نارەحەت.

شِقّ: النصف من كل شيء/نیوە. لەت. کەرت.

شِقّ: الجانب الواحد من الإنسان/تەنیشت. لا.

شِقّ: جِنس. صِفَة التذكير أو التأنيث/رەگەز. نێرێتی. مێیەتی.

شَقا: أشقى. اتعَسَ. جَعَلَه شَقِياً/(کەساس. بەدبەختز کەنەفت..)ی کرد.

شَقاء. شَقا: شَقاوة. تَعاسة. نقيض السَعادة/ نەگبەتی. بەدبەختی. کەساسی.

شَقاء. شَقا: الشِدّة والعُسر/نەبوونی. تەنگانە. پەککەوتن. گیروگرفت.

شقائق النُعمان: نبات وزهرة/گوڵاڵە سوورە. چاران چەقێلە. یاتینۆك.

شقائق. شَقيقَة/خوشکان. خوشکی دایك و باوکی.

شِقاق: خِصام. نِزاع/ناکۆکی. ناڕێکی. دووبەرەکێتی. جیایی. جیابوونەوە.

شَقاوَة. شَقاء: تَعاسَة. نقيض السعادة/ نەگبەتی. بەدبەختی. گیروگرفت.

شَقاوَة: عَربَدَة/بێحەیایی. جەربەزەیی. شەڕانێتی. شەقاوە.

شُقّة: مَسافَة/ماوە.

شُقّة: مَسكَن. بَيت/ماڵ. خانوو. دەستە. شوقە.

شُقّة. شِقّة: بُعد/دووری.

شُقّة. شِقّة: مَشقّة/نارەحەتی. گیروگرفت. تەوەرە. بەلا و دەردو لێقەومان.

شِقّة: قِطعة مستطيلة/پارچەیەکی درێژ. لاکێشی.

شِقّة: نِصف/نیوە. کەرت. لەت.

شَقِرَ. شَقُرَ: كان أشقَر/سوورفل بوو.

شُقر. شُقرَة: لونٌ يأخذ من الأحمر والأصفر/ سوورفل.

شَقراء: أشقَر/سوور. سووریاو. سوورفل. کەژ. شل.

شَقشَقَ الطيرُ: زَقزَقَ. صَوَّتَ/مەل خوێندی. جریوانی. قاڕانی.

شَقشَقَ المَلابِسَ: غَسَلَها بالماء ليذهب أثر الصابون/لە ئاوی هەڵکێشا.

شَقشَفَ. شَقفَةَ: كَسر الخَزَف/سواڵەتە شکاو. گلێنە شکاو.

شَقَّقَ: شَقّ. فَلَعَ. مَزّق. بَضَعَ/ قلیشانی. دوولەتی کرد. درزی تێکرد. دڕانی.

شَقلَبَ. تَشَقلَبَ. وَثَب أو انقلب في الهواء/ سەرمەقولاتی دا. خۆی هەڵگێڕایەوە.

شَقلَبَة: وَثب وانقلاب في الهواء/سەرمەقولات. تەقلە. دەقلووس. خۆ هەڵگەڕانەوە.

شَقوَة. شَقاء. شَقا/لاساری. چەقاوەسوو.

شَقيَ: تَعِسَ. بَئِسَ. ضد سَعُدَ/(بەدبەخت. کەساس. کلۆڵ. خاکسار. بەڵەنگاز. ڕۆژ ڕەش) بوو.

شَقي: شَرِير. مُجرم/تاوانبار. تاوانگێڕ. شەڕانی.

شَقي: عَرِيد/بێحەیا. لاسار. نەگریس. کەڵەش.

شَقي: تَعِس. بائِس. ضد سَعيد/بەدبەخت. کەساس. کلۆڵ. خاکسار. بەڵەنگاز. ڕۆژ ڕەش

شَقيق: أخ. أخ من الأب والأم/برا. برای باوکی و دایکی.

شَقيق: نِصفُه/کەرت. لەت. نیوە.

شَقيقَة: أخت/خوشک.

شَقيقَة: صُداع في نِصف الرأس/نیوە سەر ئێشە. ژانی نیوە سەر.

شَكَّ، تَشَكَّكَ في: إرتاب/گومانی لێکرد. لێی بە گومان بوو. دڵی لێ پیس کرد. بە گومان بوو. دڵی کرمێ بوو.

شَكَّ: غَرَزَ. وَخَزَ. طَعَنَ/پیاچەقان. پیاکرد.

شَكَّ: شَرَجَ. سَرَجَ. باعد بين الفرزتين/کۆکی گرت. بە تەقەڵی زل زل درووی.

شَكَّ بالهماز: نَخَسَ/تێوەی ژەن. ئاوزەنگی لێدا. مامزەی لێدا.

شَكَّتْ الشوكةُ رِجلَهُ: دَخَلَت فيها/دڕک چوو بە قاچیا.

شَكّ: رِيب. خِلاف اليَقين/گومان. گومان کردن. دوودڵی. دڵ پیس کردن. دڵ کرمێ بوون.

بلا شَكّ. من دون شك. لاشَكّ: يقيناً. بلا رَيب/ بێگومان.

شَكّ: دواء يقتل الفار/مەرگەمووش.

شَك: شيك/چەک.

شَكا. شَكَى: إشتكى. تَشَكَّى. تَظَلَّم/سکاڵای کرد. هاواری لێ هەڵساند داد و بێدادی کرد. شکاتی کرد.

شَكاة: شَكوى. تَظَلُّم/سکاڵا. شکات. داد و بێداد.

شَكاسَة: حِدّة الطَبع. سوء الخُلق/بێئابڕوویی. بێحەیایی. بزێوی. ڕەقگرتن.

شَكّاك: شاكّ. مُرتاب/بەگومان. دوودڵ. دڵ کرمێ. دڵ پیس.

شِكال: قَيد. غُلّ. صِفاد/کۆت. پێوەند.

شَكاوَة. شِكايَة: شَكوى. تَظَلُّم/سکاڵا. شکات. داد و بێداد.

شَكَّة: وَخزَة/پیاچەقان. تێوەژەندن.

شَكَرَ لـ: حَمَدَ. أثنى على. مَدَحَ/سوپاسی کرد. ستایشی کرد. پیاهەڵدا.

شُكر. شُكران: حَمد. مَدح. ثَناء/ سوپاسکردن. ستایش. پیاهەڵدان. پێزانین. چاکە لەبەرچاوبوون.

شُكراً. شُكراً لك/سوپاس. سوپاس بۆ تۆ.

شَكِسَ. شَكُسَ: كان شَكِساً شَرِساً/(دڕ. بێحەیا. بێئابڕوو. بزوێو. ڕەقاوی. نالەبار) بوو.

شَكِس: مُشاكِس: سيء الخُلق. شَرِس/دڕ. بێحەیا. بێئابڕوو. نالەبار. بزێو. ڕەقاوی. کەڵەش.

شَكَّكَ: أوقع في الشك. أراب/خستیە گومانەوە. دڵی کرمێ کرد.

شَكَلَ. شَكَّلَ الدابةَ بالشِكال: قَيَّدَ. شَدَّ قوائمها/ بەستیەوە. پێوەندی کرد.

شَكَلَ. شَكِلَ الأمرُ: إلتَبَسَ/کار ئالۆز بوو. گیروگرفتی تێکەوت.

شَكَلَ. شَكَلَ الكتابَ: قَيَّدَهُ بالحركات/سەروبۆری بۆ نوسراوەکە کرد.

شكَلَت. شكّلت المرأةُ شعرها: ضَفَر/ قژی هۆنیەوە. کردی بە پرچ.

شَكَلَ. شَكَلَ العنبُ: أخذ في النُضج/ تریّ پێگەیی.

شَكَلَ: اشكَلَ المريضُ: تماثَلَ/ نەخۆش لە چاك بوونەوەدایە. لە چاك ئەچێ.

شَكَّلَ: صاغَ. صَوَّرَ. كَوَّنَ. ألَّفَ/ دروستی کرد. دایڕشت. پێکی هێنا. نەخشەی کێشا. دایمەزران.

شَكَّلَ: نَوَّعَ/ بابەتەکانی زۆر کرد.

شَكل: هيئة. صورة/ دیمەن. ڕوخسار. دەموچاو. ئێسك.

شَكل: طراز. نوع/ جۆر. بابەت.

شَكل: رسم. صورة/ وێنە. نیگار.

شَكل: حركات على الحُروف/ سەروبۆری سەر وشە و پیت.

شَكل: المذهب والقَصد/ بیروباوەڕ. مەبەست.

شَكل. شَكل: المِثل والنظير/ هاوشێوە. لەیەك چوو. دووانە. وەك یەك.

شَكلاً: صُورَةً/ بە دیمەن. ڕووکار. لەڕووە. بە وێنە.

شَكلي: صُوَري. إسمي. بالإسم/ بەناو. هەر بە ناو. ڕواڵەت.

شَكلياً: مَظهَري. للمظهر/ ڕواڵەت. هەر بۆ پیشاندان.

شَكليات: رسميات. إجراءات/ نەریت. ڕۆتین.

شَكَمَ. اشكَمَ: أعطاه وجازاه/ پاداشتی دایەوە. پێیدا.

شَكَمَ: رَشا. أسكَتَ/ بێدەنگی کرد. دەمکوتی کرد. شتێکی پێدا. دەمی چەورکرد.

شَكَمَ: لَجَمَ. وَلَّمَ/ لغاوی کرد.

شَكوىَ: تَشَكٍّ. تَظَلُّم/ سکاڵاکردن. شکاتکردن. کڕوزانەوە.

شَكور: شاكر. مُمتَن/ سوپاسکار. پێزان.

شُكور: شُكر. حَمد. ثَناء. مَدح/ سوپاسکردن ستایشکردن. پێزانین. چاکە لەبەرچاوبوون.

شُكوكيّة: من أصحاب الشك. أهل الشك والريبة/ گومانکەران. ئەوانەی لە زۆر شت بە گومانن.

شَكيّة: شَكوى. تَشَكِّي. تَظَلُّم/ سکاڵاکردن. شکاتکردن. کڕوزانەوە.

شَكيمة: أنَفَة/ لووت بەرزی. تڕنل. تڕۆیی.

شَديد الشكيمة. ذو شكيمة: أنوف. لايَنقاد/ لاسار. قیرسچمە. تڕنل. لووت بەرز. ڕام نابێ.

شَكيمَة اللجام: الحديدة في فم الفَرَس/ ئاسنی لغاو. کرۆکی لغاو.

شَلَّ: عَطَّلَ. عَرقَلَ/ پەکی خست. وەستانی. لە کار خست.

شَلَّ. شُلَّ: أُصيبَ بالشَلل/ تووشی ئیفلیجی بوو. ئیفلیج بوو. گۆت بوو. گۆج بوو.

شَلَّت. شَلَّت يَدُهُ: يَبُسَت/ وشك بووەوە. دەستی لە کۆ کەوت.

لاشَلَّت يَداك. لايَبُسَت/ دەستت نەڕزێ.

شَلاَل: شاغور. مَوضِع هُبوط الماء/ تافگە. ڕیژاو. ڕیژاڵ. سۆلاڵ. ئاوشار.

شَلالة: خياطة مُتباعِدَة/ کۆك کرتن. تەقەڵی زل زل. دروومانی شاش. شەڵتە دروو.

شَلب: رُزّ/ چەڵتووك. برنجی نەکوتراو.

حقل الشلب. مزرعة الشلب/ مەرەزە.

شَلّة. شِلَّة: زُمرَة. جَماعَة/ دەستە. کۆمەڵ. کۆبەند چەند کەسێك.

شَلّة. شِلّة: خُصلَة من الخيُوط. لفيفَة. كُبَّة/ کلافە دەزوو. کلۆڵە.

شَلَحَ ثيابَهُ: خَلَعَها/ خۆی ڕووت کردەوە. جلەکانی داکەند.

شَلَّحَ: عَرّیَ/ ڕووتی کردەوە. جلەکانی لەبەر داکەند.

شَلَحَ: سَلَبَ. جَرَّدَ مِنْ/ ڕووتی کردەوە. تالانی کرد. چی پێ بوو لێی سەند.

سَلَّ الماءُ: قَطَرَ/ ئاو تکا. دڵۆپەی کرد. دڵۆپ دڵۆپ ئەهاتە خوارێ.

شَلَّ: عَطِلَ. تَعَطَّلَ. عَجِزَ/ گۆت بوون. ئیفلیجی. شەپرە.

شَلَل جزئي/ ئیفلیجی و لەکارکەوتنی یەک ئەندام.

شَلَل الأطفال/ ئێسکەنەرمە.

شَلَل إهتزازي. إرتعاشي/ لەرزۆکی.

شَلَل رُباعي. شلل الأطراف الأربَعَة/ یەک کەوتن و ئیفلیج بوونی هەر چوار پەلا.

شَلَل نِصفي/ ئیفلیجی و لەکارکەوتنی نیوەی خوارەوەی لەش.

شِلو (الجمع أشلاء): عُضو من أعضاء الجسم. قِطعَة/ یەکێك لە ئەندامانی لەش. پارچە. کوت.

شَمَّ: إشتَمَّ. تَنَشَّقَ الرائحَة. أخذ الرائحة بحاسَة الشم/ بۆنی کرد.

شَمَّ: تَكَبَّرَ/ لووتی بەرزکردەوە. خۆی بەرز گرت.

شَمّ: إدراك الروائح. تَنَشُّق الرائحة/ بۆن کردن.

شَمّ: حاسَّة الشَمّ/ هەستی بۆنکردن.

شَمات. شَماتَة: فَرَح بِمُصيبَة الغَير/ شادبوون بە خەمی خەڵك.

شَمات. شَماتي: خائبون/ هیوابڕاو. بێئەوایان. نائومێدان.

شَماتَة: حَسَد/ بەدی.

شَمّاع: صانع وبائع الشموع/ مۆم (دروستکەر. فرۆش).

شِمال: يَسار. عكس اليمين/ چەپ. لای چەپ.

شِمال: شميلة (الجمع شمائل): طَبع/ خوو. ڕەوشت.

شِمال. شَمال: الجهة التي تقابل الجنوب/ باکوور. ژووروو.

شِمال. شَمال: ريح الشَمال/ بای باکوور.

الشمال الشرقي/ باکووری خۆرهەڵات.

الشمال الغربي/ باکووری خۆرئاوا.

شِمال: كيس الثَديِ. كيس الضَرع/ مەمکدان. سوخمەی مەمك. توورەکەی گوان.

شِمالاً: نَحوَ الشِمال/ ڕووە و باکوور. بەرەو باکوور.

شِمالي: مِن الشِمال. مَنسوب الى الشمال/ بەرەو باکوور.

شَمالي: مِن الشَمال. مَنسوب الى الشمال/ باکووری. لە باکوورەوە. دانیشتوانی باکوور.

شَمّام: شَموم. كَثير الشَمّ/ بۆن قایم. بۆن تیژ.

شَمّام: بَطيخ أصفر/ شەمامە.

شمبانزي: مِن القُرود/ مەیمونی شەمپانزی.

شَمِتَ بـ: فَرِحَ بِمُصيبَة أو بَلِيَّة غَيره/ بە خەمی شاد بوو. کە باسی خەمی یەکێکیان کرد وتی ئۆخەی.

شَمَّتَ: خَيَّبَ/ هیوای بڕی. نائومێدی کرد.

شَمَخَ. شَمَخَ انفَهُ أو بِانفِهِ: رَفَعَهُ مُتَكَبِّراً/ لووتی بەرزکردەوە. خۆی بڵند کرد. فیزی نواند.

شَمَخَ: عَلا/ بەرزبووەوە. بڵندبووەوە.

شَمَّرَ. شَمَّرَ: مَرَّ مُسرِعاً/ خێرا تێپەڕی. فرتەی کرد.

شمراخ. شُمرُخ: ساق النبات/ لاسك.

شَمَسَ: إمتَنَعَ وأبَى/ یاخیبوو. بەلاسە بوو. نەیکرد. سەرکێشی کرد.

شَمَسَ لَهُ: تَنَكَّر وأبدى له العَداوَة/ ڕقەبەرایەتی لەگەڵ کرد.

شَمَسَ. شَمِسَ اليَوْمُ: كانت الشمسُ فيه ظاهِرَةً/ هەتاو بوو.

شَمَسَ: حَرَنَ/ سەرکێشی کرد. چەمووش بوو. سەرکەش بوو. سەمەند بوو.

شَمَسَ الشيءَ: بَسَطَهُ وعَرَضَهُ الأشعة الشمس/ هەڵیخست. خستیە بەر خۆر.

شمس: مُشمِس/ هەتاو. ڕۆژی هەتاو.

شمس: النَيِّر العظيم/ خۆر. ڕۆژ. ئافتاو. خورشید.

شمس. شمِس: شامِس: لاغَيمَ فيه/ ڕۆژی سایەقە. هەتاو. سامالّ. بێ هەور.

أشعَة أو شُعاع الشَمس/ تیشکی خۆر.

حَمام شمس/ خۆهەڵستن لەبەرخۆر.

شُروق الشَمس/ خۆرهەلاتن.

ضَربَة شمس/ هەتاوبردن. خۆربردن.

ضوء أو ضِياء الشَمس/ ڕووناکی خۆر.

عابِد الشَمس/ خۆرپەرست.

عَبْد الشَمس: نَبات/ گوڵەبەڕۆژە.

عِبادَة الشَمس/ خۆرپەرستن.

غُروب الشَمس/ خۆرئاوابوون.

مَضروب بِلفحَة الشَمس/ خۆربردوو. خۆرانگاز.

واقِيَة شمس/ ئافتاوگەردان.

شمسي: مُتَعَلِّق بالشَمس/ خۆری. خۆرین. پەیوەند بە خۆرەوە.

حَرفٌ شمسي/ پیتەکانی زمانی عەرەبی دەکرێن بە دوو بەشەوە (قەمەری، شەمسی) (قمری) ئەوانەن لەکاتی خوێندنەوەدا (لام)ەکە دەردەکەوێت، بەڵام (شەمسی)ەکان (لام)ەکە لەکاتی خوێندنەوەدا دەرناکەوێت.

شَهرٌ شمسي/ مانگی هەتاوی.

صُورة شمسيَة/ وێنەی بەرخۆر.

سَنَة شمسيَة/ ساڵی هەتاوی.

النظام الشَمسي/ سیستەمی خۆر.

شَمسيَة: مَظَلَّة/ چەتر. کەپر. چەرداخ. سێبەر. سەیوان.

شَمَطَ. شَمِطَ شَعرُهُ: خالَطَ سَواد رأسه بَياض/ سەری بوو بە ماش و برنج. سپی تێکەوت.

شمطاء: أشمَط: رَمادِيُّ الشَعر. أشيَب/ سەر ماش و برنج. سەرپۆز. بێز.

عَجوز شمطاء: خَيزَبون. دَردَبيس/ پیرەژنی زۆر پیر. ئەنکە لووتەڵە. قرچۆڵ.

شَمَّعَ الشيءَ: غَمَس في الشمع. أكلى بالشمع/ لە مێچوی هەڵکێشا. مێوی تێهەڵسوو. مێوی لێدا.

شمع: شمع خام. موم العَسَل/ مێو. تیرەشان.

شمع الخَتم. شمع أحمر. خَتم/ مۆر. لۆك.

شمع العَسَل/ مێو. تیرەشان. شەمێ. کراژ.

شَمعَة: عَدد شمع/ مۆم.

شَمعَة الإشعال في السيارة/ پلەك.

شمعدان: وعاء الشَمع/ مۆمدان.

شمعي: كالشَمع. من الشَمع/ مێوین.

شَمَلَ. شَمِلَ: إشتَمَلَ. غَطى. تَضَمَّن/ تیابوو. بریتی بوو لە. پێکهاتبوو لە.

شَمَلَ. شَمِلَ: عَمَّ. سادَ/ بڵاوبووەوە. تەنیەوە. هەمووی گرتەوە.

شَمَلَ الشاةَ: عَلَّق على ضَرعِها الشِمال/ گوان بەستی پیاهەڵواسی. گوانی بەست.

شَمَلَهُ بِعِنايَتِهِ: راعاهُ. إهتَم بِهِ/ یارمەتی دا. دەستی یارمەتی بۆ درێژکرد. پشتگیری کردن

شَملٌ إتِحاد. ما إجتمع من الأمر/ یەکێتی. کۆ. چوونە پاڵ یەك.

جَمع الشَمل: إنضمام/ کۆبوونەوە. یەکگرتن. ڕێکەوتن. پێکهاتن.

إجتَمع شَملُهُم: تَفَرّق أمرهم/ بڵاوبوونەوە. بڵاوەیان لێکرد. پێکنەهاتن.

شَمْلَة: رِداء واسع/ کالاً. بەرگی فراوان و ئاوەلمان.
شَملَة الرأس: عِمامَة. عِصابَة/ مێزەر. سەرپێچ.
شَمَمَ: شَمَّ/ بۆنی کرد.
شَمَّمَهُ: جَعَلَهُ يَشَمُّ/ دایە بۆنی کا. وتی بۆنی کە.
شَمَم: عُلوّ. اِرتِفاع/ بەرزی. بڵندی.
شَمَم: تَکَبُّر. اَنَفَة/ لووت بەرزی. ترِوفیز.
شَمَندَر: شوندر. بنجر/ چەوەندەر.
شَمَندَر سُکَّري/ چەوەندەری شەکر.
شَمُوخ: تَشامُخ. تَکَبُّر. عِزّ/ لووتبەرزی. خۆ بە زل زان. بایی بوون.
شَمُوخ: تشامُخ. عُلوّ/ بەرزی. بڵندی.
شَـمُوس: حَـرُون/ سـەرکێش. چـەمووش. سەرکەش. سەمەندە. کەللەرەق. چەقاوەسوو. لاسار. بێ گوێ.
شَمُوس: مُشمِس: ذو الشمس لاغَيم/ ڕۆژی سایەقە. هەتاو. ساماڵ. بێ هەور.
شَمُول: إشتِمال. تَضَمُّن: إحتواء/ تیابوون. گرتن. گرتنەوە.
شَنَّ غارَةً. شَنَّ حرباً. شَنَّ هموم: وَجَّهَ. نَظَّمَ. قـام/ هێرشی بردە سەر. پەلاماری دا. هەڵمەتی برد.
شَنَّ القِربَةُ: خَلَقَت وَيَبِسَت/ مەشکە کۆن بوو. وشک بووەوە.
شَـنَأَ: ابغَـضَ مـع عَـداوَة/ رقـی لێهەڵگرت. دوشمنایەتی کرد.
شَـنار: عـار. خِـزي. فَـضيحَة/ ئابڕووچـوون. شوورەیی. نەنگی.
شَناعَة: بشاعَة. قُبح/ ناشیرینی. ئێسک قورسی. چارەگرانی.

شَـناعَة: فَظاعَـة. فَداحَـة/ سـامناکی. لـە ڕادەبەدەربوون.
شَنان: اُشنان. غاسول/ ئەسپوون. چۆخان. زرویَ.
شَنَب: شارِب/ سمێڵ.
شَنَجَ: تَشَنَّجَ تَقَبَّضَ. تَقَلَّصَ/ گرژ بوو. چەمام بوو. بە گیر وەستا. دەمار گرتی.
شَنَّرَ عليه: عابَه وفَضَحَهُ/ گاڵتەی پێکرد. ئابڕووی برد. شکانی.
شَنطَة: حَقيبَة/ جانتا.
شَنُعَ: قَبُحَ/ (ئێسک قورس. ڕەزا قورس. ناشیرین. چارەگران) بوو.
شَنَّعَ: قَبَّحَ. بَشَّعَ. ذَکر بالقبيح/ ناوی زڕان. قسەی شوێن خست. ئابڕووی برد.
شَـنِع. شَـنيع: قَبـيح المَنظَـر/ ناشـیرین. ئێسک قورس. ڕەزاقورس. چارەگران.
شَـنِع. شَـنيع: فَـظيع/ سـامناک. ترسـناک. لەڕادەبەدەر زۆر.
شَنعَة.. شَناعَة/ بەدکاری. خراپە.
شَـنَفَ إليـه: نَظَـرَ غليـه کـالمُعتَرِض عليـه أو المُتَعَجِّب منه/ بە سەرسامی و حەپەساوی سەیری کرد. واقی وڕما.
شَنَفَ إليـه: نَظَـرَ بمؤخر عَينَيه/ بە لایەکی چاو تێی ڕوانی.
شَنَف: قُرط. حَلَق/ گوارە. گوهار.
شَـنَقَ: أعـدَمَ شَـنقاً/ هەڵیواسـی. خنکـانی بـە هەڵواسین. لە سێداری دا. لە قەنارەی دا.
شَنق: حَبل/ پەت. گوریس.
شَنق: الإعدام شَنقاً/ هەڵواسین. لـە سێدارەدان. لە قەنارەدان. خنکاندن بە هەڵواسین.

طابَ العَیشُ: رَغُدَ/ گوزەران و ژیان خۆش و شاد بوو.

طاب له: راقَ له. سَرَّ/ پێی خۆشبوو. بە دڵی بوو. حەزی لێکرد. پەسەندی کرد.

طابَ نَفساً عن الشيء: تَرَكَ/ وازی لێهێنا. دەستی لێهەڵگرت. دەستبەرداری بوو.

طابَ المریضُ: شُفيَ/ چاکبووەوە.

طابَت لیلتکُم: لیلة سعیدة/ شەوباش.

طابَ: طَبَّبَ. داوىَ/ چارەی کرد. دەرمانی کرد. تیماری کرد.

طابِخ: طَبّاخ. طاهٍ/ چێشتکەر. چێشتلێنەر. شێوپەز. ئاشپەز.

طابِع: سَجیَّة/ خوو. ڕەوشت. رەفتار. ڕەوشت و خوو.

طابِع. طابَع: خاتَم. خَتم/ مۆر. شەقڵ. پوول. مۆرک.

طابع برید. بریدي/ پوولی پۆستە.

طابع مالي/ پوولی دارایی.

طابَقَ: ماثَلَ. شاكَلَ/ وەکو ئەوی بینی. لەوئەچی. وەکو ئەودایە.

طابَقَ: وافَقَ. ناسَبَ/ بۆی بوو. فیتی بوو. گونجا. ڕێکەوت.

طابَقَ: رَصَفَ. رَتَّبَ في طبقات/ چین چین ڕیزی کردن. خستنیە سەریەك.

طابَقَ الاشکال الهندسیَّة: جعل أحدهما على الآخر/ خستنیە سەریەك. لەر یەك جووتی کردن.

طابِق. طابَق: دَور. طَبَقَة من البیت/ نهۆم. قات.

طابور: کتیبة. قسم من الجَیش/ پەل. بەشێك لەسەرباز.

الطابور الخامس: المخابرات/ ئاگایی. ئاسایش.

طابوق: آجُر. قرمید/ کەرپوچ خشت.

طابوق أصفر/ خشتی نەباتی.

طابوق ناري/ خشتی سوور.

طابوق مُصَفرَج/ خشتی جۆش.

عامل الطابوق/ خشتبڕ.

عامل الطابوق/ خشتەنداز.

عمل الطابوق/ خشتبڕین.

طاجِن: مِقلاة/ تاوە.

طاحَ: تاهَ/ ونبوو. ڕێی ون کرد. ڕێی لێ تێکچوو. بزر بوو.

طاحَ: هَلَكَ/ تیاچوو. فەوتا. لەناوچوو.

طاحِن: طَحّان/ باراش هار. ئاشەوان. ئاشڤان. قەرباش.

طاحِن: سِنّ طاحِنَة: ضِرس/ خرێ. ددانی خرێ.

طاحِن: ضار. ضَروس/ بە زیان. زیاندار. وێرانکار. کاولکار.

طاحون. طاحونَة: مِطحَنَة/ هاڕەر.

طاحونة الیَد: رَحى/ دەستاڕ.

طاحونة الماء: یُدیرها الماء/ ئاشی ئاو. ئاسیاو.

طاحونة اهواء: یدیرها الهواء/ ئاشی با.

طاحونة: ماکنة الطحن/ ئاشەمەکینە. ئاشی ئارد.

حجر الطاحونة/ بەرداش. بەردی دەستاڕ.

طارَ: سَبَحَ في الهواء. حَلَّقَ/ فڕی، باڵی گرت. هەڵسا. هەڵفڕی.

طارَ الى: أسرَعَ الى/ بۆی چوو بە خێرایی.

طارَ صیتُه. طارَ له الصیت: إنتَشَرَ/ ناسرا. ناوبانگی سەند. ناوی دەرکرد.

طارَ طائِرُهُ: فَقَدَ صَوابَهُ/ تێکچوو. هۆشی نەما.

طار فرحاً: إبتَهَجَ. تَهَلَّل. طَرِبَ/ پێخۆشحاڵ بوو. لە خۆشیانا باڵی گرت.

طارِئ: عارِض. عرضي. غير مُنتَظَر/ کوتوپڕ. چاوەڕوان نەکراو. ناکاو.

طارِئ: غَرِيب. دَخِيل/ نامۆ. بیانی.

طارِئَة: داهِيَة/ کارەسات. بەسەرهات. بەڵا. بەڵا لابەلا.

طارِئَة: سُکّانٌ غَير أصلِيِّين/ بێگانە. داگیرکەر. نامۆ. بیانی.

طارَة: إطار. طَوق/ چێوە. کەمە. چەمە. ئەڵقە. بازن.

طارَدَ: لاحَقَ. تَعَقَّبَ/ شوێنی کەوت. دوای کەوت. ڕاوی نا. کەوتە دوی. بەدوایا گەڕا.

طارِد (فاعِل طَرَدَ): مُبتَعِد/ دوورخەرەوە. دەرکەر.

طارِف: حَدِيث. أحرِزَ حدیثاً/ تازە. تازەبابەتێ تازەدەهاتوو.

طارِق: قادِم لیلاً. زائِر لیلي/ میوانی شەو. بەشەو هاتوو.

طارِق: مَن يَطرُقَ. الذي يَطرُقُ/ کوتەر. لێدەر. پیاکێش.

طارِقَة: مُصِيبَة. داهِيَة/ دەردو بەڵا. کارەسات.

طازَج: جَدِيد. طَرِي/ تازە. نوێێ تەڕوبڕ.

طاس. طاسَة: إناء يُشرَب فيه الماء/ جام.

طاس. طاسَة: سلطانِيَّة. إناء كبير/ لەگەن. یەغدنکێش. قەرەوانە.

طاشَ: نَزِقَ. تَهَوَّرَ. خَفَّ عَقلُهُ/ هەڵچوو. هەڵەشەیی کردو کەرێتی نواند. تووڕە بوو.

طاشَ عَنِ الهَدَف أو الغَرَض: لم يُصِبهُ/ نەیپێکا. لێی نەدا. بەری نەکەوت.

طَأطَأَ رَأسَهُ: خَفَضَهُ/ سەری شۆڕکرد. دایەنەوان. کەچی کرد.

طأطأ الحُفرَةَ: عَمَّقَها/ چاڵەکەی قووڵ کرد. دایخست.

طَأطَأَ فُلانٌ من فُلانٍ: حَطَّ من قَدرِهِ/ سووکی کرد. لە بایەخی کەم کردەوە. بێبایەخی کرد.

طاعَ: أطاعَ. طاوَعَ. أذعَنَ/ ملی دا. سەری شۆڕکرد. قایل بوو. بە قسەی کرد.

طاعَة: إطاعَة. إذعان. خُضوع/ سەرشۆڕی. ملدان. قایلی.

طاعَة. وَلاء. بِرّ/ ڕێزگرتن. خۆشەویستی. دڵسۆزی.

طاعَة عَمياء/ ئەوپەڕی ڕێزگرتن و دڵسۆزی و ملکەچی و سەرشۆڕی. گوێڕایەڵی و ملکەچییەکی کوێرانە.

طاعَمَ: اكل مَعَ/ لەگەڵی خوارد.

طاعَمَ: أطعَمَ/ خواردنی کرد بە دەمیەوە. دەمی نایە دەمیەوە.

طاعِن في السِنّ: شَيخ/ پیر. بەساڵاچوو.

طاعون: مَرَض/ پوشانەوە. چاوەقووڵە. تاعوون.

طاعون بقري: مرض/ دەردەگا. لاڕەشە.

طاغٍ. الطاغي: مُستَبِد. ظالم/ زۆردار. ستەمکار. کەڵەگا.

طاغٍ: سائد. مُسَيطَر/ باو.

طاغِيَة: ظالم. مُستَبِد. متكبر/ زۆردار. ستەمکار. خۆ بەزل زان.

طافَ (حَولَ. بـ. على. في): دارَ. جالَ/ بە دەوریا سووڕایەوە. خولایەوە. پیاگەڕا.

**طافَ بالكَعبَة أو حَولها:** دارَ حَولَ الكَعبَة/ بە دەوری کابەدا سووڕایەوە. تەوافی کرد.

**طافَ بە:** طَوَّفَ. جالَ بە/ گەڕانی. سووڕانیەوە. گەشتی پێکرد.

**طافَ بە الخَیال:** حَلَمَ بە. أتاه في الحلم/ هاتە خەوی. خەوی پێوە دی. دڵفەی پێوە لێدا.

**طافَ الماءُ:** فاضَ/ ئاوهەڵسا. بوو بە لافاو.

**طافَ علی وَجه الماء:** عامَ/ سەرئاوکەوت.

**طافٍ. الطافي:** عائم/ سەرئاوکەوتوو.

**طافِح:** طفحان. ملآن. مُمتَلِيء. مُترَع/ پڕ. لێوان. سەرڕێژ.

**طافِح بِشراً:** مُبتَهِج/ ڕووخۆش. شاد. خۆشی لێ ئەبارێ.

**طاقَ: أطاقَ:** تَحَمَّلَ. قَدَرَ علیه/ بۆی کرا. پێی کرا. توانی بیکا. دەری برد. هەموار بوو. بەرگەی گرت.

**طاق:** قَوس/ کەوانە. تاق.

**طاقَة:** طَوق. قُدرَة. قُوَّة/ وزە. توانا. توانین. هێز.

**طاقَة:** إطاقَة. تَحَمُّل/ ئارام. دەربڕین. هەڵکردن. تاقەت.

**طاقة شمسیّة**/ وزەی خۆر.

**طاقة ذَرِیّة.** نَوَوِیّة/ وزەی ئەتۆم.

**طاقة حراریّة**/ وزەی گەرمی.

**طاقة کامِنة**/ وزەی مت.

**طاقة کَهرَبائیّة**/ وزەی کارەبا.

**طالَ:** إستطالَ. صارَ طویلاً/ درێژ بوو. درێژبووەوە.

**طالَ:** دامَ طویلاً/ زۆر مایەوە.

**طالَ بە الزَمَن:** إستغرقَ وقتاً/ زۆری خایان. درێژەی کێشا.

**طالَ علیه:** تَرَفَّعَ علیه. عَلاه/ خۆی بە زل گرت. خۆی بە زلتر گرت.

**طالَبَهُ:** طَلَبَ مِنهُ. داعاه/ داوای لێکرد. داوای لێکردەوە.

**طالِب:** مُستَدعٍ. مُلتَمِس. مُدَّعي الحَقّ/ خاوەن ماف. داواکەری مافی خۆی. داواکار. خوازیار.

**طالِب يَد إمرأة.** طالب زواج. خاطب/ خوازبێنی کار.

**طالِب:** مُطالِب. مَن يَطلُبُ/ داواکار. داخواز. خوازیار.

**طالِب عِلم:** تِلمیذ/ قوتابی. خوێنکار. شاگردی قوتابخانە.

**طالِح:** خِلاف صالح. شِرّیر/ چەتوون. خراپ. بەد. پیاوخراپ.

**طالَعَ:** قَرَأ/ خوێندیەوە. چاوێکی پیاخشان. سەیرێکی کرد.

**طالَعَ بـ.** أطلَعَ علی. أعلَمَ بـ. أخبَرَ بـ/ ڕایگەیان. ئاگاداری کرد. باسی کرد. وتی. درکانی.

**طالِع:** طَلوع. صاعِد/ سەرکەوتوو. سەرئەکەوێ. ئەچێتە سەرەوە.

**طالِع:** مایُتَفاءَل بە من السَعد أو النَحس/ بیرکردنەوەیەکی ڕەشبینی و ڕوونبینی. خۆم و بەختم.

**طالِع:** حَظّ/ شانس. بەخت. چارە. چارەنووس.

**طالِق: طالقة:** مُطَلَّقَة/ تەڵاقدراو.

**طالَما: لَطالَما:** کَثیراً ما. مِراراً/ زۆرجار. جارەها.

**طالَما:** مادام/ لەبەرئەوەی.

**طالَما أنّ.** بِما أنّ/ لەبەرئەوەی. بە هۆی.

**طامّة:** مُصیبة داهیة عظیمة/ کارەسات. بەڵای ناگەهان. جوورتم.

طامِث: حائِض/ ئافرەت لە خوێنا. بێ نوێژ. پۆنی.

طامِح. طماح. طَموح. مُحِبّ للشهرة والرفعة/ بەرزخواز. بەرزفڕ.

طامِع: طمّاع. مِطماع. تَوّاق. حريص/ چاوبرسی. چاوچنۆك. چلێس. بەتەماع.

طامَنَ: طَمأنَ. هَدَأ. سَكَّنَ/ دڵنیای کرد. هێمنی کردەوە. هێوری کردەوە.

طامور. طومار: دَرج. صَحيفة/ تۆمار. بابۆڵەپەڕاو. نوسراوی لوولەکراو.

طاه. الطاهي: طَبّاخ/ لێنەر. چێشتکەر. چێشتلێنەر. شیوپەز. ئاشپەز.

طاهِر: نظيف. نَقي/ پاك. خاوێن پوخت. پاكژ. پاقژ.

طاهِر: عَفيف. عُذري/ داوێن پاك. کچ.

طاهِر النَمل. طاهِر الذِمَّة. بَريء/ بێتاوان. بێئاگا.

طاهِر الذَيل: مستقيم. ساذِج/ ساویلکە. ڕاست. ڕاستگۆ.

طاو. الطاوي: جائِع/ برسی.

طاوَعَ (في. على): وافَقَ. خضَعَ/ لاری نەبوو. قایل بوو. ملی دا. سەری شۆڕکرد. بە گوێی کرد.

طاوَلَ: ماطَلَ. تَوانی/ دوایخست. درێژەی پێدا. دەستی دەستی پێکرد.

طاوَلَ: باری: نافَسَ. زاحَمَ/ بەربەرەکانی کرد. پێشبڕکێی کرد.

طاولة: مائدة/ مێزی نانخواردن. مێز. خوان.

لُعبَة الطاولة/ یاری تاوڵە.

حِجارَة الطاوِلَة/ پوولی تاوڵە.

طاووس: طائر جميل الريش/ تاووس.

طايَبَ: مازَحَ ولاعَبَ/ گاڵتەی کرد. یاری و گەمەی کرد.

طايِح: ساقِط/ کەوتوو. ڕووخاو.

طَبَّ. طَبَّبَ: داوى. عالَجَ/ چارەی کرد. تیماری کرد. دەرمانی کرد.

طَبّ: ئاني للأمور/ شێنەیی بوو. لەسەرخۆ بوو. بەکارەخۆ کاری ئەکرد.

طَبَّ/ وَقَعَ/ کەوت. زرمەی هات.

طِبّ: علاج الجسم والنفس/ پزیشکی. چارەکردن.

طِبابَة: حرفة الطبيب/ پزیشك گەری. پزیشکی.

طَبّاخ: طاه. طاهي/ لێنەر. چێشتکەر. چێشتلێنەر. شیوپەز. ئاشپەز.

طَبّاخ: فُرن. آلة أو جهاز الطَبخ/ تەباخ. کوورە. ئاگردان. فڕن. سووتگە. سێپا.

طِباخَة: صناعة الطبخ/ چێشتلێنان. شیوپەزی.

طَباخَة: طبخ/ پێشتکەری.

طَباشير: قلم كلسي/ تەباشیر.

طَبّاع: طابِع. مَطبَعي/ چاپکەر. چاپیار. پیت ڕێکخەر. چاپنوس.

طَبّاع: صانع لسيوف وأمثالها/ شیرگەر. چەقۆگەر.

طِباع: طَبع. خُلُق. سَجيَّة/ ڕەوشت. خوو.

طِباعة. طَبع. صناعة الطبع/ چاپەمەنی.

آلة طِباعَة/ ئامێری چاپ.

طَبّال: مَن يَضرب على الطَبل/ تەپڵ (ژەن. لێدەر). دەهۆڵ (ژەن. کوت).

طَبَّبَ: طَبّ. داوَى. عالَجَ/ چارەی کرد. تیماری کرد. دەرمانی کرد.

طَبَخَ: طَها. أنضَجَ الطعام/ خواردنی لێنا. کوڵاندی. دروستی کرد. پێی گەیاند.

طَبَخ: دَبَّرَ/ نایەوە. هەڵیگێڕسان. پێکی هێنا. دروستی کرد.

طَبَخَ الطعام: طَهَوَ/ لێنان. چێشت لێنان. پێگەیاندن.

طَبَخَ الطعام مَطبوخ/ خواردنی لێنراو. چێشت. ئاش. شیو.

طَبَر. طَبَر زین: فَاس/ تەور. تەورزین.

طَبَشَ في الماء: تَخَبَّطَ/ لە ئاودا شپلە شلپی بوو. شلپ و هوڕی کرد.

طَبَعَ الكتابَ: كَتَبَهُ بالجهاز/ چاپی کرد. لە چاپی دا.

طَبَعَ على: خَتَم. بَصَمَ/ مۆری کرد. پەنجەی پیانا. شەقڵی کرد. پەنجەمۆری کرد.

طَبَعَ النقودَ والدراهمَ: سَكَّها/ دراوی دروست کرد. سکەی لێدا.

طَبَّعَ. طَبَّعَ الإناء: مَلأَهُ/ پڕی کرد.

طَبَعَ على: فَطَر. تَفَطَّنَ/ کەپووی هەڵهێنا. کەپووی گرت.

طَبَعَ في الذهنِ: دَخَلَ واستقر في الذهن/ لەبەرکرا. چوە مێشکەوە.

طَبَّعَ الحيوانَ: رَوَّضَهُ/ ئاژەڵی ڕاهێنا. ماڵی کرد. دەستەمۆی کرد.

طُبِعَ على كذا: رُوِّضَ. عُوِّدَ/ پێی ڕاهات. خووی پێوەگرت. ڕسکا. ڕاهات.

طُبِعَ: إنطَبَعَ. كُتِبَ/ لە چاپ درا. نوسرایەوە. چاپکراوە.

طَبع. طَبع الأصابع: خَتم. بَصم/ مۆرکردن. پەنجەپیانان. پەنجەمۆر.

طَبع: طابع. طِباع. طبيعة: خُلق. سَجيَة. مِزاج/ خوو. ڕەوشت. ڕەفتار. شێواز.

بارِدُ الطبع/ خوێن سارد. لەسەرخۆ. دەمری.

حادّ الطَبع/ خوێن گەرم. تووڕە و تڕۆ.

طَبعُ الكتاب: كتابَته/ چاپکردن. لەچاپدان.

طَبعُ الحجر: كتابة ونقش على الحَجَر/ بەردهەڵکەندن. هەڵکۆڵین. لەسەر بەرد نووسین.

إعادة طبع/ لە چاپدانەوە. چاپکردنەوە.

آلة طَبع/ ئامێری چاپ.

تَحت الطَبع/ لەژێر چاپدایە.

حَقّ. حُقوق الطَبع/ مافی چاپکردن.

صِناعَة الطبع: طِباعَة/ چاپەمەنی.

طَبعاً: بِالطبع. يقيناً. بلا رَيب/ بێگومان.

طَبِع: دَنيء الخُلق/ بێئابڕوو. بەدخوو. بەدڕەوشت.

طَبع: طَبَع: الصَدَأ أو الدَنَس/ ژەنگ. پیسی.

طِبع. طَبَع: العَيب/ شووره‌یی.

سَيف طَبِع: صَدِيء/ تیغی ژەنگاوی.

طَبعَة: المطبوع من كتاب في المرة/ چاپکراو. چاپکردنێک. جارێک چاپکردن.

طَبَّقَ: نَفَّذَ/ بەجێی هێنا. جێبەجێی کرد. گەیاندیە ئەنجام.

طَبَّقَ: عَمَّ/ بڵاوبووەوە. بوو بە باو. هەموانی گرتەوە.

طَبَّقَ: غَطّى/ دایپۆشی. سەری نایەوە. سەری گرت.

طَبَق: غطاء/ سەرقاپ.

طَبَق: صَحن. قَصعَة/ قاپ. لەگەن. دەوری.

طَبَق: صينيَة/ سینی.

طِبق: مُطابِق. مُماثِل/ وەکو. هاو. وەکويەك. هاوتا. هاوجووت.

طِبقاً لـ: بِمَوجِب. بِحَسب/ بە گوێرەی.

طِبق الأصل/ دەقاودەق. کوتومت. وەك خۆی.

طِبق المرام/ وەك خواست. وەك پێویست.

طَبَقَة: دَرَجَة. صَفٌ. مَرتَبَة. رُتبَة/ پلە. پایە.

طَبقَة مِن البناء: دَور. طابِق/ نهۆم. قات.

طَبقَة من الناس. طبقة من طبقات المُجتمع/ چینی گەل.

طَبَقَة الصَوت. طبقَة النَغَم/ ئاواز. تۆن.

طَبَقَة العمال. الطبقة العاملة/ چینی کرێکار.

صِراع طَبَقي/ چینایەتی.

طَبَلَ. طَبْل: ضَرَبَ الطَبل/ تەپڵی (ژەن. لێدا). لە تەپڵیدا. دەهۆڵی کوت.

طَبل: صوت الطبُول/ تەپڵ لێدان. دەنگی دەهۆڵ.

طَبَل. طَبلَة: آلة التَطبيل/ تەپڵ. بالەبان.

طبل ذا وَجهَين/ دەهۆڵ. دۆڵ.

طَبلَة: طبل صَغير/ دومبوك.

طَبلَة الأذن: الأذن الوسطى/ پەردەی گوێ. گوێچکەی ناوەڕاست.

طَبَلَة العَمود: كَشفَة/ کۆتەڵە. تەپڵەکی سەرپایە.

طَبليَة: مِنضَدَة مُنخفِضَة/ تەپلەك.

طِبيّ: مُختَصّ بِصناعَة الطِب/ پەیوەندیدار بە پیشەی پزیشکیەوە.

طبيب: حكيم/ پزیشك. دوکتۆر. نۆژدار.

طبيب بيطري/ پزیشکی ئاژەڵ. بەیتاڵ. بەیتار. پزیشکی ماڵات.

طبيخ: طعام مطبوخ/ چێشتێ شیو. ئاش. لێنراو.

طبيعَة: القُوَة المكونَة للعالم المادي. عالم الكائنات/ سروشت.

طبيعَة: طَبع. خُلق. سَجيَة/ خوو. ڕەوشت. ڕەفتار. شێواز. خۆڕسك.

بطبيعَة الحال: طبعاً. حتماً/ بێگومان. هەروایە.

علم الطبيعَة/ زانیاری دەربارەی سروشت.

فَوق الطبيعَة. خارِق الطبيعَة/ ئەوپەڕی سروشت.

طَبيعي: منسوب الى الطبيعَة/ سروشتی.

طَبيعي: عادي. غير مُصطَنَع/ ئاسایی.

طَبيعي: بسيط/ سادە. ساکار. بەبێ دەستکاری.

طبيعي: فِطري/ زگماك. خۆڕسك.

طبيعيات: علم الطبيعيات. علم البحث عن الأشياء/ فیزیا.

طَجَنَ. طَجَنَ الطعامَ: قَلَى/ سووری کردەوە.

طِحال: غُدَة إسفنجيَة في الجسم/ سپڵ. ئەسپۆڵ. فاتەڕەشە. بێدە. بێدە.

طَحَنَ. طاحِن: صانِعُ الطحين. صاحب المطحنة/ ئاشەوان. باراش هاڕ. مێرئاش. ئاشقان. ئاسیاوان. قەڕاش.

طَحانَة.. طاحون/ ئاش. ئاسیاو.

طُحلُب. طحلب: حَراز. اشنَة/ قەوزە. چووزەوارە. کەڤز.

طَحَنَ. طَحْنَ: سَحَنَ. دَقّ/ هاڕی. وردی کرد. کردی بە ئارد.

طَحن: سَحن. سَحق/ هاڕین. وردکردن.

طحن: طَحين. دَقيق/ ئارد. هاڕاو.

طَحيني: دقيقي. كالدقيق/ ئاردین. وەك ئارد.

طَرّ: شَحَذ. سَنّ/ تیژی کرد. دەمەزەردی کرد. ساوی دا.

طَرَّ: نَما. طَلَعَ/ ڕوا. دەرهات. مووی لێهات. سمێڵی کرد.

طُرّاً: جَميعاً/ هەموو. هەمووان. بە کۆمەڵ.

طَرَأَ: حَدَثَ/ ڕووی دا. لەپڕ لەناکاو ڕوویدا.

طَرَأَ عليه: فاجاهُ. جاءَهُ فُجاةً/ کوتوپڕ هات. لە ناکاو هات.

طَرَأَ له: خَطَرَ لَهُ/ هات بە بیریا.

طَرُؤَ النباتُ: لانَ. كانَ غَضاً/ نەرم بوو. پاراو بوو. تەڕ بوو.

طَرّىَ: لَيّنَ/ نەرمی کردەوە. پاراوی کرد. شلی کردەوە.

طَرّىَ الذاكِرَةَ: أراحَ/ پشووی دا. پشووی بە مێشکی دا.

طَرّاد: طَرّادَة. سفينة حربية/ کەشتی جەنگ.

طِراد: مُطارَدَة. مُلاحَقَة/ ڕاونان. دوواکەوتن. شوێنکەوتن. ڕادوونان. ڕاوەدونان.

طَرّاز. مُطَرِّز. مَن يَطرِزُ/ چنەر.

طِراز: شَكل. نَوع. نَمَط/ جۆر. چەشن. شێوە. تەرز.

طِراز: أسلوب. طريقة. نَسَق/ چۆنیەتی. ڕێگە. ڕێباز. شێواز.

من الطِراز الأول: قديم/ کۆن. مۆدێلی کۆن. شێوازی کۆنز کۆنەپەرست.

طِرازة: تَطريز. تَزيين. زَخرَفَة/ نەخشاندن. چنین.

طَرافة: كَون الشيء طريفاً/ دانسقە. نامۆ. دەگمەن. شتێکی سەیر.

طَراوَة: لُيونَة/ نەرمیەز نەرم و شلی. پاراوی. ناسکی.

طَراوَة: بَلَل. رُطوبَة/ شێ. شێداری. تەڕی.

طَراوَة: هواء بارد. نَسيم/ کزە بای سارد و فێنک. شەماڵ.

طَرِبَ: جَذِلَ. فَرِحَ. اصبح مسروراً مُنشَرِحَ الخاطر/ دڵشاد بوو. دڵخۆش بوو. دڵی کرایەوە. گەشکە گرتی.

طَرَّبَ: أطرب. فَرَّحَ. أبهَجَ/ شادمانی کرد. دڵخۆشی کرد. کەیفی دایە. هێنایە جۆش.

طَرَّبَ: غَنّى/ گۆرانی وت. چڕانی. دەنگی لێهەڵبڕی. چریکانی.

طَرَب: جَذَل. نَشوَة. فَرَح/ خۆشی. شادی. دڵشادی. گەشکەبوون.

طَرَب: غِناء. موسيقي/ گۆڕان. ئاواز. بەزم. بەز و ڕەزم.

آلة طرب/ ئامێری ژەندن. ئامێری بەزم و ڕەزم.

طَرِب: جَذِل. نَشوان. مُهتَز فَرَحاً/ شاد. شادمان. دڵشاد. پێخۆشحاڵ. گەشکەدار. دڵخۆش.

طِربال: مَعلَم. مايُشاهَد مِن بَعيد/ نیشانە. کەڵەکەبەرد. ڕێ نیشان.

طَربوش: طُربوش: لباس للرأس/ فێست. فێس. فەسکول.

طَرَبيزَة: طاوِلَة صغيرة/ تەپلەک. مێزی بچووک.

طُرَّة: طَرَف كل شيء وحاشِيَتُه/ کەنار. لێوار. قەراخ.

طُرَّة: خاتم. عَلامَة ملوكية/ مۆر. مۆری شاهانە.

طَرَحَ: رَمى. ألقى. قَذَفَ/ هاویشتی. فڕێیدا. هەڵیدا. تووڕیدا.

طَرَحَ: حَسَمَ. إقتَطَعَ. اسقَطَ عدداً من اكبر منه/ دایشکان. لێی دەرکرد.

طَرَحَ: خَلَعَ/ لایبرد. لێی کردەوە.

طَرَحَ الثوبَ عليه: البَسَهُ/ جلى لەبەركرد. كرديە بەرى.

طَرَحَ (سؤالاً. قَضيَةً. فكرَةً. موضوعاً): أثار. عرض. سَألَ/ پرسيارى كرد. باسێكى كردەوە.

طَرَحَ الحُمُولَةَ: رَماها/ بارەكەى خست. دايگرت.

طَرَحَ مسالةً على التصويت: وضعها في الاقتراح/ كێشەكەى خستە دەنگدانەوە.

طَرَحَ الغطاء عليه: غَطّاهُ/ دايپۆشى. سەرى نايەوە. داى بە سەريا.

طَرَحَهُ على الارض: رَماهُ/ داى بە زەويدا. كوتاى بە زەويدا. خستى.

طَرَحَت الحُبلى: أجهَضَت/ لەبارى چوو. بەرى فرێدا. بەرەكەى خست.

طَرَّحَ الحُبلَى: أجهضها. صَيَّرَها تُطرَحِ/ (بەرەكەى. سكەكەى) پىْ فرێدا. لەبارى چواند.

طَرح في الحساب: إسقاط عدد من عدد/ دەركردن. لێدەركردن.

طَرح: خَسم. خَصم/ داشكاندن. كەمكردنەوە.

طَرح: نَبذ/ وازهێنان. دەستلێهەڵگرتن.

طرح: إلقاء. رَمي/ هاويشتن. فرێدان. هەڵدان. تووڕدان.

طرح الجنين: إسقاط/ بەرفرێدان. لەبارچوون.

طرح (سؤال. قضية. فكرة. موضوع): إثارة. عرض/ پرسياركردن. كردنەوەى باسێك و ورووژاندنى.

طرح: جهيض. سقط/ لەبارچووز بەرى فرێدراو.

طَرحَة: وِشاح. خِمار/ پەچە. پووپۆش.

طَرخون: نبات/ تەرخون.

طَرَدَ. طَرَّدَ: أطرد. أبعَدَ/ دوورى خستەوە.

طَرَدَ: نَفى/ شاربەدەرى كرد. ئاوارەى كرد.

طَرَدَهُ من عَمَلِه: فَصَلَهُ/ دەستى لە ئيش كێشايەوە. دەريكرد. لەسەر ئيش لايبرد.

طَرد: إبعاد/ دوورخستنەوە. لادان.

طَرد: نَفي/ شاربەدەر كردن. دەرپەڕاندن. ئاوارەكردن.

طَرد: فَصل/ دەركردن. دەست لە ئيش كێشانەوە.

طَرد: رُزمَة/ پێچراوە. نێرراو.

طردي: مُباشر/ يەكسەرى. ڕاستەوخۆ. ڕاستەولانە.

طَرزٌ في المَلبَس: تأنُّق/ جلەكانى كەشخە بوون. كەشخەى لەبەر دەكرد.

طَرَّزَ ثوباً: زَيَّنَ. وَشّى/ جلەكانى نەخشى تياكرد. نەخشاندى. جوانى كرد. ڕازانديەوە.

طَرز: طِراز. شَكل. نَمَط. نوع/ جۆر. چەشن. شێوە. شێواز.

طَرز: هيئَة/ ديمەن. شێوە.

طِرس: صَحيفَة. وَرَقَة/ پەرەكاخەز. لاپەڕە.

طَرِشَ: صَمَّ. ذَهَبَ سَمعُهُ/ كەڕ بوو. گوێى كەڕ بوو.

طَرش. طَرشَة: صَمَم/ كەڕى. نەبيستن.

طَرش: البَقر والثيران/ ڕەشەوڵاخ. گاو مانگاو گامێش.

طُرطُور: الرجل الطويل الدقيق/ زەلامى درێژ و باريك. بالأبەرزى لەڕ. دارى واوەيلا.

طُرطور: قَلَنسُوَة أو غِطاء طويلا للرأس/ كڵاوى قووچ.

طَرَفَ بِعَينِه. طَرَفَ بَصَرَهُ: رَمَشَ. أطبَقَ أحَدَ جِفنَيهِ على الآخر/ چاوى تروكان.

طَرُفَ: كان طريفاً/ ڕووخۆش و خۆش نوود بوو.

طَرَّفَ: جَعَلَهُ في الطَّرَفِ/ خستیە سەرپەڕ.

طَرَفٌ: حَدّ. مُنتَهى/ پەڕ. سەرپەڕ. قەراخ.

طَرَفٌ: جانب. ناحِيَة/ تەنیشت. لا.

طَرَفٌ: عُضو. أطراف البَدَن/ پەل. چوارپەل. دەست و قاچ.

طَرَفٌ: فَريق/ دەستە. کۆمەڵ. لا. لایەن. تیم.

طَرَفُ الرَجُلِ: أقارِبُهُ/ خزم و کەسوکاری پیاو.

طَرَف (الجمع أطراف). أطراف البَدَن: اليَدان والرجلان والرأس/ دوودەست و دوو قاچ لەگەڵ سەردا.

أطراف المدينة: ضواحيها/ دەوروبەری شار.

الأطراف المتعاقدة/ لایەنە پێکهاتووەکان.

مُترامي الأطراف: فَسيح. عريض. واسِع/ پان. بەرین.

طَرَفَي النهار: صَباح ومساء/ بەیانی و ئێوارە.

على طَرَفَيِ النَّقيض: عل خِلاف/ دوو بەشی دژ بە یەك. دوو باوەڕی لەیەك نەچوو.

مِن طَرَفٍ: مِن قِبَل/ لەلایەن.

أخلى طَرَفَهُ: أخلى سبيلَهُ/ بەرەڵای کرد. بەریدان ئازادی کرد.

طَرفٌ: عَين/ چاو. دیدە.

طَرفٌ: نَظرَة/ سەیرکردنێك. تیلایی.

طَرفٌ: طَرَف. حَدّ. مُنتَهى/ پەڕ. سەرپەڕ. قەراخ. لا. ئال.

إرتداد الطَرف: لَمحَة/ چاوتروکان. چاوتروکانێك.

كَلِرتِداد الطَرف: في لمحة أو طَرفَة عَين/ لەچاوتروکانێکدا.

مِن طَرفٍ خَفي: خِلسَةً. خِفيَةً/ بەدزیەوە. بەلاتیرە. لەژێرەوە.

نَظَر بِطَرفٍ خَفي: غَضّ مُعظَم عينه/ بەدزیەوە. بەلاتیرە سەیری کرد و ڕوانی.

طَرِفٌ: رِغيب العَين/ چاوچنۆك. هەرچی ببینێ ئەیەوی بۆ خۆی بێت.

رَجُل طَرِفٌ: حَديث نِعمَة/ تازەپیاکەوتوو.

طَرِفٌ: مَن لايَثبُت على الأمر أو المكان أو الصاحِب/ ڕاڕا. دوودڵ.

طَرفاء: شَجرة/ دارگەز.

طُرفَة: طَريفَة. مُلحَة. الكلمة الحُلوَة/ قسەی خۆش. بۆ پێکەنین. نوکتە.

طُرفَة: تُحفَة/ نایاب. نادیدە.

طَرَقَ: خَبَطَ. دَقّ. ضَرَبَ/ لێیدا. پیاکێشا.

طَرَقَ الباب: قَرَعَهُ. دَقَّهُ/ لەدەرگای دا.

طَرَقَ سَمعَهُ أو مَسامِعَهُ أو أذنه/ بەرگوێی کەوت. بیستی.

طَرَقَ طريقاً: داسَهُ/ ڕێگەیەکی گرت. پیاڕۆیشت.

طَرَقَ مَوضوعاً: ذَكَرَهُ/ لە باسێك دووا. باسی لێوە کرد.

طَرَقَ: أتى ليلاً/ بەشەو هات.

طَرَقَ الحنطةَ: غَرَبَلَها/ گەنمەکەی لە بێژنگ دا. کردی بە بێژنگدا. بێژایەوە. پووچەڵی لێکرت.

طَرَقَ الصّوفَ: نَتَفَهُ/ شیکردەوە.

طَرَقَ. طَرَّقَ المَعدَنَ: رَقَّقَهُ ومَدَّهُ/ کانزای کوتا. تەنکی کردەوە. باریکی کردەوە.

طَرق: دَقّ. خَبط. ضَرب/ لێدان. پیاکێشان. کوتان.

طَرقَة: دَقَّة. خَبطَة/ لێدانێك. پیاکێشانێك.

طَرقَة: مَرَّة. دُفعَة/ جار. كەڕەتێ جارێك. یەك كەڕەت.

طَرُو: طَرِي. لَيِّن. جَديد/ نەرم. نەرم و شل. پاراو. تازە. سەوز. نوێ.

طَرُوب: مَرِح/ ڕووخۆش. ڕوو بە پێكەنین. قۆشمە.

طَرُوق: قابِل للطَرق. مَطيل/ پان ئەكرێتەوە. (ئەشێ. ئەگونجێ) بۆ پانكردنەوە.

طَرِي. طَرُو. لَيِّن. جَديد/ نەرم. نەرم و شل. پاراو. ناسك. تازە. سەوز. نوێ.

طَريح: مَطروح. مُنطَرِح. مُلقَى/ فڕێدراو. هاوێژراو. كەوتوو.

طَريح الفِراش: نائم. مَريض/ نەخۆشێ دەربەدەر. نوستوو. كەوتوو لە جێگەدا.

طَريد: مَطرود: مُبعَد/ دەركراو. دووورخراو.

طَريد: هارِب/ ڕاكردوو. دەربەدەر. لانەواز.

طَريد: يوم طويل/ ڕۆژی درێژ.

الطَريدان: الليل والنهار/ شەو و ڕۆژ.

طَريد العَدالَة: محروم من حِمايَة القانون/ ڕاكردوو لە ترسی یاسا. فیرار. یاخی.

طَريف: حديث نِعمَة/ تازەپیاكەوتوو. تازە دەوڵەمەند.

طَريف: نادِر. غَريب/ نامۆ. دەگمەن. دانسقە. نۆیەرە.

طَريفَة: طُرفَة. مُلحَة. الكلمة الحُلوَة/ قسەی خۆش. بۆ پێكەنین. نوكتە.

طَريق: سبيل. مَسلَك/ ڕێ. ڕێگا. ڕێگە. ڕاڕەو. ڕێ و بان.

طَريق: شارِع/ شەقام. شاڕێ. جادە.

طريق. مَطروق/ ڕێگا. بەڕێگاكراو.

عن طريق. من طريق. بطريق. بواسطة/ بە هۆی. لە ڕێی.

طريق مختصرة: قصيرة/ قەدبڕ.

طَريقَة: أسلوب: كَيفيَة/ شێواز. شێوە. سەمت. چۆنیەتی. ڕێگە. ڕەفتار. ڕێڕەو. چۆنیەتی.

طَريقَة: وَسيلة. واسطة/ هۆ.

طَريقَة: مَذهَب/ ڕێباز و بیروباوەڕ و بۆچوونی ئایینی.

طَشَّت السماءُ: أمطرت مطراً خفيفاً/ نمەیەك باری.

طَشَّ الماءَ: رَشَّهُ/ ئاوی ڕژان.

طَشّ. طَشيش: المطر الضعيف/ نمەباران. بارانێكی كەم. ڕشێنە.

طَشت: إناء كبير و واسع/ تەشت.

طَعام: طُعمَة. أكل. قوت/ خۆراك. خۆرشت. خواردن. نان.

تناول الطعام/ خواردن. نان خواردن.

طعام بايِت: قديم/ شەوەسارە. شەوپاتە.

طَعِمَ: تَطَعَّمَ: ذاقَ/ تامی كرد. چەژنی. چەشتی. چێژتی.

طَعِمَ الطعامَ: أكَلَ/ خواردی. خواردنی خوارد.

طَعَّمَ الغُصنَ: زَرَعَ فيه غُصناً من غير نبات. غَرَزَ/ موتوربەی كرد.

طَعَّمَ (في الطب): لَقَّحَ. زَرَقَ/ كوتای. دەرزی لێدا.

طَعَّمَ الخشبَ أو المعدن: رَصَّعَ/ نەخشانی. تێی گرت.

طَعم: مَذاق. لَذَّة/ تام. مەزە. خۆشی. شادی.

طُعم: سَمّ/ ژارماسی.

طَعم: لُقاح/ كوتان. دەرمان و دەرزی كوتان.

طَمَع: رَشوَة/ دەم چەورکردن. بەرتیل.

طَمَع: مغواة/ دان بۆ ڕۆکردن.

طُعمة: طعام/ خۆراك. خۆرشت. خواردن. نان.

طَعَنَ: وَخزَ. شَكَّ/ پیاچەقان. تێوەی ژن. پیاکرد. ئاژنی.

طَعَنَ في السِنّ: شاخَ/ پیر بوو. چووە ساڵەوە. بەساڵاچوو.

طَعَنَ (في. على): قَذَفَ. شَهَّرَ بـ. عابَ. قَدَحَ. ذَمَّ/ قسەی پێوت. جنێوی پێدا. ناوی زڕان. ئابڕوی برد. شکانی.

طَعَنَ في حكم قضائي. قَدَّ. إستأنف/ پەرچی فەرمانی دادگای دا. داوای تێهەڵچوونەوەی کرد.

طَعَنَ في القَول: فَنَّدَ. دَحَضَ. كَذَّبَ/ بە درۆی خستەوە.

طَعن: وَخزَ/ پیاچەقانز پیاکردن. ئاژنین. تێوەژەندن.

طعن: قَذف. تشهير. قَدح/ قسەپێوتن. جنێو. پلارتێکردن. ئابڕووبردن. شکاندن. توانج.

طَعن في صِحّة شيء أو حكم: تكذيب/ بەدرۆخستنەوە.

طعن في حكم قضائي: إعتراض/ پەرچدانەوەی فەرمان. داوای تێهەڵچوونەوە کردن.

لامَجال للطعن: لاإعتراض عليه. ثابت. مُقرّر/ دەقی بەستووە. پەرچنادرێتەوە.

طَعنَة: وَخزَة/ پیاکردن. تێچەقان. تێوەژەندن.

طَغا. طَغى: جاوَزَ القَدرَ والحَدَّ/ لە ڕادەبەدەر بوو. لە تام چووە دەرەوە.

طَغا. طَغَى السَيلُ: أتى بماء كثير. إرتفع. فاضَ/ ئاوەڵسا. لافاو هات.

طغى: إستَبَدَ. تَجَبَّرَ/ زۆر و زۆرداری نواند. زۆردار بوو.

طَغى على: ساد. سَيطَرَ. عَمَّ/ بڵاوبووەوە. باوی سەند.

طَغام. طَغامَة: أوغاد الناس. رعاع. عامة الناس/ هەرچی و پەرچی. گەجەر و گوجەر.

طُغمَة: جَماعَة. زُمرَة/ کۆمەڵێ دەستە. چەند کەسێك.

طُغومِيَّة: حُمق ودَناءَة/ کەرێتی. کار ناپەسەند.

طُغيان: ظُلم. إستبداد. عُتو/ ستەم. ستەمکار. زۆر و زۆرداری. جەور.

طُغيان: فيضان/ لافاو. ئاوەڵسان.

طُغياني: إستبدادي/ زۆردارانە. زۆرداریانە. بێدادیانە.

طَفَّ: دَنا/ نزیکبووەوە. هاتەپێشەوە.

طَفَّ: عَلا. صَعَدَ/ سەرکەوت. بەرزبووەوە. بەرزی کردەوە.

طَفّ: جانب. شاطيء. فِناء الدار. سفح الجبل/ تەنیشت. ڕۆخ. حەوشە. لاپاڵ.

طَفيءَ: إنطَفَأ. إنخَمَدَ/ کوژایەوە. دامرکایەوە. ئاگر کوژایەوە. ڕووناکی کوژایەوە.

طَفا: عامَ. عَلا فوقَ الماء. بَرَزَ. ظَهَرَ/ کەوتە سەر ئاو. سەرئاو کەوت. سەرکەوت. دەرکەوت.

طَفا: إشتَدَّ عَدوَهُ/ گورجی دایە.

طُفاحَة: طَفاوَة. زَبَد. رَغوَة/ سەرتوێژ. کەف.

طُفال: طَفَل. طين. طين خزفي. صَلصال/ قوڕی گلێنە. تەمۆخ. تەموخ.

طَفالَة: طَفَل. طُفولَة. سِن الطُفُولَة/ مندالّی. سێرە و تەمەنی مندالّی.

طَفالَة: الإحتفاظ. بخصائص الطفولة. عَودة الى الطفولة. تَأخُرَ البُلوغ/ گەڕانەوە بۆ ئەقلّی مندالّی. مانەوە لە ئەقلّی مندالّیدا. گەورەنەبوون.

طَفاوَة. طُفاحَة. رَغوَة/ كەف. سەرتوێژ.

طَفاوَة: دارَة. هالَة/ خەرمانە. خەرمانەی مانگ.

طَفَحَ: إمتَلأ. فاضَ/ پڕبوو. لێوان بوو. سەرڕێژ بوو.

طَفَحَ الكَيلُ: لايُحتَمَل. لايُطاق/ هەموار ناكرێ. لە تاقەت دەرچوو.

طَفَّحَ. طَفَحَ: أطفَحَ. اَزغَ. ملأ/ پڕی كرد. سەرڕێژی كرد.

طَفح: طُفوح. زيادَة الإمتلاء. فَيض/ پڕبوون. پڕی. سەرڕێژكردن. لێڕژان.

طَفح جِلدي: حَصَن/ لیر. گەرمەژنە.

طَفحان: طافِح. مُمتَليء. مُترَع/ پڕ. لێوان. سەرڕێژ.

طَفحان: البَليد الكسلان/ گەمژە و تەمەڵ. تەوەزەل.

طَفَرَ: وَثَبَ/ بازی دا. قەلّەمبازی دا. هەلّبەزیەوە.

طَفَرَ مَرَحاً: تَوَثَّبَ سروراً/ لە خۆشیانا هەلّنەپەڕی.

طَفرَة: وَثبَة/ باز. قەلّەمباز.

طَفرَة: تَبَدّل فُجائي. تَغَيُّر أساسي/ گۆڕانكاری. گۆڕانێكی كوتوپڕی.

طَفرَة: إزدهار. إنتعاش/ بووژانەوە.

طَفرَة: بُثُور تَعلو البَدَن/ لیر. زیپكە.

طَفَّفَ: قَتَّرَ. بَخَلَ/ دەستی گرتەوە. ڕژدی كرد. چرووك بوو لەگەلّ مالّ و منداڵیا.

طَفَقَ: طَفِقَ يَفعَل كذا: إبتَدَأ/ دەستی پێكرد. دەستی دایە. تێهەلّچوو.

طَفَقَ بِمُرادِه: ظَفَرَ/ بە ئاواتی خۆی گەیشت. دەستی كەوت.

طَفَّلَك نَعَمَ. صار واصبَحَ ناعماً لَيِّناً. طرياً/ نەرم و شل بوو. ناسك بوو.

طَفَّلَ. تَطَفَّلَ/ هەلّسوكەوتی منالّانەی كرد.

طَفَل: طَفالَة. طُفُولَة. سِنّ الطُفُولَة/ مندالّی. سێرەی و تەمەنی مندالّی.

طَفَل. طَفَل: طُفال. صلصال. طين خزفي/ قوڕی گلێنە. تەموخ. تەموخ.

طِفل: ولد صَغير. المولود الصغير/ مندالّ. ساوا. زارۆ. زارۆلە. زارۆك. زاولە. كۆرپە.

طِفل دارِج: يَدُبّ/ گاگۆلكێ ئەكا. ساوای پێڕموكە. خەریكە پێ ئەگرێ.

طِفل: الصَغير من كل شيء/ بچووكی هەموو شتێ. بەچكە. بێچوو. جووجەلّە. جوورچە.

طِفلي: طُفُولي: مُختَص بالأطفال/ مندالّانە.

طَفَوْ: طفُوّ: عَوم/ سەرئاوكەوتن.

طَفُو. طفُوّ: بروز. ظُهور/ بەرزبوونەوە. هەلّتۆقین.

طُفُوح: طفح. زيادَة الإمتلاء. فَيض/ پڕبوون. پڕی. سەر ڕێژكردن. لێڕژان.

طُفولَة: طَفالَة. طَفَل. سن الطفولة/ مندالّی. سێرەو تەمەنی مندالّی.

طَفيف: قَليل. ضَئيل. زَهيد/ كەم.

طُفَيلي: يَعيش على غيره. وارش/ مشەخۆر. دیقەلّان. مفت خۆر. لاكوت. زك لەوەڕێن.

طُفَيلي: مُتَدَخِّل في مالايَعنيه/ خۆتێهەڵقوتێن. لاپرسەنگ. لاپرسەن.

طَقَّ: طَقطَق. فَرقَع. إنفَجر. اخرج صَوتاً/ تەقیەوە. تەقەی هات. قرچەی کرد.

طَقس: حالة الجوّ/ کەش. ئاووهەوا. کژ. سەقا.

طَقس ديني: شَعيرَة/ نەریتی ئاینی.

طَقطَقَة: فَرقَعَة/ تەقەتەق. تەق و هوڕ. قرچەقرچ. قرچ و هوڕ.

طَلّ: ظَهَرَ/ دەرکەوت.

طَلّ. طُلَّ الدَمُ: هُدِرَ او لم يُثأَر له/ خوێن ڕژا. خوێن بە فیڕۆ چوو. تۆڵەی نەکرایەوە.

طَلَّا السَماءُ الارضَ: قَطَرَت عليها الطَلّ/ نمەباران باری. شەونم باری.

طَلّ: مَطَر خَفيف/ نمەباران. ڕشێنە.

طَلّ: نَدى/ شەونم. خوناو. خوناوکە. خناڵ.

طَلىَ: دَهَنَ/ چەوری کرد. بۆیەی کرد. تێی هەڵسوو.

طَلىَ: غَشّى. مَوَّهَ.كَسىَ بِطَبَقَة/ داپۆشی. تێیگرت. تێهەڵسوو.

طَلىَ بالذَهَب: مَوَّهَ بالذَهَب/ زێڕپۆشی کرد. ئاڵتوونی تێگرتز بە زێڕ ڕووکەشی کرد.

طِلاء: غِشاء. دِهان/ بۆیە. ڕووکەش.

طِلاء: طَلي. تَكسِيَة/ بۆیەکردن. ڕووکەش کردن. داپۆشین. تێهەڵسون.

طِلاء بالذَهَب: تَذهيب/ زێڕکەفت.

طَلّاب: كَثير المطالب/ زۆرداوا ئەکا.

طَلاسَة: مِمحاة/ تەختەسڕ.

طَلاق: تطليق. تفريق/ جیابوونەوەی ژن و مێرد. تەڵاق.

طلاق بالثلاثة/ تەڵاقی سێ بە سێ.

طَلاقة: صَراحَة. سُهولة/ ڕاستگۆیی. ڕاستبێژی. ئاشکرابێژی.

طلاقة اللسان: فَصاحَة/ زمان پاراوی. زمان ڕەوانی. زمانی پاراو و ڕەوان.

طلاقة الوَجه/ إبتهاج/ ڕووخۆشی. ڕووی خۆش.

طَلاوَة: طِلاوَة: جَمال. حُسن. بَهجَة/ جوانیز جوان پۆشی. ڕێك و پێکی. ڕازاوەیی.

طَلَبَ: سَعَى في الحصول على: بَحَثَ. حاول إيجاده/ هەوڵی بۆ دا. کۆششی بۆ کرد. بۆی گەڕا. گەڕا بە دوایا.

طَلَبَ الشيءَ: أراده. رَغِبَ فيه/ ویستی.

طَلَبَ: إستَدعى/ بانگی کرد. ناردی بە شوێنیا.

طَلَبَ إليه: إلتَمَس. تَوَسَّل/ تکای کرد. سکاڵای کرد. پاڕایەوە.

طلب مِنهُ: سَأَلَهُ/ پرسی پێکرد. پرسیاری لێکرد.

طَلَبَ فتاةً. طَلَبَ يَد فتاة: خطبها. أراد الزواج منها/ خوازبێنی کرد. داوای کچی کرد.

طلب بالدَمَ: حاول أخذ الثأر/ بۆ تۆڵەسەندنەوە ئەگەڕاز داوای تۆڵەی ئەکرد.

طَلَبَ: تَطَلَّبَ. إمتَضى. إستلزم/ پێویست بوو. ئەبوایە. وا پێویستی ئەکرد.

طَلَب: نَشد/ داواکردن. داخواز. خواست.

طَلَب: سؤال/ پرسیار. پرسکردن. پرسیارکردن.

طَلَب: إقبال/ پرسیار. پرس کردن. پرسیارکردن.

طَلَب: إقبال/ داوا لەسەر بوون. ویستن.

طَلَب: تَوَسُّب/ پاڕانەوە. لاڵانەوە. سکاڵاکردن.

طلب إلتماس/ تکا. تکاکردن.

طلب: لزوم. إقتضاء/ پێویست بوون. پێویستی. گەرەك. گەرەك بوون.

طَلَب: مُطالَبَة/ داواكردنەوە.

طَلَب: أمر/ فەرمان.

(تَحتَ. عِندَ. حِينَ. لَدى) الطَّلَب/ لە كاتی خۆیدا. لە كاتی داواكردندا.

حَسَب الطلب: مُوصى عَلَيه/ بە گوێرەی داوا.

عَلَيه طَلَب/ داوای لە سەرە.

طلب: طِلبَة. طَلَبَة: مايُطلَب/ ئەو شتەی داوادەكرێ.

طَلبَة: دُعاء مخصوص/ نزا و پاڕانەوەیەكی تایبەتی. خواست.

طَلبِيَّة: طلب تجاري. مجموعة بضاعَة/ كۆمەڵە شتێكی داواكراو بۆ بازرگانی لە هاتندا.

طَلَحَ: أعيا وتَعَبَ/ هیلاك بوو. كفت بوو. شەكەت بوو. ماندوو بوو.

طَلَحَ: خلاف صَلُحَ. فَسَدَ/ خراپ بوو. خراپەی كرد.

سطَلح: شَجَر السَنط/ ئەكاسیا.

طَلح: تَعِب/ هیلاك. كفت. شەكەت. ماندوو.

طَلحِيَّة: وَرَقَة/ كاغەز. پەڕە.

طَلَسَ. طَلَّسَ: مَحا/ سڕیەوە. كوژانیەوە.

طَلَس: مَحو/ سڕینەوە. كوژاندنەوە.

طِلس: مَمحوٌ. لايُقرا. غير مَقروء/ سڕاو. كوژاوە. ناخوێندرێتەوە.

طَلَعَ: ظَهَرَ. بَرز. بَزَغَ/ دەركەوت. هاتەدەرێ. هەڵهات.

طَلَعَ: إرتَفَعَ/ بەرزبووەوە.

طَلَعَ السِنُّ: نَبَتَ. شَقَّ اللِثَة/ دان دەرهات. هاتەدەرێ.

طَلَعَ الفَجرُ: بَزَغَ. تَبَلَّجَ/ ڕۆژ بووەوە. شەبەقی دا.

طَلَعَ النبات: نَبَتَ/ ڕووا. سەری دەرهێنا.

طَلَعَ على: أقبَلَ أو أتى بَغتَةً/ كوتوپڕ لە ناكاو دەركەوت. پەیابوو.

طَلَعَ على الأمر: إطَّلَعَ/ لە كارەكە ئاگاداربوو. تێیگەیشت.

طَلَعَ مِن: خَرَجَ/ دەرچوو. لێی دەرچوو. وازی هێنا.

طَلَعَ. طَلِعَ. صَعِدَ. عَلا. تَسَلَّقَ/ سەركەوت. چووە سەری. پیاهەڵزنا.

طَلَعَ الكوكب. أشرَقَ. ظَهَرَ/ هەڵهات.

طَلَعَ عَنهُم: غابَ وابتَعَدَ/ دووركەوتەوە. خۆی ون كرد.

طَلَّعَ: أخرَجَ/ دەریكرد. كردیە دەرەوە.

طَلَّعَ: أصعَدَ/ سەری خستن. خستیە سەرەوە.

طَلع: غُبار الطَلع. لُقاح. حُبوب اللقاح/ تۆوی نێرەكی لە ڕووەكدا. هەڵاڵە.

طَلع النَخل: زَهرَة. إزهرار/ گوڵ. گوڵ كردنی دارخورما. گڵكی خورما.

طَلعَة: مُحَيّا. سيماء/ دیمەن. سیما. ڕوخسار. نیگار.

طَلعَة: صَعدَة/ سەرەوژوورە.

طُلَعَة: مُحِبٌّ للاطلاع. فُضولي/ بازەڵە. سەنگەڵقو. درەنۆك.

طَلَقَ: أطلق يَدَهُ بخير: فَتَحها به/ دەستی بەخشندەیی و چاكەی كردەوە. دەستبڵاوی كرد.

طَلَقَ اللسانُ: كانَ فَصيحاً عَذبَ المَنطِق/ زمان پاراو و ڕەوان بوو. بە گفتوگۆ بوو.

طَلَقَ. طَلُقَ؛ إنحَلَّ من عِقال/ ئازاد بوو. سەرفراز بوو. بەرەڵا بوو.

طَلَقَت المرأةُ من زوجها؛ إنحلّت من زوجها/ ڕەهابوو. تەڵاقدرا.

طَلُقَ؛ كان بَشوشاً/ ڕووخۆش بوو.

طُلِقَت الحامل؛ أتاها الطَلَق/ سك پڕ ژان گرتی.

طَلَّقَ؛ اطلَقَ. تَرَكَ. فارَقَ/ وازی لێهێناز دەستبەرداری بوو. دەستی لێهەڵهەڵگرت.

طَلَّقَ الرَجُلُ زوجَتَهُ. طَلَّقَت المرأةُ زوجَها/ ڕەهای كرد. تەڵاقی دا. جیابووەوە.

طَلَّقَهُما القاضي؛ حَلَّ عَقد الزواج بینهما/ قازی تەڵاقەكەی خست و ڕەهای كرد.

طَلَق؛ حَشوَة السلاح الناري/ كەرەستەی داگرتنەوەی چەك.

طَلَق ناري. طَلقَة؛ رصاصَة/ گولله. فیشەك.

طَلَق؛ ألَمُ الولادَة/ ژان. ژان گرتن.

طَلِق اللسان. طَلْقُ اللسان/ فصیح. بلیغ. سَلِس/ زمان پاراو. ڕەوان دوو.

طَلِق الوَجه أو المُحَيا. طَلق الوَجه؛ مُبتَهِج. مَسرور/ ڕووخۆش. دەم بە پێكەنین.

طَلِق الیَدَین؛ طَلق الیَدَین؛ مفتوح الیدین/ دەستبڵاو. بەخشندە.

طَلِق. طَلَق. طُلُق. طُلق. غَیر مُقَیَّد/ سەرفراز. سەربەست. ئازاد.

طَلقَة؛ طَلق ناري. رَصاصَة/ فیشەك. گولله.

طَلَل (الجمع إطلال. طُلول)؛ خرِب. مُهَدَّم/ ڕووخاو. كەلاوە. وێرانە.

طُلمبَة؛ مَضخَة/ پەمپ.

طَلُوع؛ طالِع. صاعِد/ سەركەوتوو. سەرئەكەوێ. ئەچێتە سەرەوە.

طُلُوع؛ إرتِفاع/ بەرزبوونەوە.

طُلُوع؛ خُرُوج/ دەرچوون. چوونە دەرەوە.

طُلُوع؛ خُراج في البَدَن/ دوومەڵ.

طُلُوع الشَمس. شُروق/ خۆرهەڵاتن. هەڵاتن.

طُلُوع؛ ظُهُور/ دەركەوتن. هاتنەدەرەوە. سەردەرهێنان.

طُلُوع؛ ظُهُور/ دەركەوتن. هاتنەدەرەوە. سەردەرهێنان.

طُلُوقَة. طَلاقَة/ كراوە. ڕووخۆش.

طَلي. طِلاء/ ڕووپۆش. بۆیە.

طَلیعَة؛ صَدر. صَدارة. مُقَدِمَة/ پێشەنگ. پێشڕەو. سەركەلە.

طَلیعَة (الجمع طلائع)؛ رُوّاد/ ڕابەران. پێشڕەوانان.

طَلیعَة (الجمع طلائع)؛ أوائل/ یەكەمەكان. سەركەوتووان.

طَلیعي؛ رائِد/ پێشەنگ. ڕابەر.

طَلیق. طَلِق/ كراوە. ئازاد.

طَمَّ الحُفرَة؛ دَفَنَها وسَوّاها/ چاڵەكەی پڕكردەوە و تەختی كرد.

طَمَّ الماءُ؛ غَمَرَ/ ئاو دایپۆشی.

طَما. طَمَی؛ فاض. طَفَحَ/ ئاوهەڵسا.

طَمّاح؛ طَموح. طامِع. مُحِبّ للشُهرَة/ بەرزخواز. بەرزفڕ.

طماطِم؛ بَنَدورَة. طَماطَة/ تەماتە. باینجانی سوور.

طَمّاع؛ جَشِع/ چڵێس. چاوچنۆك. چاوبرسی.

طَمأنَ: حَمَلَهُ على الطُمأنينَة. هَدَأَ. سَكَّنَ/ دڵنیای کرد. هێوری کردەوە. هێمنی کردەوە.

طُمأنينَة.. إطمئنان.

طَمَثَت. طَمُثَت المرأة: حاضَت/ ئافرەت پۆنی بوو. کەوتە خوێنەوە. بێنوێژ بوو. پیسار بوو.

طَمث: حَيض. دَم الحَيض/ خوێنی مانگانەی ئافرەت. پۆنی. پیسار.

طَمَحَ الى: تَشَوَّقَ الى. تاقَ الى. إبتَغى/ ئامرزۆ بوو بۆی. ئارەزووی کرد. دڵی پێوە بوو. ئەیویست.

طَمَحَ بَصَرَهُ أو بِبَصَرِهِ الى: إرتَفَعَ ونظر شديداً/ بەرز ڕوانی. بۆ بەرز ئەیڕوانی. بەرز ئەیڕوانی. بەرز سەیری کرد.

طَمَحَ بِأَنفِه: شَمَخَ/ لووتی بەرزکردەوە.

طَمَرَك دَفَنَ. خَبَأَ/ ناشتی. دایپۆشی. خستیە چاڵەوە. شاردیەوە.

طَمَرَ: ملأ/ پڕی کردەوە.

طَمَرَ: ذهب في الارض/ چوو بە ناخی زەویدا.

طَمر: دَفن. قَبر. إخفاء/ ناشتن. داپۆشین. خستنەچاڵ. شاردنەوە.

طَمَسَ: مَحا. أبادَ/ سڕیەوە. فەوتانی. لەناوی برد.

طَمَسَ: مَنَع مِن الانتشار/ نەیهێشت بڵاوبێتەوە. ڕایگرت.

طَمَسَ: إنطَمَسَ: إمّحى/ سڕایەوە. کوژایەوە.

طَمَسَ. إنطَمَسَ: غَطَسَ/ چەقی. چوو بە قوڕا.

طَمس: مَحو. إبادَة/ سڕینەوەی کوژانەوە. لەناوبردن.

طَمس: مَنع من الانتشار/ ڕاگرتن. بڵاونەبوونەوە.

طَمس: غَطس/ چەقین. بەقووڕاچوون. ژێرئاوکەوتن.

طَمَعَ: جَشَع/ (چاوچنۆك. چڵێس. بە ئەماع. ئەماعکار) بوو.

طَمِعَ (في. بِ): إشتَهى. حَرَصَ على/ حەزی لێکرد. مرخی لێ خۆشکرد. ئەماعی تێکرد.

طَمَّعَهُ: حَمَلَهُ على الطَمَع/ ئەماعی ئایەبەر. دڵی بۆ ڕۆ کرد. وای لێ کرد چڵێس بی.

طَمَع: جَشَع/ چاوچنۆکی. چڵێسی. ئەماعکاری. مرخ خۆشکردن. چاوتێبڕین.

طَمَع: حُبّ المال/ پارەپیسی. کۆکردنەوە.

طَمَلَ الخُبزَ: وَسَعَهُ المِطمَلَة/ نانی کردەوە. پانی کردەوە. تیۆکی پیاهێنا.

طَمِلَ: لَطَخَ/ ڕەنگی کرد. خوێنی بەرکەوت.

طَمل: عَجين/ هەویر.

طمل: كساء أسود/ بەرگی ڕەش.

طمل: فَقير/ هەژار.

طمل: الثوب الخَلَق/ چلەشر.

طَموح: طَمّاح. طامِع. مُحِبّ للشُهرة/ بەرزخواز. بەرزفڕ.

طُموح: حُبّ الرِفعَة/ بەرزخوازی. بە ئاوات.

طَمي: غَرين/ خڵتە. لیتە و قوڕی ئاو ڕووبار. لیم.

طَميل: خُبز طَميل: مُوسَع بالمِطمَلَة/ نانی تیری.

طَميل: مُلَطَّخ/ پەڵاوی. خوێناوی.

طَميل: ماء راكد/ ئاوی بۆگەن. گەراوە.

طَنَّ: رَنّ. أزّ. دَنّ. صَوَّت/ زرنگەی هات. گیزەی هات. زرنگایەوە.

طَنّ الاذنُ: رَنّ/ گوێ زرنگایەوە.

طُنّ: وحدة وزن/ تەن. هەزار کیلۆگرام.

طَنّان: رَنّان. شَديد الطنين/ زرنگەدار. دەنگ دەرەوە. زایەڵەدار. ئەزرنگێتەوە.

طَنّان: مُنَمّق الأسلوب واللغة. مُتَأنّق في عبارته/ شێوازن. نەخشاو و ڕازاوە.

طَنّانة: حَشَرة/ ویزوویزە.

طُنُب: طُنب: حَبل الخَيمة/ پەتی دەوار. گوریسی چادر.

طُنُب: طُنب: عَصَب. وَتَر العَضَلة/ ژێی ماسولکە. چەقە دەماری ماسولکە.

طنبار: طُنبور: آلة موسيقية/ سەمتوور. تەمورە.

طَنجَرة: قِدر/ مەنجەڵ.

طَنطَنة: طَنين. رَنين/ زرنگەدار. دەنگ دەرەوە. زایەڵە. زرنگانەوە.

طَنَف. طُنَف. طُنُف. إفريز الحائط/ پاسار. گوێسوانە. سەلەند. سەلەندە.

طُنُق: قِمّة/ لووتکە.

طُنفُسة: سِجادة. بِساط/ بەڕە. ڕایەخ.

طَنَّ: طَنَّ. رَنَّ. أزَّ. دَنَّ. صَوَّت. زرنگەی هات. گیزەی هات. زرنگایەوە.

طنين: أزيز. دَندَنة/ گیزە. گیزەگیز. ویزەویز. وزەوز.

طَنين: رَنين/ زرنگەدار. دەنگ دەرەوە. زایەڵە.

طنين الأذن: رَنّ/ گوێ زرنگانەوە.

طَها: طَبَخَ/ لێینا. پێی گەیان.

طَهي: طَبيخ/ چێشت. شیو.

طِهاية: حِرفة الطبّاخ/ چێشتکەری. شیوپەزی.

طَهارة: نَظافة. نَقاء/ پاکی. خاوێنیەز پاک و تەمیزی.

طَهارة: عِفّة/ داوێن پاکی.

طَهارة الذَيل: براءة. إستقامة/ ساویلکەیی. دەستپاکی. ڕاستگۆیی.

طَهارة: طُهور. خِتان/ خەتەنە. خەتەنەکردن. سونەت کردن.

طَهَرَ. طَهُرَ: ضد نَجِس. كان طاهِراً/ (پاک. خاوێن. پاکژ. قالژ. تەمیز) بوو.

طَهَّرَ: جَعَلَهُ طاهِراً/ (پاک. خاوێن)ی کردەوە.

طَهَّرَ: خَتَنَ/ خەتەنەی کرد. سونەتی کرد.

طَهَّرَ الجداول: كَراها/ چوو ماڵی کرد.

طَهِر: طاهِر/ پاک. خاوێن. پوخت. پاکژ. پاقژ. تەمیز.

طُهر. طَهارة/ پاک و خاوێنی، دەستنوێژگرتن.

طَهو: طَبخ/ لێنان. پێگەیاندن. چێشتلێنان.

طَهور. طاهر. طَهارة. مُطَهَّر/ پاک‌وخاوێن. پاککراو.

طَو. الطَوي: طاوٍ. جائع/ برسی.

طَوَى: ثَنى/ پەدی کرد. نوشتانیەوە.

طَوَى: طَوى السِرّ. طَوَى كَشحَهُ: كَتَمَ. أخفى/ قسەو نهێنی شاردەوە. نەیدرکان.

طَوَى البلادَ: قَطَعَها/ گەراز بە وڵاتا گەرا. گەشتی کرد.

طَوَى صَفحَةَ الماضي: قَلَبَها/ لاپەڕەی کۆنی هەڵدایەوە. لەبیر خۆی بردەوە.

طَوَى. قَضى. أمضى/ تێپەڕی. ڕۆی. نەما.

طَوَى البِئرَ: بَناها بالحِجارة/ بیرەکەی هەڵچنی بە بەرد.

طَوَى صَفحَةَ الماضي: قَلَبَها/ لاپەڕەی کۆنی هەڵدایەوە. لەبیر خۆی بردەوە.

طَوَى: جوع/ برسێتی.

طوارِىء.. طارِئة/ ناكاو.

مستشفى الطوارِىء/ خەستەخانەی ناكاوی.

طَوَاعِيَة.. طاعَة/ بەخواستی خۆی. گوێڕایەڵ.

طواعيَة. مِطواعيَة. لَدانَة. مُرونَة/ نەرمێتی. نەرم و شلێتی. نەرم و نیانی.

طَواف: دَوَران. تَجوال/ گەڕان. سووڕانەوە.

طوّاف: مُتَجوِل. جوّال/ گەڕۆك. گەڕیدە. دەسووڕێتەوە.

طَوَافَة: عَوّامَة/ كۆڕیتەر.

طوّافَة: مايطوف فوق سطح الماء/ ئەوەی سەرئاو ئەكەوێ.

طَوال: طيلَة. على طول/ به درێژایی. بەه بینه.

طُوّال: طويل جداً/ زۆر درێژ.

طَواية: طوايَة. مِقلاة/ تاوە.

طَوّبَ: سَجَّلَ عَقاراً/ تاپۆی كرد.

طُوب: لِبن. آجُر/ خشت.

طُوب أحمر: الآجر المَشوي/ خشتی سوور.

طُوب لِبن/ خشتی كاڵ.

طوبَى: غِبطَة. سَعادَة/ خۆشی. شادی. بەختیاری. كامەرانی.

طُوبَى لك: لَكَ الحَظّ والعَيش الطَيّب/ دەوای خۆشی و بەختیاری و خۆشگوزەرانیت بۆ ئەكەم.

طوباوي: مَغبوط. مُتَفائِل. سَعيد/ پەوەن بێن. گەشبین. بەختیار.

طوباوي: خِيالي. تَصَوُّري. مِثالي/ خاوەنی خەیاڵ پڵاو.

طَوَّحَ بـ: ألقى. رَمَى. قَذَفَ/ فڕێی دا. هەڵیدا.

طَوَّحَ بـ: عَرَّضَ للخطر. حَمَلَهُ على ركوب المهالك/ كێچەڵی بۆ نایەوە. تووشی بەڵای كرد. خستیە مەترسیەوە.

طَوَّحَ: طَيَّحَ الشيء: ضَيَّعَهُ/ ونی كرد.

طَود: جَبَل/ شاخ. چیا. كێو.

إبن الطَود: صَدَى/ زایەڵە. دەنگدانەوە.

طَوَّرَ: رَقّى. قَدَّمَ/ پێشكەوت. گەشەی كرد.

طَور: دَور. مَرحَلَة. دَرَجَة/ قۆناخ. پله.

طَور: حال/ بارودۆخ. چۆنیەتی. دۆخ.

طَور: حَدّ وقَدر/ سنوور. بایەخ.

طَور: مَرَّة/ جار. كەرەت.

جاوَزَ طَورَهُ: جاوز قَدرَه/ له ڕادەی خۆی دەرچوو. پێی لێ هەڵگێشا.

الناس أطوار: أصناف وعلى حالات شَتّى/ خەڵكەكە زۆر جۆرن هەیه گكە شێوەیەكە.

طَوراً بعد طَور: تِكراراً. مِراراً/ جار له دوای جار.

طُور: جَبَل. طَود/ شاخ. چیا. كێو.

طوراني: طُوري. جَبَلي. مُتَوَحِش/ كێوی. شاخاوی.

طوّس: زَيَّنَ/ ڕازاندیەوە. ئارایشتی كرد.

طَوس: قَمَر/ مانگ. مەیلی.

طَوَّشَ: خَصَى/ خەسانی. یەختەی كرد. گونی دەرهێنا.

طَوَّعَ: أخضَعَ. جَعَلَهُ يَطيع/ ڕایهێنا، ڕامی كرد. هێنایه ژێربار. ملی پێ شۆڕكرد.

طَوَّعَت له نَفسهُ: سَهَّلَت ورَخَّصَت له فِعلَهُ/ به ئاسان و باشی زانی و كردی. خۆی به خۆی كرد.

طَوع: طائِع: مُطيع. مُذعِن. مُمتَثِل/ گوێڕایەڵ. گوێبیست. گوێدێر. گەردن كەچ. دەستەمۆ.

طَوعَ یَدِكَ: مُنقادٌ لَكَ/ لەژێر فەرمانی خۆتایە. جڵەوەکەی بەدەست خۆتەوەیە.

طَوعَ العِنان: سَهل/ دەستەمۆ. بە ئاسان ئەبرێ بەڕێوە.

طَوعَ الأمر أو اليَد: رَهن الإشارَة/ چاوەڕێی فەرمان و ئیشارەتێکە.

عَمَلَهُ طَوعاً غَیرَ مُکرَه علیه/ زۆری لێ نەکرا. بە ئارەزووی خۆی کردی.

طَوعاً: إختیاراً/ بە ئارەزوو. خوایشت.

طَوعاً أو کُرهاً: بِرَغبَة أو جَبراً/ بە زۆر یا بە خوایشت.

طَوعي: إختیاري/ خۆکرد. بە ئارەزوو. خوایشت. خۆمێشت.

طَوَّفَ (حَول. بـ. علی. في): طافَ. دارَ. جالَ/بە دەوریا بە ناویا سووڕایەوە. گەڕا. پیاگەڕا.

طَوف: طَواف. دوران تَجَوُّل/ گەڕان. سووڕانەوە.

طَوف: رَمَث. عَوّامَة/ کەڵەک. کەڵەکی سەرئاو.

طَوف: دورِیَّة. عَسَس/ حەسحەس. پاسەوان. شەوگەڕ.

طَوف: جِدار أو حائِط من الطين/ دیواری قوڕین. موور.

طَوَفان: طَواف. دوران. تَجَوُّل/ گەڕان. سووڕانەوە.

طُوفان: سَیل جارِف. فَیَضان/ لافاو. بۆران. لێشاو.

طُوفان: شِدّة ظَلام اللیل/ شەوەزەنگ. تاریکە شەو.

طُوفان من کل شيء: ماکان کثیراً/ زۆر. زۆر و زەبەندە. لێشاو.

طَوَّقَ: أحاطَ بـ. أحدَقَ بـ/ (گەمارۆ. ئابڵووقە. بازنە. دەورە)یدا. تێی مرووکا.

طَوَّقَ: کَبَحَ. ضَبَطَ. سَیطَرَ/ دەستی بەسەراگرتن کۆنترۆڵی کرد.

طَوَّقَهُ بِذِراعِه: أحاطَهُ/ دەستی کردە ملی. باوەشی پیاکرد.

طَوق العُنُق: کل مایُحیط بالعُنُق/ یەخە. ملوانکە. ملیوانە. گەردانە. گەردنبەند. ملپێچ.

طَوق: طارَة. کل ما إستدار بِشَيء/ بازنە. توق. ئەڵقە. چێوە کەمە.

طَوق: رِباط. حِزام. نِطاق/ پشتێن. بەستەر. بەستێن.

طَوق: إطاقَة. تَحَمُّل/ بەرگەگرتن. لە وزەدابوون. دەربردن. هەڵکردن.

ضَرَبَ أو فَرَضَ طَوقاً حول أو علی: طَوَّقَ/ (گەمارۆ. ئابڵوقە. بازنە. دەورە)ی دا.

طَوَّلَ.. أطالَ/ درێژی کردەوە

طَوَّلَ لە: أمهَلَهُ/ ماوەی پێدا. لەسەری وەستا. مۆڵەتی پێدا.

طَوَّلَ بالَهُ علیه: صَبَرَ. إهتَمَّ بە/ بە تەنگیەوە هات. ئاگای لێبوو.

طَول: قُوَّة قُدرَة/ هێز. توانا. لێهاتوویی.

طَول: غِنى/ دارایی.

طَول: فَضل. عَطاء/ چاکە. پیاوەتی. بەخشندەیی.

طُول: ضد قِصَر. ضد عُرض/ درێژی. درێژایی.

طُول: إرتفاع/ باڵا. بەرزی.

طُولاً: بالطول/ بە درێژی.

طُول البال. طول الأناة. صَبر. جَلَد. تَأنٍ/ ئارام. لەسەرخۆیی. شێنەیی.

طُول البَصر. طول النظر. النظر الى البَعيد/ دووربینی. بیرکردنەوە لە دواڕۆژ.

طول العمر: مَدى العُمر/ درێژاییی تەمەن.

في طول البلاد وعرضها/ بە درێژاییی وڵاتدا. لەمسەر تا ئەوسەری وڵات.

على طُول: حالاً/ دەستەجێ. یەکسەر. یەکسەردەو. ڕاستەوخۆ. کوتوپڕ.

على طُول: بلا إنقطاع/ یەکبینەوز بەبێ وەستان.

طومار: طامور. دَرج. صَحیفة/ تۆمار. بابۆڵە پەراو. نوسراوی لوولەکراو.

طَويَ: طَوى. جاعَ/ برسی بوو. خۆی برسی پیشاندا.

طَويَ: مَرِنَ. لَدُنَ/ نەرم بوو. ئەنوشتایەوە.

طَويّة: داخلة. باطن/ ڕاز. نهێنی. شاراوە.

طَويّة: ضَمیر/ دەروون. ویژدان.

طَويّة: نيّة/ مەبەست. ئامانج. ئارەزوو.

طَويل: ضد قصیر. ضد عَریض/ درێژ. لاکێشی.

طويل: مُرتَفِع/ بەرز. بالآبەرز.

طَويل: مُطوَّل/ درێژ. زۆر درێژ.

طويلاً: لمدة طويلة/ بۆ ماوەیەکی درێژ.

طَويل الأجل أو الأمد. مُدّة طويلة/ ماوەی درێژ. درێژخایەن.

طويل الأناة أو الباب أو الروح: صَبور/ بە تاقەت. بە ئارام. شێنەیی. لەسەرخۆ.

طويل الباع: قَدیر. مُقتَدِر/ بەتوانا. بەمێز. لێهاتوو. کارامە.

طويل النظر أو البَصَر: بصیر بالعَواقب/ دووربین.

طويل العُمر: کبیر السِنّ/ بەساڵاچوو. بەتەمەن. تەمەن درێژ.

طويل القامَة: مَدیدها/ بالآبەرز. درێژ.

طويل اللسان: سَفیه/ لەوچە. زمان درێژ. زۆربڵێ. کەرتێ. جنێوفرۆش.

طويل الیَد: سارق/ دز. دەست درێژ.

طَيّ: ثَني/ قەدکردن. نوشتانەوە. پێچانەوە. دەقکردن.

طَيّ البئر: بناءُها/ بیرهەڵچنین.

طَيَّهُ. طَيّ هذا. في طَيِّه: ضمنَهُ/ لەناویا.

(تحت. في) طيّ الكتمان: سِراً/ بە نهێنیی بەشاراوەیی.

طَیّار: مَلاّح جَوي/ فڕۆکەوان.

طَيّار: كُلّ ذي جناح من الحيوان/ باڵدار. باڵندە. باڵگر. فڕەر.

طَيّار: سريع الزوال/ زووتامێنێ.

طَيّارة.. طائرة/ فڕۆکە.

طَيّاش.. طائش/ هەڵپەکەر.

طَيّان: الذي يحمل الطين الى البناء/ قوڕکێش.

طَيّان: الذي يعالج الطين/ قوڕشێل.

طَيَّبَ: شَفى/ چاکی کردەوە.

طَيَّبَ: عَطَّر/ بۆنی پێوەکرد. بۆنداری کرد. بۆنی خۆشکرد.

طَيَّبَ خاطِرَهُ: سَكَّنَهُ. هَدّأه/ دڵنەوایی کرد. بەسەریا هات. دڵخۆش دایەوە. دڵی هێنایەوەجێ. سەرخۆشی لێکرد.

طَيَّبَ خاطِرَهُ: شَجَّعه/ هانی دا. غیرەتی نایەبەر. تیژی کرد.

طَيَّبَ الطعام: تَبّل. أضاف التوابل. وَضَعَ المُطَيِّبات/ خواردنەکەی تامدار کرد. بەهارات و تام و بۆنی تێکرد.

طَيِّب؛ جَيِّد. حَسَن/ باش. چاک.

طَيِّب؛ لذيذ/ خۆش. بەلەزەتز بە تام و بۆ.

طَيِّب؛ مُعافى/ لەش ساخ. چاکەوەبوو.

طَيِّب الرائحة/ بۆن خۆش.

طَيِّب الخُلُق؛ رقيق/ ڕەوشت باش. ناسک.

طَيِّب السريرة؛ ساذج. سليم القلب/ ساویلکە. دڵپاک. ساکار.

طَيِّب القَلب؛ سَمِح/ دڵپاک. بەخشندە. لێبورد.

طَيِّب النَفس؛ بَشوش/ ڕووخۆش.

طِيب؛ عِطر/ بۆن. بۆنی خۆش. بۆن و بەرامە.

طِيبَة؛ إحسان. جود/ چاکە. باشی. پیاوەتی. یارمەتیدان.

طيبة القَلب؛ رِقّة. شَفَقَة/ دڵپاکی. دڵفراوانی. بەزەیی.

طَيَّة؛ ثَنيَة/ قەد. نوشتانەوە.

حَمَل بَين طَيّاتِه؛ في داخله. تَضمَّنَ/ لەناوەکەیا هەیە. شتی تیایە.

طَيّة.. طَوية/ پێچانەوە. لولکردن.

طَيَّرَه. طَيَّرَ بِه؛ جَعَلَهُ يطير/ هەڵیفڕان. هەڵی دا. باڵی پێگرت.

طَيَّر؛ ضَخَّد. بَخَّر/ هەڵماندی. کردی بە هەڵم. بەرزی کردەوە.

طَيَّرَ نومَهُ؛ نَفَّرَه/ خەوی زڕان.

طَير؛ طائر. كل ذي جَناح من الحيوان/ باڵندە. هەل. باڵدار. پەلەوەر.

كَأَنَّ على رؤوسِهم طَير؛ ساكنون. لايتحركون/ جووڵەی بۆ ناکەن. تەقەیان لێوە نایەت.

طَيَران؛ السَير في الهواء/ باڵگرتن. فڕین.

طَيَرَة. طَيرورَة؛ طَيش. تَهَوُّر. رُعونَة/ هەڵەشەیی. زووهەڵچوون. سەرکێشی.

طِيَرَة. طِيَرَة؛ علامَة الشؤم. مايُتشائم به/ نیشانەی شوومی و چاوچڵەیی. ئەوەی ڕەشبینی لێ ئەکرێ.

طَيش؛ تَهَوُّر. رُعونَة/ هەڵەشەیی. زوو هەڵچوون. سەرکێشی. بایی بوون.

طَيش؛ خِفّة العَقل/ کەرێتی. بێئەقڵی.

طَيِّع.. مُطيع. مِطواع/ گوێڕایەڵ. مل کەچ.

طَيف؛ خَيال/ تارمایی. شەبەنگ. قەرەنتو. سوێس.

طَيف. طَيف (الضوء. النور)/ شەبەنگ. شەبەنگی ڕووناکی.

طيف الشّمس/ شەبەنگی خۆر. خۆرەشەبەنگ. پەلکەزێڕینە.

الطيف الشمس؛ انوار مُلَوَّنه حسب تَرتيبها (اصفر. احمر. برتقالي. اخضر. ازرق. نيلي. بنفسجي)/ زەرد. سوور. پرتەقاڵی. سەوز. شین. شینی کاڵ. (وەنەوشەیی مۆر).

طِيلَة؛ طَوال. على طول/ بە درێژایی.

طَيَّنَ؛ لَطَّخَ بالطين/ قوڕاوی کرد. قوڕی تێهەڵسوو.

طَيَّنَ الحائطَ؛ طلاه بالطين/ بە قوڕ سواخی دا.

طِين؛ تُراب ممزوج بالماء/ قوڕ. لیتە. هەڕی. تلۆل. زلقاو. هەڕ. هەڕگ.

طِين خزفي؛ فخار/ گلێنە. قوڕی گلێنە.

زالد (في) الطين بَلّةً. زاد خُطورَةً و حَراجَةً/ زیاتر وروژا. ئاڵۆزتر بوو. مەترسی تێکەوت.

طِينَة؛ قِطعَة من الطين/ قوڕ. پارچەیەک قوڕ. تۆپەڵە قوڕ.

طِينَة؛ خِلقَة. جِبِلَّة/ ڕوخسار. ڕەفتار. چۆنیەتی. ڕەوشت و خوی سروشتی و زکماکی.

# ظ

ظَأبَ: تَزَوَّجَ/ ژنی هێنا.

ظَأب: سِلف الرجل/ ئاوەڵزاوا. هاوەڵزاوا.

ظَاْبَ: تَزَوَّجَ أخت امرأته/ خوشکی ژنەکەی هێنا.

تَظاءَبا: تزوجا بالمقابَة. صارَكل مِنهُما سِلف الآخر/ بوون بە هاوەڵزاوای یەکتری.

ظَأرَت. ظاءَرَت المرأةُ: إتَّخَذَت ولداً تُرضِعهُ/ بوو بە دایەنی.

ظِئر. ظُؤرَة: مُرضِعَة لِوَلَدِ غَيرِها/ دایەن. شیر ئەدا بە منداڵی یەکێکی تر.

ظِئرَة: دَعامَة الى جنب حائطا يُدعَم إليها/ کۆڵەکەی پاڵ دیوار. فیلپایە.

ظافِر: مُظَفَّر. مُنتَصِر/ سەرکەوتوو. براوە.

ظالِع: أعرَج/ شەل. لەنگ. کێر.

ظالِم: جائر. غير عادل. مُستَبِد. طاغيَة/ زۆردار. ستەمکار. ستەمگەر.

ظامِيء: ظَمِيء. ظَمآن: عَطشان/ تینوو.

ظانّ: مُتَّهِم. مَن يَتَّهِم/ بە گومان. گومان و تاوان ئەخاتەسەر.

ظانّ: ظَنّان. ظَنُون. شاك/ دڵ کرمن. کەم باوەڕ. دڵپیس. بەگومان.

ظاهَرَ: عاوَنَ. ساعَدَ. ناصَرَ/ یارمەتی دا. پشتگیری کرد.

ظاهِر: بادٍ. بَيِّن. جَلي. واضِح/ دیار. ئاشکرا. لەڕوو.

ظاهِر: سَطح. ضد داخِل أو باطن/ ڕوو. ڕووی دەرەوە. دیوی دەرەوە. دیوی سەرەوە.

ظاهِر: مَظهَر. هيئَة. مَنظَر/ سیما. ڕوخسار. دیمەن. ڕواڵەت.

ظاهِراً. حَسَب الظاهِر. في الظاهِر. على مايَظهَر/ ئەوەی کە دیارە. وا دیارە. لەوەئەچێ. دوورنیە. ڕەنگە.

ظاهِرَة: مَشهَد. مَظهَر. صورَة/ دیاردە. وێنە. ڕووداو.

ظاهِري: خارجي/ ئەوەی کە دیارە. ئەوەی لەبەرچاوە. ڕووکەش. سەرزاری.

ظَبي: غَزال/ ئاسکەکێوی.

ظَبيَة: انثى الغزال/ ئاسکەکێوی. مێیەی هەندێ لە ئاژەڵانی کێو.

ظِرّ. ظِرّان: حَجَر الصوان. حَجَر لە حَدّ کالسکین/ بەردی سەخت. کەناریژ.

ظَرافَة: ظَرف. فُكاهَة. كياسَة/ شۆخیز. کەشخەیەتی. جوان پۆشی.

ظَرُفَ: كان ذكياً بارِعاً/ زیرەک بوو. وریا بوو.

ظَرُفَ: كان كَيِّساً حَسَن الهيئَة/ (کەشخە. جوان پۆش. شۆخ. ڕێکوپێک. قۆز) بوو.

ظَرف: غِلاف. مَظروف/ بەرگ. بەرگی نامە. زەرف.

ظَرف: وِعاء/ دەفر. توورەکە. گونیە. قاپ. هۆر.

ظَرف: ظرافَة. فُکاهَة. کیاسَة/ جوان پۆشی. شۆخی. کەشخەیەتی.

ظَرف: حال. وَضع. وَقت. حین/ کات. بار. دۆخ. هەلومەرج.

ظَرف: في النَحو/ ئاوەڵفرمان. ئاوەڵناو.

في ظَرف کَذا: خِلال/ لە ماوەی.

نَقيّ الظَرف: أمين/ دەستپاک. جێ باوەڕ.

ظُروف: أحوال/ بار. دۆخ. چاخ. سەردەم. ڕۆژگار. هەلومەرج.

ظُروف مُخَفَّفَة/ باروودۆخی سووک و ئاسان.

ظُروف مُشَدَّدَة/ باروودۆخی سەخت و گران. نالەبار. توندوتیژ.

ظُروف إستِثنائيّة/ باروودۆخێکی تایبەتی.

ظَريف: ذو ظَرف. كَيّس. فَكِه/ کەشخە. ڕێکوپێک. شۆخ. ڕووخۆش. دەم بە پێکەنین.

ظَعَن: سارَ وارتَحَل/ ڕۆی. کۆچی کرد.

ظَعينَة: هَودَج. مِحَفَّة/ کەژاوە.

ظَعينَة: زَوجَة مادامَت في الهَودَج/ ئافرەتی ناو کەژاوە.

ظَفَرَ بـ: فازَ بـ. نال/ دەستی کەوت. بردیەوە.

ظَفِرَ (على. بـ): غَلَبَ. قَهَرَ/ زاڵ بوو بە سەریا. سەرکەوت.

ظَفَّرَهُ على: أظفَرَهُ. جَعَلَهُ يَظفُر. مَكَّنَهُ من قَهرِه/ وای لێکرد زاڵ بێ. بێبەزێنێ. سەرکەوێ.

ظَفَر: نَصر. غَلَبَة/ سەرکەوتن. بردنەوە.

ظَفِر: ظافِر. مُظَفَّر. مُنتَصِر/ سەرکەوتوو. براوە. زاڵ.

ظُفر. ظُفُر. ظِفر. المادّة النامِيَة في أطراف الأصابِع/ نینۆک. ناخون.

ظَلَّ يَفعَل كَذا: إستَمَرّ. واصَلَ/ بەردەوام بوو لەسەر کردنی. لەسەری ڕۆی. بینی گرت. کۆڵی نەدا.

ظَلَّ: دامَ. بَقيَ/ بەردەوام بوو. مایەوە.

ظِلّ: خَيال/ تارمایی. قەرەنتو.

ظِلّ: فَيء/ سێبەر.

ظِلّ: كَنَف/ سایە.

ظِلّ: رياضيات/ سایە.

ظِلّ تمام: رياضيات/ سایەتەواو.

في ظِلّ. تَحتَ ظِلّ: في حِمايَة/ لە سایەی. لەژێر سێبەری.

ظَلال: إبتِداعي. هَرطَقَة/ ڕێ لێ ون بوو. ڕێ ونکردن.

ظَلام: ظُلمَة. ضِد نور. ذهاب النور/ تار. تاریک. تاریکایی. تاریکی. زەنگ.

ظَلام دامِس/ تاریک و نوتەک. شەوەزەنگ.

ظَلّام: ظالِم. جائر. مُستَبِد. طاغِيَة/ زۆردار. ستەمکار. ستەمگەر.

ظَلامَة: مَظلَمَة. ظُلمٌ واقِع/ زۆرداری. ستەمکاری.

ظُلّة: ما يُظِلّ النافِذة. خَيمَة/ سێبەر. سەرپەنجەرە. کەپر. چارداخ. سابات.

ظُلّة: كُشك/ دوکانۆچکە.

ظَلَعَ: عَرَجَ/ شەل. لەنگی. شەل بوو. کێڕ بوو.

ظَلع. ظَلَع: عَرَج/ شەل. لەنگی. کێڕی.

ظِلف: ظُفر لحيوان المُجتَر/ سم.

ثَعفُن الظِلف: مرض/ ئازرنگ. شەلکە. تەومق.

ظَلَّلَ.. أظَلَّ/ ڕێگای ونکرد.

ظَلَّل الرَسم: رَسم خطوطاً وظلالاً/ سێبەر و تارمایی خستە سەر وێنە.

ظَلَمَ: جارَ علی/ زۆری لێکرد. ستەمکار بوو لەگەڵی. جەور و ستەمی لێکرد.

ظَلِمَ: أظلَمَ. صارَ مُظلِماً/ تاریکی کرد. تاریک داهات. بوو بە تاریک.

ظُلم: جَور. ضَیم. إستبداد/ زۆرداری. جەور و ستەم.

ظُلم: إنتقاص الحَقّ/ ماف خواردن. خراپەکردن. چەوساندنەوە.

ظُلماً. ظُلماً وعُدواناً: جَوراً/ زۆرداری. بە زۆرداریێتی. ناڕەوا. بە خوتوخۆڕایی.

ظَلم: مُظلم. ظَلماء. داجِن/ نوتەک. سیا. تاریک.

ظَلماء/ ظُلمَة. ظَلام. ذهاب النور/ تاریک داهاتن. تاریکایی. تاریک کردن.

ظَلوم: ظالم/ جائر. مُستَبِد/ زۆردار. ستەمکار. ستەمگەر.

ظَلیل: مُظِلّ. ذو ظِلّ. مُفیئاً/ سێبەر. نەسرم. تاریک.

ظَلیم: مَظلوم/ زۆرلێکراو. چەوساوە. ماف خوراو.

ظَلیم: ذَکر النَعام/ نێرەی (نەعامە. وشترمەل. وشتر مورخ).

ظَمِئَ: عَطِشَ/ تینووی بوو.

ظَمِئَ إلیه: إشتاقَ/ ئارەزووی کرد. تامەزرۆی بوو.

ظَمأ: عطَشَ/ تینووی کرد.

ظَمَأ. ظَمء. ظَماء. عَطَش/ تینوێتی.

ظَمِیء. ظَمآن. عَطشان. ظامیء/ تینوو.

ظَمِیء. ظَمآن: مُشتاق/ ئارەزوومەند. تامەزرۆ.

ظَمیاء: سَمراء/ سەوزە. گەنم ڕەنگ. بۆر. ئەسمەر.

ساقٌ ظَمیاء/ قَلیلَة اللحم/ قاچ باریک. قاچی باریک.

عَینٌ ظَمیاء: رقیقة الجفن/ پێڵووی تەنک.

ظَنّ الشیءَ: عَلِمَهُ واستیقَنَه/ شتەکەی زانی. لێی دڵنیابوو.

ظَنّ: إعتَقَدَ. حَسِبَ. خالَ/ گومانی کرد. بە گومان بوو. وایزانی. وای دانا.

ظَنّ: حُسبان. إفتراض. تَخمین/ بۆچوون. مەزندە.

ظَنّ: شَكّ/ گومان.

في (أغلب. أكثر) الظَنّ: مِن المُحتَمَل/ ڕەنگە. لەگونجێ. لەشێ. لەوانەوە.

ظَنان: ظَنون: سیء الظَن. شاكّ/ بەگومان. دڵ کرمێ. کەمباوەڕ. دڵپیس.

ظَنانَة. ظِنَّة. تُهمَة/ تاوان.

ظُنبوب: قَصَبَة الساق الأكبر/ ئێسقانی لووالاق. قالۆر.

ظَنّي: إفتراضي/ لەبەر بووڕە. بە مەزندە.

ظَنّي: إتّهامي/ تاوانبار کردن. تاوان دانە پاڵ. بوختان بۆ کردن.

ظَنین: مُتّهَم. مشبوه/ گومانلێکراو. تاوانبارکراو. تاوان لەسەر.

ظُهار: ألم الظَهر/ پشت ئێشە. کۆڵنج. برک.

ظَهارَةُ الثّوب. ضد بِطانَة/ بەر. ڕووی دەرەوەی جلوبەرگ و قوماش.

ظَهارَة: ثَلیس. طِلاء. مایَکس بە ظَهر شیء لِدَعمه/ ڕووکەش. بەرگ. پیاگرتن.

ظَهَرَ: بانَ. بَرَزَ. بَدا. إتَّضَحَ/ دەرکەوت. دیاردی دا. ئاشکرابوو. پێزانرا.

ظَهَرَ: حَدَثَ/ ڕوویدا.

ظَهَرَ: ظاهَرَ. عاوَنَ. ساعَدَ. ساندَ/ یارمەتی دا. پشتگیری کرد.

ظَهَرَ عَلى: تَسَلَّقَ/ سەرکەوت. چووە سەرەوە. پیاهەڵزنا. پیا سەرکەوت.

ظَهَرَ (علی. ب.): غَلَبَ/ بەسەریا سەرکەوت. زاڵ بوو. لێی بردەوە.

ظَهَرَ علی: إطَّلَعَ علی. عَلِمَ/ پێی زانی. لێی ئاشکرابوو.

ظَهَرَ: حَضَرَ أو جاء/ هات. گەیشت. پەیدا بوو. دەرکەوت.

یَظهَرُ أنَّ: علی مایَظهَرُ/ وا دیارە. لەوە ئەچێ.

ظَهَّرَ: جَیَّرَ: جَیَّرَ الصَّكَّ/ پشت نووسی کرد. پشتی چەکی جیرۆ کرد. ئیمزای کرد.

ظَهَّرَ الشیء: جَعَلَهُ وراء ظَهرِهِ/ خستیە پشتیەوە.

ظَهر: مایُقابِل البَطن/ پشت.

ظَهر الشیء: سَطحَهُ/ ڕوو. ڕووی سەرەوە. دیوی دەرەوە.

ظهر الشیء: قَفاهُ/ پشتەوە. دیوی دواوە. بەر.

ظَهراً لبطن. ظهراً عل بطن. بطناً لظهره: رأساً علی عَقب. فوقانی تحتانی. مَقلوب/ هەڵگەڕاو. سەرەوخوار. ئاوەژوو.

بین ظَهرانیهم. بَین أظهرهم. فِي وَسَطهم/ لەناویانا لەگەڵیانا.

علی ظَهر القلب أو اللسان: حافِظَةً. ذاكرةً. غیباً/ لەبەر. لە دڵا.

ظُهر: ظَهیرة. نصف أو مُنتَصَف النهار/ نیوەڕۆ.

ظُهري: مُتَعلِّق بالظَّهر/ پەیوەندیدار بە پشتەوە.

ظُهور: حدوث/ ڕوودان.

ظُهور: بُروز: ضد إختفاء أو غیاب/ دەرکەوتن. ئاشکرابوون. هاتنەدەرەوە. سەرهەڵدان.

حُبّ الظُّهور: تَعَرّي/ خۆدەرخستن. خۆهەڵکێشان.

ظَهیر: مُعین. نَصیر. مُساعِد/یارمەتیدەر. ئاوەڵ. پشتگیر.

الظَّهیر: القَوِيّ الظَّهر/ پشت ئەستوور. پشت قایم. ئەرخەدار.

الظَّهیر: مضن یُشتكي ظَهرَهُ/ هاواری پشتی ئەکا. کۆڵنج و برکی کردووە.

ظَهیرة: ظُهر. نصف أو مُنتَصَف النهار/ نیوەڕۆ.

ظَلَّ. ظَلْیان: عَسَل/ هەنگوین.

عِزّ: شِدّة/ هێز. گەرمەی. هەرەتی. ئەوپەڕی تین و هێز و توانا.

عِزّ الشتاء/ چلەی زستان. سەرما و سۆڵە.

عِزّ الصيف/ چلەی هاوینت. قرچەی گەرما و هاوین.

في عِزّ غناه/ لەوپەڕی بوون و ساماندا ڕێتیا.

في عِزّ شبابه/ لە هەرەتی لاویا.

في عِزّ المعركة/ لە گەرمەی جەنگدا.

عِزّ: المطر الشديد/ بارانی قایم. شەست. ڕەهێڵە.

عَزا إلى. عَزَى الى: نَسَبَ الى/ بەمەی ئەو دانراو. بەستراییەوە بەوە لەسەر ئەو حسابی بۆ کرا. درایە پاڵ.

عَزا: عَزِيَ. صَبَرَ. إعتَصَمَ بالصَبر/ ئارامی گرت. بە ئارام بوو. هێمن بوو. دڵنەوا بوو.

عَزّى: سَلّى. قَدّمَ تعازِيَهُ إلى/ سەرخۆشی لێ کرد. چوو بە پرسەوە. دڵگرانی پیشاندا.

عَزاء: تعزِيَة: مُؤاساة. سُلوان/ پرسە. دڵخۆشی دانەوە. دڵدانەوە. دڵنەوایی کردن.

عَزّام: عازم على. مُصَمِّم. ناوِ/ خاوەن بڕیار. هەتەر. سوور لەسەر مەبەست.

عَزّم: ساحِر. مُشَعوِذ/ جادوباز. نوشتەکار.

عَزّام: أسَد/ شێر.

عَزَبَ: كان أعزَب. لم يَتَزَوّج/ ڕەبەن بوو. ژنی نەهێنابوو. بوخچەی نەکراوە بوو.

عَزَبَ: بَعُدَ/ دوورکەوتەوە. ون بوو. خۆی شاردەوە.

عَزَبَ عن البال أو الذِهن: نَسِيَ/ لەبیر چووەوە.

عَزَب. عَزباء. عازِب. أعزَب/ ڕەبەن. ژنی نەهێناوە. سەڵت. بوخچەی نەکراوە. خانەبەکۆڵ. سپات. قازاخ.

عُزبَة: عُزوبَة. عُزوبِيَّة: فترة العُزوبِيَّة/ بێ ژنی. ڕەبەنی.

عِزبَة: مَزرَعَة/ کێڵگە. گوند.

عِزّة: الحَمِيّة والأنَفَة/ ڕێز. سەربەرزی. شکۆ.

عِزّة النفس: إحترام الذات/ ڕێزی خۆگرتن. ڕێزخۆ.

عَزّرَ. عَزَرَ: وَبّخَ. لامَ/ سەرزەنشتی کرد. تانوتی لێدا. گازندەی کرد.

عَزر: تعزير. لَوم/ سەرزەنشت. تانوت. گازندە.

عَزرائيل: مَلاك الموت/ ئیزرائیل. گیانکێش.

عَزّزَ: قَوّى. ثَبّتَ. دَعَمَ. نَصَرَ/ (بەهێز. قایم. پشتگیری) کرد. یارمەتی دا. پشتی گرت.

عَزَفَ: لَعِبَ على آلة موسيقيّة/ مۆسیقای ژەند. (لێدا. ژەن).

عَزَفَ عن. عَزَفَت نَفسُهُ عن الشيء: زَهِدَت فيه ومَلّتهُ/ لێی بێزار بوو. لەبەرچاوی کەوت. وازی لێهێنا.

عَزَفَ: صَوّتَ/ دەنگی لێوە هات. گڤەی هات.

عَزف: اللعب على آلة موسيقية/ موسیقا (لێدان. ژەندن).

عَزف الرياح: أصواتها/ گڤەی با. لوورە. وژە.

عَزَقَ الأرض: شَقّها/ زەوی هەڵکەن. کێڵانی. پاچەکۆڵەی کرد.

عَزقُ الارض: (شَق. حفر) الارض. قلع الادغال/ زەوی هەڵکەندن. پاچەکۆڵەکردن.

عَزقَة: صَمولَة/ سەمونە. نەت.

عَزَلَ الشيءَ عن غيره: ابعَدَ. فَصَلَ/ لێی دوورخستەوە. جیای کردەوە.

عَزَلَ: مَنَعَ الاتصال والتَسَرُّب. سَدّ تماماً/ پەیوەندی نەهێشت. دایخست.

عَزَلَهُ عن مَنصِبِه أو عَمَلِه: خَلَعَهُ. طَرَدَهُ/ دەریکرد. لە ئیش لایبرد.

عَزَلَ عن الكهرباء او الصوت او الحرارة: مَنَع الاتصال والتسرب/ دژە گواستنەسەوەی کارەبا و دەنگ و گەرمی دانا.

عَزَلَ: خَلَعَ. طَرَدَ. فَصَلَ/ دەرکردن. لە ئیش لابردن. لاخستن.

عَزَلَ: إبعاد. فَصل/ دوورخستنەوە. جیاکردنەوە.

عَزَّلَ: نَقَلَ مَسكَنَهُ/ گواستیەوە. ماڵی گواستەوە. شوێنی گۆڕی.

عَزَلَ الدكانَ مثلاً: أغلَقَهُ/ دوکانی داخست. هەڵیگرت.

عُزْل: أعزَل. بلا سلاح/ بێ چەک.

عُزلَة: إنعِزال. إنفراد/ تەنهایی. تەنیایی. دوورەپەرێزی. گۆشەگیری.

عُزلَة: إعتِزال. تَنَحٍّ/ وازهێنان. دەستهەڵگرتن. خانەنشین.

عَزَمَ على: إعتزم. نَوى. قَرَّرَ/ بڕیاری دا. ویستی. نیازی کردنی کرد.

عَزَمَ: سَحَرَ. إستعمل العَزائم/ جادووی کرد. نوشتەی کرد.

عَزم: ثبات وشِدّة في مايَعزم عليه الإنسان/ کۆڵنەدان. لەسەر ڕۆیین. دریغی نەکردن. سووربوون.

عَزم: النيّة او الإرادة المقدمة. تصميم/ بڕیاردان. مەبەست. نیاز.

عَزو: نِسبَة. إسناد/ درانەپاڵ. خرانەپاڵ.

عَزْو: إتّهام/ تاوان دانە پاڵ. گوناهبارکردن.

عُزوبَة: عُزوبِيَّة: عُزبَة. فترة العُزوبِيَّة/ بێ ژنی. ڕەبەنی.

عَزوف عَن: راغِب عن. كارِهٌ لـ/ بێزار. نایەوێ. بە دڵی نیە.

عُزوف عن: إمتناع. إنصراف. زُهد/ وازهێنان. دەستهەڵگرتن. گوێپێنەدان.

عَزمٌ على: عازِمٌ على. مُصَمِّم/ خاوەن بڕیار. هەتەر. سوور لەسەر مەبەست. بێ پەروا.، بڕیار نەشکێن.

عَزِيَ: صَبَرَ على ما أصابَهُ/ ئارامی بە خۆی دا. خۆی ڕاگرت. لە بەردەم ئەوەی تووشی بووە.

عَزيز: شريف. مُكَرَّم/ خانەدان. وەجاخزادە. مەزن. پیاوچاک. سەربەرز. دڵسۆز.

عَزيز: غالٍ. ثَمين/ بەنرخ. گران. گرانبەها.

عَزيز: محبوب/ خۆشەویست. جگەرسۆز.

عَزيز: نادر/ زۆرکەم. دەست ناکەوێ. دەگمەن.

عَزيز الجانِب: قَوِي. شديد. مُقتَدِر/ بەهێز. بەتوانا. بەزەبر.

عَزيمَة: رُقيَة/ نوشتە. دۆعا.

عَزيمَة: عزم. تصميم. الإدارة المؤكّدة/ نیاز. بڕیاردان. مەبەست.

عَزيمَة: دَعوَة. وَليمَة/ زیافەت. داوەت. بانگ کردن.

عَسَّ: طافَ يَحرُس ليلاً/ بە شەو پاسەوانی ئەکرد. چەرخەچی بوو.

عَسى: لَعَلَّ. رُبَّما/ لەوانەیە. ڕەنگە. بەشکو. خۆزگە.

عَسّاس. ذِئب/ گورگ.

عَسّاف: عَسوف. مُتَعَسِّف. ظالم. طاغيَة/ زۆردار. ستەمکار.

عَسّال: نَحّال. مَن يجمع العَسَل/ هەنگەوان. هەنگوین گر. ئەو کەسەی لە هەنگ و هەنگوینا کارئەکا.

عَسّالة: خَليَة نحل/ کوورەی هەنگ. پوورە. شلخە.

عَسجَد: ذَهَب/ زێڕ. ئاڵتون. تەڵا.

عَسَرَ. عَسُرَ. عَسِرَ: ضِد يَسُرَ. صَعُبَ/ (گران. سەخت. ناڕەحەت. قورس) بوو.

عَسَرَ عليه مافي بَطنه: لم يَخرُج/ سكى ناڕەحەت بوو. دەرنەئەچوو. قەبز بوو.

عَسَرَت. عَسِرَت المرأةُ: أعسَرَت/ بە ناڕەحەت مندالّى بوو.

عَسُرَ الرَجُل: ضاق خُلقُه/ بێتاقەت بوو. ئارەزووى هيچى نەبوو.

عَسِرَ: كان أعسَر. يَعمل بِيسراه/ چەپە بوو. چەپلەر بوو.

عَسَّرَ عليه: ضَيَّقَ عليه/ (وەڕس. جاڕس. بێزار)ى كرد. تەنگى پێهەلّچنى.

عَسَّرَ الأمرَ: جَعَلَهُ عَسِيراً. صَعَّبَ/ كارەكەى گران كرد.

عَسِر: عسير. صَعب. شاق/ گران. ناڕەحەت. قورس. سەخت. دشوار.

عَسِرُ الهَضم. صَعب الهَضم. لاتهضمه المعدة/ خواردنى قورس. بە گران هەرس ئەبێ.

عَسِر. ضَيِّق الخُلق/ بێتاقەت. ناڕەحەت. بێ ئارەزوو.

عُسر. عُسُر. عُسرَة: صُعوبَة. شِدَّة/ ناڕەحەتى. ناخۆشى. دەربەدەرى. تەنگانە.

عُسر. عُسُر. عُسرَة: فَقر. ضِيق/ هەژارى. نەبوونى. نەدارايى. دەستكورتى.

عُسر الهضم: سوء الهَضم/ گرفت. هەرس نەكردن.

عُسر البَلع/ قووت نەچوون.

عُسر التَنَفُس/ تەنگەنەفەسى.

عَسَس: حارس ليلي. دَوريَة/ پاسەوان. چەرخەچى. حەسحەس.

عَسَفَ: إعتَسَفَ. تَعَسَّفَ. ظَلَمَ/ زۆردارى كرد. جەور و ستەمى كرد. زۆرى كرد. زۆردار بوو.

عَسَف الطريقَ وعن الطريق: عدل حاد إنحرف عَنه/ لە ڕێ لايدا. لاڕێى گرت.

عَسَفَ في الأمر: فَعَلَهُ بِلا رَوِيَة/ هەلّەشە بوو. هەلّەشەيەى و بێ بيركردنەوە كردارى كرد.

عَسف: ظُلم. تَعَسُّف/ زۆردارى. جەور و ستەم.

عَسف: سلوك غير الطريق الصحيح/ لاڕێ گرتن.

عَسكَر القومُ: تَجَمَّعُوا/ كۆبوونەوە. كۆمەلّيان كرد.

عَسكَرَ الجُندُ: خَيَّما/ سوپا و سەرباز هەلّيدا. چادرگايان كرد.

عسكَرَ الليلُ: تراكمت ظُلمتُه/ شەو تاريكى كرد. بوو بە شەوەزەنگ.

عَسكَر: جُند. جَيش/ سەرباز. لەشكر. سوپا. سپا.

عَسكَري: جُندي/ سەرباز. ئەندام لە سپادا.

عَسكَري: حربي/ جەنگاوەر.

عَسكَرِيَة: خِدمَة عسكرية/ پيشەى سەرباز. سەربازێتى.

عَسَّلَ. عَسَلَ. خَلَطَ أو حَلّى بالعَسَل/ هەنگوينى (تێكرد. تێكەلّ كرد. پياكرد. پێوە كرد).

عَسَل: شَهد. طَلَّان/ هەنگوين.

عَسَل صافي/ ڕنگالّ. دۆيە. هەنگوينى پالّفتە.

عَسَل التمر: دِبس الرُطَب/ دۆشاو. دۆشاوى خورما.

قُرص العَسَل: قُرص الشَهد. شمع العَسَل/ شانەى هەنگوين.

عُسلُج. عُسلوج: غُصَين. غُصن لَيِّن/ شووڵ. شوولّە.

عَسَلي: بِلون العَسَل/ ڕەنگ هەنگوينى،

عَسوف: عَسّاف. ظالم/ زۆردار. ستەمكار.

عَسير: صَعب. شاق/ سەخت. گران.

عسيف: أجير/ بە كرێ گيراو.

عَشَّ الطائرُ: عَشَشَ: إتَّخَذ عُشاً. وَكراً/ هێلانەى كرد.

عَشَّ: رَقَعَ/ پينەى كرد.

عَشَّ الـشيءَ: جَمَعَهُ. طَلَبَهُ/ كۆی كردەوە. داوای كرد. ویستی.

عَشَّ البَدَنُ: نَحِلَ/ لەرولاواز بوو.

عُشّ. عُشُّ الطائر: بَيتُ الطـائر/ هێلانە. ئێلیان. لونە. كولانە. هیلین.

عَشا: ساءَ بَصَرُهُ في الليل. لم يُبصِر في الليل/ شەوكوێر بوو. تووشی شەوكوێری بوو. بە شەو نابینێ.

عَشّى: قَدّم العَشاءَ/ ژەمی ئێوارەی (خوارد. دانا).

عَشا: عَشاوَة: سوء البَصَر في الليل. عَمى لَيلي/ شەوكوێری.

عَشاء: طعام المساء. وَجبة العَشاء/ ژەمەخواردنی ئێوارە. نانی ئێوارە.

عِشاء: عَشيّ. مَساء. أول الليل/ ئێوارە. سەرەتای شەو. خەوتنان.

صَلاة العِشاء/ بانگی خەوتنان.

عَشائر (مفردها عَشيرة): قبائل/ چەند هۆز و تیرەیەك.

عَشائري: قبلي/ تیرەگەری.

العَشائريّة. النَّزعَة العَشائرية: قَبَليّة/ تیرەگەرێتی.

عَشّار: آخِذ أو جابي العُشر/ دەیەك سەن. باجگری دەیەك.

عُشار: عَشرة عَشرَة/ دەدە.

عِشار: عُشَراء: حُبلي للبهائم/ ئاووس.

عَشاوَة: سُوء البَصَر في الليل/ شەوكوێری. كەم بینین بە شەو.

عَشِبَ. عَشُبَ. عَشَّبَ. إعشَوشَبَ المكان. نَبَت وكَثُر عُشبُه/ گیای لێ (ڕوا. دەرهات) گیاكەی زۆر بوو.

عَشِب. عَشيب. مُعشِب. كثير العُشب/ مێرگ. گیاپۆش. سەوزەڵان.

عُشب: كلأ. حَشيش. مَرعى/ گیا. سەوزەگیا. پەرێز. پووش. لەوەڕ.

عُشبي: نباتي. حَشيشي/ گیایی.

عَشَرَ: عَشْرَ: أخذ العُشر/ دەیەكی برد.

عَشَّرت الدابّةُ: صارت عُشراء/ ئاووس بوو. تكەی گرت.

عُشر: جُزء م عَشَرة. ١٠/١. عُشر/ دەیەك.

عَشَرة: (١٠)/ دە.

عِشرة: صُحبة. رفقة. خلطة. مُعاشرة/ تێكەڵی. ناسیاوی. برادەری. هاوەڵێتی.

عِشرون: (٢٠)/ بیست.

العِشرون: بیستەم (هەم. هەمین).

عُشري: عُشري: المنسوب الى الأعشار/ دەیی. دەیانە. دەدە.

كَسر عُشري/ كەرتی دەیی. كەرتی دەیەكی.

عَشَّشَ الطائرُ: عَشَّ. إتَّخذ عُشاً. وَكَر/ هێلانەی كرد.

عَشِقَ: أُغرِمَ بـ. احبّ. تَعَلّق به قلبُهُ/ حەزی لێكرد. دڵی پیاچوو. خۆشی ویست.

عَشِقَ بالشيء: لَصِقَ به/ پێوەی نوسا. پیالكا.

عَشَّقَ: شَبَّكَ. رَكَّبَ/ كردی بەناو یەكدا. تێهەڵكێشی كرد.

عِشق: غرام. حُب/ دڵداری. خۆشەویستی. حەزلێكردن. ئەڤین.

عَشو: عَشا. سوء البَصَر في الليل. عَمى لَيلي/ شەوكوێری.

عَشواء: أعشى. لايُبصِر ليلاً/ شەوكوێر. شەونابینێ.

عَشواء: أعشى. ضعيف البَصَر/ چاوكز.

عَشواء: ظلام. ظُلمة/ تاریكی.

خَبطَ عَشواء: يَتَصرَّف على غير بَصيرة. جُزافاً. كيفما إتَّفق/ كوێرانە. بەبێ بیركردنەوە كار ئەكا.

عَشوائي: جُزافاً. إعتباطاً. كيفما إتّفق/ كوێرانه. به ڕێكەوت. چۆن بكونجێ.

عَشوَة. عِشوَة. عَشواء. ظَلام. ظُلمَة/ تاریكی.

عَشِيَ: عَشا: ساء بَصَرُهُ. لم يُبصر ليلاً/ شەوكوێر بوو. تووشی شەوكوێری بوو. به شەو نابینێ.

عَشِيّ: عِشاء. مَساء/ ئێواره. سەرەتای شەو. خەوتنان.

عَشيب: عَشِب. مُعشِب. كَثير رالعُشب/ مێرگ. گیاپۆش. سەوزەڵان.

عَشِيّة: عَشِيّ. عِشاء. مَساء/ ئێواره. سەرەتای شەو. خەوتنان.

عَشِيّة كذا: تلك الليلة/ لەو شەوەدا.

بَينَ عَشِيّة وضُحاها: خلال ليلة واحدة. على حين غُرّة/ كوتوپڕ. زۆر به خێرایی. زۆری نەخایان.

عَشير: رفيق. صاحِب. صَديق/ برادەر. هاوەڵ. خزم. خوێش.

عَشيرة: قَبيلَة/ هۆز. تیره. خێڵ. ئێل.

عَشيق: مَعشوق. مَحبوب. حَبيب/ خۆشەویست. دڵدار. یار. دەستە.

عَصَّ: صَلُبَ. إشتَدَّ/ جیڕ بووەوە. تورت بوو.

عَصّ: أصل. كريم العَصّ: كريم الأصل/ ڕەسەن. نەژاد. خانەدان.

عَصَى: خَرَجَ عن الطاعَة. تَمَرَّدَ/ یاخی بوو. بەلاسە بوو.

عَصا الرَجُلَ: ضَرَبَهُ بالعَصا/ بەدار لێی دا. داری پیاكێشا. داركاری كرد.

عَصا. عَصايَة: قَضيب. عُود/ دار. داردەست. چۆڵ. گۆپاڵ. گالۆك. دارشەق.

عَصا. جَماعَة/ كۆمەڵ. كۆمەڵە. چەند كەسێك.

إنشقت عَصا القَوم: وَقَعَ الخلاف بَينَهم/ ناكۆكیان تێكەوت.

ألقى المُسافِر العَصا: بَلَغَ مَوضِعَه/ ڕێبوار گەیشته جێ.

ألقى عَصا التَرحال: أقام/ لایدا. هەڵیدا. كۆچوباری خست.

شَقّ العَصا: خالَفَ جماعَتَه/ سەرپێچی كرد. له كۆمەڵ لایدا. یاخی بوو.

الناس عَبيد العَصا: يَهابون مَن آذاهُم/ كوتەك لەزانی قۆناغ له كوێیه. بەندەی دار و زۆردارن.

صَلبُ العَصا: غَير رَقيق/ ڕەق. كەللەڕەق. سەرسەخت. وشك.

لَيِّن العَصا: رَقيق. لَيِّن/ ناسك. نەرم و نیان. ڕووخۆش.

قَرَعَ لَه العَصا: نَبَّهَه/ ئاگاداری كرد. وریای كردەوه. تێوەی ژەن.

قَرَعَهُ بِعَصا المَلامَة: بالَغَ في عَذلِه/ گلەیی زۆری لێكرد. سەرزەنشتی كرد.

قَشَّرَ لَهُ العَصا: أبدَى له ما في ضَميرِه/ ڕاز و گلەیی خۆی لا دركان. چی پێبوو پێی وت.

عِصاب. عِصابَة: زُمرَة.. جَماعَة/ كۆمەڵ. چەته. تەریده.

عِصابَة: رِباط. عِمامَة/ سەرپێچ. مێزەر. سەربەست.

حرب العِصابات/ چەتەگەری.

عَصّارَة: مِعصَر. مِعصَرَة. آلَة العَصر/ گوشەر. ئامێری گوشین.

عُصارَة: عَصير. خُلاصَة/ ڕیتگاو. ئاووك.

عُصارَة: ما بَقيَ مِن الثُفل بَعدَ العَصر/ تلپه.

عُصارَة النَبات: عُصارَة لَبَنِيّة تُفرِزُها بعض النباتات/ ئاووك. لیكاو. شیلوك. شیری ڕووەك.

عِصار: الغُبار الشَديد/ تەپ و تۆز.

عَصافير: صاحَت عَصافير بطنه: جاعَ/ برسی بوو. سكی قۆڕەی هات. له برسانا.

عِصام: عَهد/ پەیمان.

عِصام: شریط. سَیر. حِمالَة/ هەڵگر. ڕاگر. پەت. پەیتان. ئەوپەتەی مەشکەی پێ هەڵئەواسرێ.

عِصام: عُروَة. إنشوطة/ گرێ. گرێ قوڵفە. قوڵف. دەسک.

عِصام: كَحل/ كل.

عِصامي: مُرتَقٍ بِجِدّة واجتهاده. صِفَةٌ لِمَن بَنى نَفسَهُ بِنَفسِه/ خۆپێگەیێن.

عَصَبَ. عَصَّبَ: رَبَطَ. شَدَّ/ بەستی. پێچای. تێوەی ئاڵان. پێچایەوە. قەدی کرد.

عَصَبَ الريقُ بالفَم: يَبِسَ عليه/ تف (لە دەمیا.. لە گەروویدا. بە دەمیەوە) وشك بوو.

عَصَب: عِرق/ دەمار. ژێی ماسولکە. دەماری ماسولکە.

قَرابَة عَصَب. قَرابَة من جِهَة الأب/ خزمانی باوك.

عُصبَة: رابِطَة. جامِعَة. مُنَظَّمَة/ کۆمەڵ. دەستە. ڕێکخراو.

عُصبَة: زُمرَة/ کۆمەڵ. تەریدە.

عُصبَة الأمم/ کۆمەڵەی گەلان.

عُصبَة: عِصابَة. رِباط/ پێچەر. سەرپێچ. سەرپەست.

عَصَبي: مُختَصّ بالأعصاب/ دەماری. شارەزای دەمار. پەیوەندیدار بە دەمارەوە.

عَصَبي المِزاج: حاد الطَبع. سريع التأثر والانفعال/ تووڕە. کەللەڕەق. شێتکە. جنگڵی. دەمارگرژ. توند خوو. زوو هەڵئەچێ. توندڕەو.

عَصَبيَّة: تَعَصُّب. قَبَليَّة. تَحَزُّب/ دەمارگیری. تیرەگەری.

عَصَبيَّة في المِزاج/ تووڕەیی. کەللەڕەقی. زووهەڵچوون.

عَصَرَ الشيءَ: إستَخرَج ماءَه/ گوشی. ئاوەکەی لێدەرهێنا.

عَصَرَ: ضَغَطَ. كَبَسَ/ پەستانی. گوشی.

عَصَرَ الشيءَ عنه: مَنَعَه/ لێی قەدەغە کرد.

عَصَّرَ: عَصرَنَ: حَدَّثَ/ تازەی کردەوە. نوێی کردەوە. خستیە سەر شێوە و مۆدێلی تازە.

عَصرَنَة: تحديث/ تازەکردنەوە. نوێکاری.

عَصر: إستِخراج الماء او السائل/ گوشین. ئاودەرهێنان. ئاوگرتن. پەستاندن.

عَصر. عُصر. دَهر. زَمَن/ چاخ. دەم. چەرخ. سەردەم. سەدە. کات. ڕۆژگار.

عَصر: بَعد الظُهر/ پاش نیوەڕۆ. عەسر.

العَصر الجليدي/ چاخی بەفرین. سەدەی سەهۆڵبەندان.

العَصر الحَجري/ بەردە چاخ. سەدەی بەردین.

عَصري: حديث/ تازە. نوێ. مۆدێلی تازە.

عَصريَّة: حَداثَة/ نوێکاری.

عَصريَّة: إجتماع عائلي عِند العَصر/ دانیشتن و چای عەسران.

عُصعُص. عُصعُص: عَجبُ الذَّنَب/ بنکی کلك. قنگەجۆڵە.

عُصعُص. عُصعوص: عَظم الذَّنَب. زِمكَى/ ئێسقانی کلك. کلێنچکە. قلێنچە.

عَصَفَ: أسرَعَ/ گوڕی دا. دایە غار. دایە گوڕ.

عَصَفَ الدَهرُ بِهِم: أبادَهُم/ ڕۆژگار لەناوی بردن. سەرگەردانی کردن. تەفروتونای کردن.

عَصفُ الزَرع: جَزُّهُ قَبلَ أن يُدرِكَ/ بە سەوزی درووێنە.

عَصَفَ الرَجُلُ: هَلَكَ/ پەریشان بوو. پرزەی بڕا. فەوتا.

عَصَفَ: أعصَفَ عن الطريق. مالَ/ لەڕێ لایدا.

عَصَفَت: أعصَفَت الريحُ. إشتَدَّت/ با هەڵی کرد. باکەی قایم کرد.

عَصَفَت: اعصفَت الحربُ بهم: ذهَبَت بِهِم واهلكتهم/ جەنگ لەناوی بردن. تەفروتونای کردن.

عَصَفُ الريح: هُبوب/ باهەڵکردن. کڵەی با.

عَــصف: حُطــام/ چڵوچێو. خاکــە. پــووش. پاشماوە.

عُصفُر: نبات القُرطم/ گیاکەزنە.

عُصفور: طائر/ مەل. مەلی بچووک.

عُصفور الجَنَّة/ خُکاف. ستونو/ پەرەسێلکە.

عُــصفور دوري/ چــۆلکە. پاســاری. کێــشوولە. چۆلیک. ملیچک. چیژیلە.

عُصفور: الخشب الذي تُشَدُّ بـه رؤوس حِبـال الحمل/ داریەستی بار.

عُصفور: عَظم نـاتيء في جبين الفَرَس/ ئێسقانی ناوچەوانی وڵاخ.

عَــصَلَ: عَــوِجَ/ خــواری کــردەوە. چــەمانیەوە. نوشتانیەوە.

عَــصِلَ: إعــوَجَ/ خواربــووەوە. چــەمایەوە. نوشتایەوە.

عَصَمَ: مَنَعَ/ قەدەغەی کرد.

عَصَمَ: حَفِظَ. وَقَى/ پاراستی. پارازتی.

عَصم. عِصمَة: حِفظ. وِقايَة/ پاراستن. پارازتن.

عِصمَة: تَنَزُّه عن الخطأ أو الخطيئـة/ دووربوون لـه هەڵە و تاوان. گوناه نەکردن. داوێن پاکی.

عِصمَة: قِلادَة/ ملوانکە. ملیوانە. گەردانە.

عِصمَة الزواج: رِباط وحِمايَة زوجية/ پەیوەندی و پارێزراوی ژن و مێردایەتی.

إمرأة في عِـصمَة زَوجِهـا/ ژن لـه نـاو پەیوەندی و پاراستنی مێردا. ئافرەتی بەشوو. مێردار.

صــاحِبَة العِـصمَة: لقَـب العظيمـات مِـن النِّـساء/ ئافرەتانی پایەبەرز و ناودار. شاژن.

عَصِيّ: عـاصٍ. مُتَمَرِد. خـارج عـن الطاعَـة/ یـاخی. سەرپێچ. بەلەسە. لاسار.

عِصيان: مَعصيَة. عـدم الطاعَـة. تَمَـرُد/ یـاخیێتی. لاساری. بەلەسەبوون. سەرپێچی.

عَـصيب: حَـرِج. صَـعب/ دژوار. دشوار. چەتوون. سەخت.

يوم عَصيب: شَديد الحَرَ/ ڕۆژی زۆر گەرم.

عَصيدة: طعام من الدقيق والـسَمن/ حەڵوای ئارد. پەڵوولە.

عَصير. عَصيرَة. عُصارَة: ماتَحلّب ممّـا عُـصِر. شَراب/ شیلاوک. ئاووک. ڕینگاو. گوشراو. دۆشاو.

عَضَّ: أمسَكَ بأسنانه وشَدَّ/ گەزتی. گـازی لێگرت. گازی گرت. قەپی پیاکرد.

عَـضَّ: عَـذَّبَ. آلَـمَ/ ئـازاری دا. ئێشی پێگـەیان. ئەشکەنجەی دا.

عَـضَّهُ الزمـان: إشـتَدَّ عليـه/ ڕۆژگـار سـەخت بـوو لەگەڵی. گەستی.

عَــضّ: الْمَــسكُ بالاســنان بــشِدَّة/ گــازگرتن. گازلێگرتن. گەزتن.

عُضّ. عِضّ. عِضَة. نبات شائك/ درکەزی.

عُـضّ: شَـعير. حِنطـة. اليـابس مـن الحَـشيش/ جۆ. گەنم. پووش و پەڵاش.

عِـضّ: سَـيء الخُلُـق. شَـرِس. خَبيـث/ بێئـابروو. دڕ. دووڕوو.

عِضّ: الشَديد. القَويّ/ جیپ. تورت. قایم.

عِضّ: بَخيل.. القَيِّم على المال/ پارەپیس.

عِضادَة الباب أو النـافذة: خَشَبَتا الجـانبين/ باهوی ئەملاولای دەرگا و پەنجەرە.

عَضّاض: عَضوض. كثير العَضّ/ گازگر.

عَـضاض: مايُؤكَـل/ خـۆراك. ئـەو خۆراکـەی بـه ددانییانان ئەخورێ.

عِضاض: صَبور على الشِدَّة/ به ئارام.

عُضال: شَديد/ سەخت. گران. قورس. نارەحەت. درێژخایەن.

داءٌ عُضال: مُزمِن. مُستعصٍ/ نەخۆشی بێ دەرمان. درێژخایەن. قورسی و گران.

عَضَبَ: قَطَعَ/ بڕی. قرتاندی. لێی کردەوە.

عَضَبَهُ المرض: أقعَدَهُ عن الحركة/ گۆتی کرد نەرد و نەخۆشی یەکی خست. جووڵەی لێبڕی.

عَضِبَ: صارَ أعضَب/ گۆت بوو. پەلێکی نەما.

عَضْب: حادّ/ تیژ. بڕندە.

عَضَّة: المَرَّة مِن عَضّ/ گازێک. گەستنێک. قەپێک.

عَـضَدَ: عاضَـدَ. أعـانَ. عـاوَنَ/ یارمـەتی دا. پشتگیری کرد. دەستی گرت.

عَضْد: مُعضِد. مُعِين/ یارمەتیدەر. پشتگیر.

عَضْد. تَعضِيد. مُعاوَنَة/ یارمەتیدان. پشتگیری. دەستگرتن. یاریدە.

عَضُد. عَـضِد. سـاعِد. ذِراع/ بـاهو. باسک. بـازوو. قۆڵ.

عَـضُد. عَـضِد. غَلـيظ الـذِراع/ قـۆڵ و بـاهوو ئەستوور.

شَـدَّ عَـضُدَهُ قَـوّاه/ یارمـەتی دا. دەسـتی گـرد. پشتگیری کرد. غیرەتی نایەبەر.

عَظْمُ العَضُد/ ئێسقانی باسک. پێدارە.

عَضْعَضَ: عَضّ بِقُوَّة أو كثيراً/ بە قایم گازی لێگرت.

عَضَلَ. عَضَّلَ عليه: ضَيَّقَ عليه ومَنَعَهُ. حالَ بَينَهُ وبين مايُريد/ لێی تێکدا. لێی قەدەغە گرت. تەنگی پێهەڵچنی.

عَضَلَ. عَضَّلَ. عَضَّلَ المرأةَ عن الزواج: حَبَسَها ومَنَعَها/ نەیهێشت شوو بکا.

عَضِلَ: صارَ قَوِيَّ العَضَلات/ ماسولکەکانی بەهێز و قایم بوون.

عَضَلَة: واحِدَة عَضَل الجسم/ ماسولکە. مایچە. مایچە. ماسیلکە.

عَضَلي: مُكَوَّن من العَضَل/ لە ماسولکە پێکهاتووە.

عَضم: مِذراة/ شەن.

عُـضو. عِـضو: جُـزء مـن الجسم/ ئەنـدام. ئەنـدامی لەش. ئۆرگان.

عُضو. عِضو: واحِد من جماعة (عُضو في جمعية مثلاً)/ ئەندام. ئەندامی کۆمەڵەیەک. ئابوونە.

عُضو. عِضو: طَرَف/ پەل. دەست و قاچ.

عُضو. عِضو. قَضِيب/ ئەندامی نێرێتی. کێر.

عَضوض: عَضّاض. كثير العَضّ/ گازگر.

عُضوي: آلي/ ئەندامی. ئۆرگانی. زیندەڵ.

لاعُضوي. غير عُضوي/ نائەندامی.

عُضويَّة (في جَمعيَّة)/ ئەندامێتی. ئابوونە.

عَطاء. عَطا. عَطيَّة. مايُعطى. هِبَة. مِنحَة/ خەڵات. بەخشین. پێدان. دیاری.

عَطاء: عَرض. ثَمَن. مَعروض/ نرخ دانان. تەندەر.

عَطّار: بائع العُطور/ بۆن فرۆش.

عَطّار: بائع العقاقير. التوابل/ داودەرمان فرۆش. وردەفرۆش. عەتار.

عِطـارَة: حِرفَـة العَطّـار/ عـەتار. عـەتاری. داودەرمان و وردەفرۆش.

عُطارِد: أقرَب نَجم سيّار الى الشمس/ ئەستێرەی زاوە.

عُطاس: عَطس/ پژمین. ئاروشە. هەپش.

عُطاش: عَطَش. ظَمَأ/ تینوێتی.

عِطـاف: مِعطَـف/ پـاڵتۆ. سـاقۆ. جرتـە. زرتـە. قاپوت. پاڵتاو.

عَطِبَ: تَلِفَ. هَلَكَ/ یەکی کەوت. خراپ بوو. ڕزی. لەناوچـو.

عَطَـب. تَلَـف. هَـلاك/ یەککـەوتن. خراپبـوون. ڕزین. لەناوچوون.

سَريع العَطَب: سريع التلف. سريع الفساد/ زوو (خراپ ئەبێ. یەکی ئەکەوێ. ئەڕزێ). قرچۆکە. عەمارەیۆ.

عَطبَـة: ريـح خِرقَـة او قُطنَـة مُحترِمـة/ بۆسـۆ. بۆكرووز.

عَطِرَ: تَعطَّـرَ. تَطَيَّبَ. كـان طَيِّـبَ الرائحـة/ بۆنى خۆش بوو. بۆن خۆش بوو. بۆنى دا له خۆى.

عَطَّرَ: طَيَّبَ/ بۆن خۆشى كرد. بۆندارى كرد.

عطر الورد: ماء الوَرد/ گولاو.

عَطِر: عطري: زَكِي الرائحة/ بۆن خۆش. بۆندار.

عَطَسَ: أتـاه العَطسَة/ پژمى.

عَطَّسَ: جَعَلَهُ يَعطُس/ پژمانى. هێنايه پژمين.

عَطس. عُطـاس/ إنـدفاع الهواء بِقـوَّة من الأنـف/ پژمين. پژمه.

عَطِشَ: ضِد رَوِيَ/ تينووى بوو. تينوو بوو.

عَطِشَ اليه: إشـتاقَ/ بيرى كرد. ئارەزووى كردن بۆى تينوو بوو.

عَطَش: ظَمَأ/ تينويّتى.

عَطَّشَ: أعطَشَ. أظمَأ/ تينووى كرد.

عَطِش: عَطشان. عاطِش. مُتَعَطِّش/ تينوو. تەژنه.

عَطَفَ: عَطَّفَ: حَنى. ثَنى. أمالَ/ خوارى كردەوه. لارى كردەوه. وەرى گێڕا. چەمانيەوه.

عَطَفَ الى: مالَ/ لايدا. وەرگەڕا.

عَطَفَ: تَعطَّفَ على. حَنَّ. رَقَّ لـه قَلبُـهُ/ دڵى نـەرم بوو. بەزەيى پياهاتەوه. دڵى پێ سووتا.

عَطَـفَ عَـن: إنـصَرَفَ/ وازى لێهێنـا. پووى لـێ وەرگێڕا. دەستى لێهەڵگرت.

عَطَـفَ كلمـةً علـى أخـرى: أتبَعَهـا إيّاهـا/ وشـەى پەيوەندكرد بە وشەى ترەوه.

عَطـف: حَنـان. حَلـو. إمالَـة/ چـەمانەوه. نوشتانەوه. لاركردنەوه. خواركردنەوه.

عَطـف: إنعطـاف. حَنيَـة. مَـيلان/ چـەماوەيى. لارى. خوارى. لێژى.

عَطـف (في اللغـة): إتبـاع كلمـة بـأخرى/ پەيوەندكردنى وشه پێكەوه.

حَـرف عَطـف. أداة عَطـف/ ئـامرازى پەيوەنـدى. ئامرازى يەكخەر.

عِطف: جانِب/ تەنيشت. لا.

عِطف: إبط/ بنباخەڵ. بنبال.

عَطَّـف: لـبلاب. نَبـتٌ يَتَلَـوّى علـى الـشجر/ لاولاو. خۆهەڵواس.

عَطفَة: مُنعَطَف. مُنحَنى/ پێچ. لارى. سەرەوخوار. لێژى.

عَطفَة: زُقاق/ كۆڵان. لاكۆڵان. كووچه.

عَطَّلَ عَـن العمـل: تَعطَّـلَ عَـن العمـل/ وەستا. لـه كاركەوت.

عَطِلَ مِن: خَلا مِنْ/ پێوەى نيه. تيا نيه. لەگەڵى نيه.

عَطَّـل الـشيءَ: تَرَكَـهُ ضَـياعاً/ فەرامۆشـى كـرد. خستيه پشتگوێ. وازى لێهێنا.

عَطَّلَ: أوقَفَ العَمَلَ. عاقَ/ وەستانى. رايگرت. له ئيش وەستانى. له كارى خست. پەكى خست.

عَطَّلَ المجلس: أوقَفَهُ لأجَل/ ئەنجومەنى راگرت. رايوەستانى.

عَطَّلَ المرأةَ: نَـزَعَ حُلِيَّهـا/ خشڵەكانى لێكردەوه. پێى داكەند.

عُطـــل: تَوَقُّــف. حـــدوث خَلَـــل/ وەســـتان. لەكاركەوتن. پەككەوتن. خراپبوون.

عُطلٌ مِن: خُلوٌ مِن/ تيانەبوون. لەگەڵ نەبوون.

عُطلَة: فُرصَة. إستراحَة/ پشوو.

عُطلَـة نهايـة الأسبوع/ رۆژه پـشووى هەفتانـه. پشووى كۆتايى هەفته.

عُطلَة مَدرَسِيَّة/ پشووى قوتابخانه.

عُطلَة (كعُطلَة المحاكم والبرلمان): تَوَقُّف عن العمل/ پشوو. كاروەستان. ئيش نەكردن.

عَطَـنَ. عَطَّـنَ الجلـدَ: وَضَـعَ في الـدباغ/ پێـستەى دەباخ كرد. داڕووى پێوه كرد. خۆشەى كرد.

عَطَنَ. عَطَنَ الكتانَ: نَقَعَهُ ليَعتري/ كەتان و گوشی خوسان تا بپروێ.
عَطَنَ. خَمَّ. إنتَنَ/ بۆنی کرد. بۆگەنی کرد.
عَطَّنَ: تعطين. تَفَسَّخَ واسترخاء وتَقع/ خووساندن. خوشەکردن.
عَطوف: شَفيق. حَنون/ دڵسۆز. دڵنەرم. دلۆڤان. بە بەزەیی. میهرەبان. بەسۆز.
عَطيَـة: عَطـاء. كيُعطـي. هِبَـة. مِنحَـة/ خـەڵات. بەخشین. پێدان. دیاری.
عَظاءَة: عِظايَة: سحلية/ مارمێلکە. شەوگەرد.
عِظَـة: مَوعظَـة. مـا يُتَّعَظ بـه. نَـصيحَة/ پەنـد. ئامۆژگاری. ئەوەی دەرسی لێ وەرئەگیرێ.
عَظُمَ: كَبُرَ. صار عظيماً/ گەورە بوو. مەزن بوو.
عَظُـمَ الأمـرُ عليـه: صَـعُبَ وشَـقَّ/ کـار گـران بـوو. سەخت بوو. دژوار بوو. نارەحەت بوو.
عَظَّمَ: فَخَّمَ. بَجَّلَ. كَبَّرَ/ گەورەی کرد. مەزنی کرد. رێزی لێنا.
عَظم: نَسيج صَلب يتكون منه الهيكل العَظمي. قَصَب الحيـوان والانـسان/ ئێـسك. ئێـسقان. هێـستی. هێسك. هەستی. پێشە. سوقان. سخان. ملێن.
عَظم الأنف. عظم الأنفي/ كۆڵەكەی لووت.
عظم التَرقوَة. العظم في أعلى الـصَدر/ كرۆژە لـە. كرۆجەلە.
عظـم الجَبهـي: مُقدمَـة الـرأس/ ئێـسقانی پێـشە سەر. ناوچەوان.
عظــم الجــداري: الجُمجُمَــة/ قــاپیلکی ســەر. کۆجەڵە.
عظـم الحَنـك: الـذقن/ چـەنە. چـەناگە. ئـاگر گوشك.
عظم الحَوض: حَرقَفَة/ كلۆت. قالْچە.
عظم الداغصَة: صابونَة الرُكبَة/ كلاوەی ئەژنۆ.
عظم الرُسـغ: المفـصل بـين الـساق والقـدم/ خرکە. قاپ.
عظم الرُسغ: المفصل بين الساعد والكف/ مەچەك.
عظـم الزَنـد: العظـم بـين المرفـق والكـف/ بـازوو. باسك.
عظـم الـسُلاميات: عظـام أصـابع القـدم/ خـلول. پلوچکەی پێ.
عظـم الـسلاميات: عظـام أصـابع اليـد/ پلوچـەی دەست.
عظم الشَظيَة: عظم الساق/ ساقۆڵ.
عظم الضلع: عظام الأضلاع/ پەراسوو.
عظم الضلع السائب/ پەراسوی بەرەڵا.
عظم صُـدغي: عظـم في أسـفل الجمجمـة بـين العـين والأذن/ كڕگلاگە.
عظم العجز: عظم العُصعُص/ کلۆت. قالْچە.
عظم العَضد: عظـم الـذراع من المرفـق الى الكَتِـف/ بەرمش. بێدارە.
عظـم الفَخـذ: مـن الركبـة الى الحَـوض/ ئێـسقانی ڕان. پێدارەی ڕان.
عظم الفَك السُفلي/ شەویلە. شەویلاك.
عظم الفَك العُلوي/ ئاڵۆشە.
الفَقَرَة. الفقرات/ بربرە.
الفقرات العُنقية/ بربرەی مل.
الفقرات القطنية/ بربرەی داميَن. سێبەندە.
العمود الفقري/ بربرەی پشت.
عظم قَصَبَة الـساق: الظنبـوب/ لوولاق. ڕەقینە. قالور.
عظم اللوح: المنكب/ دەفە. دەفەی شان. شـەپە. شەپیلە.
عظم وَجني: المحيط بـالعينين/ كالانەی چاو.
عظم الكُعبُرَة: العظم مابين المرفق والكف/ باسك.
عظم الكاحل. الكعب/ پاژنەی پێ. ڕەقەڵەی پێ.

عَظُمَ الشيءُ: أكثَرُهُ/ بەشی زۆری شت. زۆربە.

عُظم. عِظَم. عِظَم: خِلاف الصِغر. كِبَر. ضَخامَةٌ/ گەورەیی. مەزنی.

عِظَم: أهَمیَّةٌ/ گرنگی. بایەخ.

عَظَمَة: فَخامَةٌ. جَلال/ مەزنی. گەورەیی. شكۆ. شكۆمەندی.

عَظَمَة: قُوَّة. جَبَروت/ هێز. توانا. زۆرداری. سام.

عَظَمَة: كِبر/ گەورەیی. شانازی. بایی بوون. دەبدەبە. تەنتەنە. خۆبەزل زان.

صاحِب العَظَمَة/ خاوەن شكۆ.

مرض العَظَمَة: جنون العَظَمَة/ تەرو فیز. لووت بەرزی. دەردی خۆ بە (زل زان. گەورە دانان).

عَظمَة: عَظم. قِطعَةٌ من العَظم/ ئێسقان. پارچە ئێسقان. گرتك.

عَظموم: وَرَم عَظمي/ ئاوسانی ئێسك.

هَیكَل عَظمي: مجموع العِظام/ ئێسكە پەیكەر. پەیكەری ئێسقان. ئێسك بەند.

عظیم: جَبّار. قَوِيّ/ بەهێز. بەسام.

عظیم: خطیر. هام/ ترسناك.

عظیم: فاخِر. نَفیس/ نایاب. نادیدە.

عظیم: فَخم. جلیل. مُهیب/ گرنگ. مەزن. خاوەن شكۆ.

عظیم: كبیر. ضَخم/ گەورە. كەتە. زل.

عظیمة: مُعظَمَة. مُصیبَة شَدیدَة. نازِلَة/ بەڵای گەورە. كارەسات.

عَفَّ: تَعَفَّف. أصبَحَ عفیفاً طاهراً/ پاك بوو. خاوێن بوو. داوێن پاك بوو. پووسوور بوو.

عَفَّ عَن: إمتَنَعَ/ وازی هێنا. دەستی لێهەڵگرت.

عَفّ. عَفیف: طاهِر. نَزیه/ خاوێن. داوێن پاك. راست. دەستپاك.

عَفا (عَنهُ. عن ذَنبِهِ. لَه ذَنبَهُ): صَفَحَ عَنهُ/ لێی بورد. بەخشی. لێی خۆش بوو.

عَفا: مَحا. إمَّحَى/ سڕیەوە. سڕرایەوە. نەما.

عَفا عن الشيء: أمسَكَ عَنهُ/ وازی لێهێنا. دەستی لێهەڵگرت.

عَفا اللهُ عَمّ سَلَف: الذي فات مات/ هەرچی بوو بۆی.

عَفا: مَحا. أزالَ الأثَر/ سڕیەوە. شوێنەواری نەهێشت.

عَفاء: مَحو. إمحاء. إزالَة الأثَر/ سڕینەوە. شوێنەوار ونكردن و نەهێشت.

عَفاء: تُراب/ خۆڵ. خاك. گڵ.

عَفاف. عِفَّة: طَهارَة. نَزاهَة/ پاكی. خاوێنی. داوێن پاكی. راستی. راستگۆیی.

عِفاق: دَواء/ دەرمان. چارە.

عَفَج. عِفج. عَفج: المعي الإثنا عشري/ ریخۆڵەی دوانگزە گرێ.

عَفَرَ. عَفَّرَ في التراب: مَرَّغَ ودَسَّ في التراب/ لەخۆڵ تلانیەوە. گەوزانی. كردی بە ژێر خۆڵەوە.

عَفَر. عفر: تُراب/ خۆڵ. خاك.

عِفر. عُفر: ذَكر الخنزیر: الخنزیر البَرّي. حَلوف/ بەكانە. بەرازی. كێوی.

عُفر: شجاع/ ئازا. نەترس.

عفراء: أرض بیضاء/ گڵە سپی. خاكی سپی.

عفراء: لیلَة مقمرة. الثالثة عشر/ مانگەشەوی. شەوی سیازدە.

عفریت: شیطان/ دێو. خێو. دەعبا. شەیتان.

عفریت: خبیث. مَكّار. كثیر الاحتیال/ فێڵباز. ساختەچی. گێرەشێوێن.

مكان فیه عفریت: مَسكون/ خێوی لێیە.

عُفرَة: شَعر القَفا/ تووك و پەڕی پشتی مل. یاڵ. كەڵەموو.

عَفرَتَة: شَیطَنَة/ تەڵەكەبازی. ساختەچێتی. فێڵ و فەرەج.

عَفَش: جَمَعَ/ کۆیکردەوە.

عَفَش: عُفاشَة: مالاخیر فیه/ شتومەکی بێکەڵک.

عَفَش: امتعَة. أثاث/ کەلوپەل. نوێن. ناومال.

عَفَص: ثَمَرٌ يَحصَل على شجر البلوط/ مازوو. مازی. سیچکە. گزگل.

عفص: دَواء قابِض/ دەرمانی ڕەوانی. قەبزکار.

عفط: ضَرَطَ بِشَفَتيه/ جرتی (لێدان کەن. کێشا).

عَفط. عَفطَة: ضَرطَة بالشفتين/ جرت. جرت لێدان.

عَفَن: تَعَفَّن. فَسَدَ/ خراپ بوو. بۆنی کرد. بۆگەنی کرد. کەڕووی هەڵهێنا. گەنی. پڕکی کرد.

عَفَن. عُفونَة: تَعَفُّن. فَساد/ گەنین. خراپبوون. بۆنکردن. بۆگەنکردن. کەڕووهەڵهێنان.

عَفِن: مُعَفَّن: مُتَعَفِّن. فاسِد/ کەڕواوی. بۆنکردوو. بۆگەن. پیس.

عَفو: مَحو/ سڕینەوە.

عَفو: فَضل. مَعروف/ چاکە. پیاوەتی.

عَفو: عِفوَ. عُفُو. عَفوَة: وَلَد الحمار/ جاش. جاشەکەر.

عَفواً: مَعذِرَة. أرجو صَفحَكم/ ببەخشە. تکاری لێبوردن ئەکەم.

عَفواً: إعتباطاً. تلقائياً/ بە ڕێکەوت. لەخۆیەوە.

عَفواً: كلمة تقال جواباً لِشكراً/ شایان نیە.

عُفونَة: تَعَفُّن. عَفَن. فَساد/ گەنین. خراپ بوون. بۆنکردن. بۆگەن کردن. کەڕو هەڵهێنان.

عُفونَة الدَمّ: مرض في المواشي/ لاڕەشە. بۆگەنەتا.

عُفونَة الظِلف: مرض في المواشي. دُخس/ ئارتک. شەلکە. تەبەق.

عَفَوي: تلقائي. مِن تلقاء نَفسه/ خۆڕەس. لەخۆیەوە. بەربووره. لەبەربووره. لەخۆڕا.

عَفيف: عَفّ. ذو العِفَّة. طاهِر. نزيه/ خاوێن. پاك. داوێن پاك. ڕاستیز دەستپاك.

عَقَّ الوَلَدُ والِدَهُ: عَصاهُ. شَقَّ عصا طاعته/ کوڕ یاخی بوو لە باوکی. بەلەسە بوو. بە قسەی نەئەکرد. لە ڕوویا هەڵئەگەڕایەوە.

عَقّ: عُقوق. جُحود الجميل/ ناکەس بەچەیی. سپڵەیی. نمەك بەحەرامی.

عَقارِب. عقرب/ دووپشك.

عَقّ: عاق. عقوق. مُخالِف. مُناقِض/ دژوار. چەتوون. نالەبار. یاخی. سەرپێچ.

عُقاب: نَسر. كاسِر/ دال. ڕەشەدال. دالاش. بازۆری. خەرتەل. دڵەکەرخۆر. سپر.

عُقاب مُلحَي: قصاص. جزاء/ سزا.

عَقّاد: صانع الخيوط وبائعها/ بەن ڕێس. مووتابچی.

عَقار: مالٌ غير مَنقول. دار. أرض. ضَيعَة/ خانوو. خانووبەرە. زەوی و زار. مڵك.

عَقّار: دَواء/ دەرمان. دلودەرمان.

عَقارَة: عُقرَة. عَقرَة: عُقم. عَدم الحَمل/ نەزۆکی. نەزی.

عقاري: خاص بالعقارات/ پەیوەندیدار بە خانووبەرەوە.

عُقّال: تَشَنُّج مؤلم في عَضَلَة/ دەمار بە گیر وەستان. دەمارگرتن.

عِقال: شِكال. قَيد/ پێوەند. دەستبەست. پاشبەند.

عِقال: مايُشَدّ على الراس/ عەگال.

عَقَبَ: أعقَبَ. تَبِع. تَلا. جاء بَعد/ بەدوایا هات. لە دوایەوە بوو.

عَقَبَ على: عَلَّقَ على/ بەدوایا دووا. لێی کۆڵیەوە. قسەی لەسەر کرد.

عَقِب: عَقب. مؤخر القدم. كَعب. عظم مؤخر القدم/ پاژنە. پاژنەی پێ. ئێسقانی پاژنە.

عَقب. عَقب: وَلَد. وَلَد الوَلَد. ذرِيَّة/ کوڕ. کوڕەزا. مندالْ. وەچە. نەوە.

عَقب. عَقب: تـابع. لاحـق. آخـر بَقيَـة/ پاشکۆ. لەگەڵ. لە شوێن. بەدوایا. پاشماوە.

جـاء عَقِبَـهُ وبعقبـه: خلفـهُ/ بـەدوایاهات. لـە دوایەوە بوو. دوای ئەو هات.

رَجَعَ على عَقِبِه: على الطريـق الـتي جـاء منهـا/ بە ڕێگەکەی خۆیا گەڕایەوە.

وَطِيءَ عَقِبَهُ: مَشى في أثـره/ شـوێنی کـەوت. شوێن پێی هەڵگرت. دوای کەوت.

سـافر علـى عَقِب الـشهر: في آخـره/ لـە کۆتـایی مانگدا ڕۆیشت.

عُقُب. عُقب. عُقبى: عاقِبَة. آخِر. نِهايَة/ دوایی. کۆتایی. ئەنجام.

عُقبَة: عـائق/ کۆسپ. تەگەرە.

عَقَبَة: طريـق جَبَلـي/ ڕێگەی ناوشاخ. شاخاوی. بەرز و نزمی.

عُقبول: بقايا العِلَّة أو العَداوَة/ پاشماوەی نەخۆشی و ناخۆشی. کۆنەقین.

عُقبـول: مـرض جلـدي. مـايَخرُج علـى الـشَفَة بعـد الحُمّى/ تامیسك.

عَقَد. عَقَدَ: رَبَـطَ. أحكَم. ضَمَّ/ گرێی دا. بەستی. توندی کرد. قایمی کرد.

عَقَد: قَنطَرَ/ تاقی بەست. تاقی دروستکرد.

عَقَدَ. عَقَّدَ: خَثَّرَ. جَمَّدَ/ مەیانی.

عَقَد: إنعَقَدَ. جَمَدَ. تَخَثَّرَ/ مەیی. بەستی.

عَقَـدَ البَيـع أو العَهـد: أقَـرَّ/ کـڕین و فرۆشـتن و پەیمانی بەست. بڕیاری لەسەردا. سەلماندی.

عَقَـد جَلـسَةً أو إجتماعـاً: إجتمَـعَ/ کۆبـووەوە. کۆبوونەوەی پێکهێنا.

عَقَدَ زواجاً أو قِراناً: إقـترَنَ/ ژنـی مـارە کـرد. ژنـی هێنا.

عَقَـد (جَبهَتَـهُ. جَبينَـهُ. حاجبَيه. ناصِيَتَهُ): قَطَّبَ جَبينَـهُ/ ناوچـەوانی گرژ کـرد. مۆن بـوو. خـۆی مۆن کرد. ناوچەوانی دا بە یەکدا.

عَقَـدَ العَـزمَ أو النِيَّـةَ: عَـزَمَ. نَـوَى/ بڕیـاری دا. پەیمانی دا. بڕیاری مەبەستێك و کردنێکی دا.

عَقَدَ إتفاقاً: أبرَمَ/ ڕێکەوت. پەیمانی بەست.

عَقَدَت الزَهرَةُ: أصحبت ثمراً/ گوڵ هەڵی پێچا. بوو بە بەر.

عَقَدَ عُنُقَـهُ اليـه: لجـأ/ پـەنای بردەبەر. ملی بۆ درێژکرد.

عَقَدَ لِسانَهُ: إحتَبَسَ/ زمانی بەسترا. قسەی بۆ نەکرا.

عَقَّدَ الأمرَ: أربَكَ. صَعَّبَهُ/ کارەکەی ئاڵۆزان. گرانی کرد. شێوانی. ئاڵۆزانی.

عَقد: إتِّفاق/ ڕێکەوتن. پێکهاتن.

عَقد: سَنَد. حُجَّة/ سەنەد. بەڵگە. بەڵگەنامە.

عَقد: قَنطَرَة. قَوس/ تاق.

عَقدٌ من السنوات: عَشر سنوات/ دە ساڵ.

عَقـدٌ مـن الأعـداد: عَـشَراتها. عـشرة مـن الاعـداد دەژمارە.

عَقد: رَبط. إحكام/ پێکهاتن. بەستن.

عَقد: رَبط. إحكام/ پێکهاتن. بەستن.

عَقد: إتفاق مُدَوَّن. إبرام/ ڕێکەوتننامە.

عَقد إيجار: إتفاق مُدَوَّن/ ڕێکەوتننامەی کرێ.

عَقد الزواج أو القِران/ بەڵگەنامەی مارەکردن.

عِقـد: قِـلادَة/ ملوانکـە. ملیوانـە. گەردانـە. خەناوکە. خەناووك. تەزبیح.

عُقدَة: موضع العَقد من الحبل. أنشوطة/ گرێ.

عُقـدَة: مكـان كـثير الـشجر. الكـلأ/ بێشە. چڕە. سەوزایی.

عُقدَةٌ: وَحدَةٌ للسُرعَةِ/ (ميل بحري = ١٨٥٢ متر في الساعة)/ پێوانەی خێرایی لە دەریادا. میلی دەریا.

عُقدَةٌ: لُغز/ مەتەڵ.

عُقدَةٌ: مُشكِلَة/ کێشە. ئاڵۆزی.

عُقدَةُ الإستعلاء والتَفَوُّق: مُغالاةُ المَرءِ في الإيمان بتَفَوُّقِه/ هەستکردنی مرۆڤ بەوەی کە خۆی زۆر بە زل ئەزانێ.

عُقدَةٌ في خَشَب: عُجرَة/ گرێی دار.

عُقدَةُ الكترا: حُبُّ الإبنَةِ الزائد لوالدها/ خۆشەویستی کچ بۆ باوکی.

عُقدَةُ أوديب: عِشقُ الإبن لأُمِهِ والبنت لأبيها/ خۆشەویستی کوڕ بۆ دایکی و کچ بۆ باوکی.

عقدة نفسية: الشعور بالنقص/ هەست بە ناتەواوی کردن.

عَقَرَ: جَرَحَ/ بڕی. بریندرای کرد.

عَقَرَ: عَضَّ/ گازی گرت.

عَقَرَ: ذَبَحَ. نَحَرَ/ سەری بڕی.

عَقُرَ: كانَ عاقِراً/ نەزۆك بوو. نڕ بوو. بێبەر بوو.

عَقَرَ الأمرُ: لم يُنتِج عاقِبَةً/ بێ ئامانج بوو. هیوادار نییە.

عُقر: عَقَرَة. عُقرَة. عَقم/ نەزۆکی. وەجاخ کوێری. نڕی.

عُقر: عاقِر. عَقيم/ نەزۆك. نڕ. وەجاخ کوێر.

عُقرُ الدار: وَسَطُ الدار/ ناو خانوو. ناو ماڵ.

في عُقرِ داره: في أرضِهِ. في بَيتِهِ/ لە زەوی و ماڵەکەی خۆیدا.

عَقرَب: أَسمُ ساهِر. أم عِريط. دُوَيبَّةٌ سامَّةٌ/ دووپشك. گازین. دەمارەکۆڵ. چزەپیلە. کەلاشدوم.

عقرب الساعة: مؤشر الوقت في الساعة/ میل. میلی کاتژمێر.

عَقارِب: شَدائد/ تەنگوچەڵەمە. بەڵا. قۆرت. کارەسات.

عَقارِب: نَمائم/ بوختان بە دەمەوە هەڵبەستن. دووڕوویی. دووزمانی. خوسپ. قسەی پاشملە.

دَبَّت عقارِبُهُ. دَبَّت منه عقارب السعاية. إنَّه لَتَدُبُّ عَقارِبُهُ: يَقتَرِضُ أعراضَ الناس/ قسەی ناشیرین وتن و پاشملە دوان و بە دەمەوە هەڵبەستن بەم و بەو.

عَيشٌ ذو عقارِب: فيه شَرٌّ وخُشونَةٌ/ ژیانی سەخت و ناڕەحەتی و دیشوار.

عقارِب الشتاء: شِدَّةُ بردِه/ ڕۆژانی. سەخت و تووش و ساردی زستان.

عَقَرَة: عُقرَة. عُقر. عُقم/ نەزۆکی. وەجاخ کوێری. نڕی.

عَقَصَ الشَعرَ: ضَفَرَهُ/ قژی هۆنییەوە. پرچی هۆنییەوە. پرچی کرد.

عقص الشعر: ضفر/ قژهۆنینەوە. پرچ کردن.

عقصة. عَقيصة: ضَفيرة/ پرچ. قژی هۆنراوە.

عَقعَق: طائر على شكل غُراب. كَندش/ خومەڕێژە. خومەڕێژە. خومەڕێژە. قشقەرە. قشقەڵە. قژگە. قژک. قەلەباچکە. بۆرەپنە.

عَقَفَ. عَقَّفَ: عَوَّجَ. حَنَى/ خواری کردەوە. چەمانییەوە. لاری کردەوە.

عَقَلَ: فَهِمَ. أدرَكَ/ تێگەیشت. هۆشی هاتەوە. فامی کردەوە. گەورەبوو. ئاقڵ بوو.

عَقَلَ الدابَّةَ: رَبَطَ قوائِمَها. شَكَلَها/ پەل ولاخەکەی بەستەوە. پێوەندی کرد.

عَقَلَ القتيلَ: أدّى دِيَتَهُ/ خوێنی کوژراوەکەیدا.

عَقَلَ الدواءُ بَطنَهُ: أمسَكَهُ/ قەبزی کرد.

عَقَلَ: صَيَّرَهُ أو جَعَلَهُ عاقِلاً/ تێیگەیان. ئاقڵی کرد. ژیری کرد.

عقل: مَركَز او قُوة الإدراك/ ئەقڵ. بیر. هۆش. ئاوەز.

عَقل: إدراك. تمييز. فَهم. ذِهن. ذاكرة/ هەست. ژیری. تێگەیشتن. بیر. جیاکردنەوە.

عَقل: رَبط/ بەستن. پابەندکردن. پێوەندکردن.

عَقل: دِيَة القتيل. ثمَن الدم/ خوێنبایی. خوێن بژاردن. نرخی خوێن.

العقل الباطن: اللاواعي. اللاشعوري/ هەستکردنی نائیار.

العقـل الظـاهر: الـواعي. الـشعوري. يَقظـة/ هەستکردن. هەستیاری.

عَقلانـي: منطقـي. معقـول/ گونجـاو. بـەجێ. پەسەند. ماقوڵ. ڕێی تێ ئەچێ. ئەگونجێ.

عَقـمَ: طَهّـرَ. قتـل الجـراثيم/ پاكـژی كـردنەوە. میكروبی كوشت. برژاندیەوە. سووتانیەوە.

عُقم. عَقم. عَقم. عقمة: عقارة/ نەزۆكی. نەزی.

عُقُوبَة: عِقاب. جزاء/ سزا. تۆڵە

عَقُور: عَضَاض: يَعَض/ گازگر. گاز ئەگرێ.

عَقُوق: عاق. عَق. مُخالف. مُناقِض/ دژوار. چەتوون. نالەبار. یاخی. سەرپێچ.

عُقُـوق: ضِـدبِرّ. جُحـود الجَميـل. عـصيان. تَمـرُد/ نالـەباری. یـاخێتی. بەلەسـەیی. پێنـەزانین. سپڵەیی.

عَقـول: عاقـل. مُـدرك. حكيم/ ژیـر. زرنگ. دانا. تێگەیشتوو. كارامە. هەستیار. هوشیار.

عَقـول: دواء يَعقُـلُ الـبطن/ دەرمـانی سك چوون. قەبزكەر.

عِقي: مادة تخرج من المولود بُعيد ولادته. أول غـائط للمولود/ یەم پیسایی لە منداڵ دێتە دەرێ پاش لە دایكبوونی.

عِقيان: ذَهَبٌ خالص/ ئاڵتوونی تێزاب.

عَقيـد: رتبـة عـسكرية/ پلەیـەكی سـەربازی. سەرهەنگ. كۆڵۆنێل.

عَقيد: مُتعاقد. مُعاهد/ بەڵێن بەست.

عَقيد: مُنعَقد. مُتجَمد. مُتخثر. غليظ/ بزركاو. گرێ گرێ. خەستەوە بوو. تونگ.

عَقيـدة: إعتقـاد. مُعتقَـد/ بـاوەڕ. ئـایین. بیروڕای مرۆڤ.

عَقيرة: صَوت/ دەنگ.

عَقيصة: ضَفيرة/ پرچ. قژی هۆنراوە.

عَقيق. عِقة: شعر كل مولود/ قژی ساوا.

عَقيق: عِقة: شعر كل مولود/ قژی ساوا.

عَقيـق: حَجَـر شِـبهُ كـريم. خـرز احمَـر/ شـیلان. گەوهەری شەو چرا. ئەقیق. برگ. سلێمانی.

عَقيق: وادي ضَيّق/ چەم و جۆگەی تەسك.

عقيل. معقول/ عەقلانیە. ماقوڵە.

عَقيلة: زُوجَة. قرينَة/ ژن. هاوسەر. خێزان.

عَقيلة القوم: سَيّدهُم/ سەرگەورە. كوێخا.

عقـيم: عـاقر. لايَلـد/ نەزۆك. نـەزۆك. تـات. بەیچەڵ. ئەستێور. بێبەر. نەزێ. خرش.

عقيم: بلا جدوى/ بێكەڵك. بێسوود.

عَكَ اليومُ: إشتدَ حَرُهُ مع إحتبـاس الـريح/ گەرمای كرد. ڕۆژ زۆر گەرمە و سروەی با نییە.

عَـكَ. عَكَـة. عَكَـة. عكيـك. شـدة الحَـر/ قرچەی گەرما.

عَكانَب الدابَة: عُقدَة/ كلكی واڵخەكەی گرێدا.

عكارَة: عَكَر. كَدَر/ لیخنی. لێڵی.

عَكّـاز. عكّـازة: عـصا/ دار. داردەست. دارشەق. گاڵۆك. گاچوان. گۆچان. گۆپاڵ. جۆڵ.

عَكّـاش: عكاشـة: عنكبـوت. بيـت العنكبـوت/ جاڵجاڵۆكە. هێلانەی جاڵجاڵۆكە.

عَكِرَ: تَعَكّرَ. تَكَدّرَ. ضد صَفا/ لێڵ بوو. لیخن بوو.

عَكَرَ: كَدَّرَ. شَوَّشَ/ لێڵی كرد. لیخنی كرد. چەواشەی كرد. ئاژاوەی نایەوە. هەژانی.

عَكَر: كَدَر. ضد صفاء ورَواق/ لێڵی. لیخنی.

عَكَر: راسِب. ثُفل/ تلپە. خلتە. ملتە.

عكِر: كَدِر. مُشَوَّش/ لَێڵ. لیخن. چەواشە. شپرزە. شێلو. شێلی.

عَكَزَ على عكازتە: تَعَكَّزَ. إتَّكَأَ/ بەدار ئەروا. خۆی دا بە سەر دارەكەیدا. دارشەق بەكاردەهێنێ.

عَكَسَ: قَلَبَ/ هەڵیگێڕایەوە. ئاوەژووی كرد. ئەمدیو ئەودیوی كرد. پێچەوانەی كرد.

عَكَسَ الضوءَ او الصورةَ: إرتَدَّ/ دایەوە (ڕووناكی. تیشك. وێنە)ی دایەوە.

عكس: قَلب/ هەڵگێڕانەوە. ئاوەژووكردن. پێچەوانەكردن. پێچا.

عَكس: نقيض. ضِد/ دژ. پێچەوانە. بەرەواژ. بەرەڤاژ.

بالعَكس. على عَكس. بالضِد/ بە پێچەوانە. وانیە.

والعَكسُ بالعكس/ بە پێچەوانەی یەكتریەوە بە پێچەوانەوە.

عَكسي: ضِد. مُناقِض. مُخالف. غيرِ مُباشر/ پێچەوانەیی. ناڕاستەوخۆ. بەرەوادی. بەرەڤاژی.

عَكِشَ الشَعرُ: إلتوى وتَلَبَّدَ/ قژئاڵۆزكا. بڕژووەوە. چوو بە ناو یەكدا. تێكچوو. شانە نەكراو بوو.

عَكِش: معكوش. أشعَث/ لوول. ئاڵۆزكاو. بڕژ. شانەنەكراو.

عكِش: رَجُل لاخيرَ فيه/ پیاوی بێكەڵك. بێ خێر. هیچی لەدەست نایێتەوە.

عَكَفَ على: إنكَبَّ على. إنهمك في. كَرَّسَ/ خۆی بۆ تەرخان كرد. لەسەری ڕۆی. بەردەوام بوو لە سەری.

عَكَفَض علی: لَزِمَ. تَمَسَّكَ/ خووی پێوەگرت. دەستی لێهەڵناگری. وازی لێناهێنێ.

عَكَفَ عن: عكَفَ عن. مَنَعَ عن/ وازی لێهێنا. دەستی لێهەڵگرت.

عَكَفَ في: إعتكَفَ في. تَحَبَّسَ في المكان ولَبِثَ/ لە جێی خۆیا مایەوە. بە تەنها ژیا. گۆشەگیری كردن پەنای گرت.

عَكَفَ الشَعرَ: جَعَّدَهُ/ قژی لوول كرد.

عَكَمَ: جَمَعَ وَشَدَّ. صَرَّ/ كۆیكردەوە. پێچایەوە. بەستی. كورزەی كرد.

عِكم. عِكام: ماشُدَّ وَجُمِعَ/ بەستراو. پێچراو. كۆ. كورزەكراو. بوخچەكراو.

عَكَنَ البطنُ: تَثَنَّى لحمُهُ سِمناً/ سك لۆچی تێكەوت. چرچ بوو. دالكەوت.

عُكنَة: ما إنطوى وتَثَنَّى من لحم البَطن/ لۆچی سك. چرچ و لۆچی و دالكەوتوویی سك.

عَلَّ: شَرِبَ تِباعاً/ یەك بینە ئاوی خواردەوە. ئای بەسەریەوە.

عَلَهُ: عَلَّلَهُ. شَرَّبَهُ او سقاهُ تِباعاً/ یەك لەسەر یەك ئاوی دایە.

عَلَّ: لَعَلَّ. عَسَى/ خۆزگە. ڕەنگە. كاشكی. لەوانەیە.

عَلُ. مِن عَلُ. من عَلِ. من عَلا: من فَوق/ لەسەرەوە. لەبان.

عَلَّ: مَرِضَ/ نەخۆش كەوت.

عَلا: إرتَفَعَ/ بەرزبووەوە.

عَلا (الشيء او عنه او عليه): رَأسَ. تَرَأس. تَجَبَّر وتكَبَّرَ/ خۆی بەرز گرت. زۆر ستەمی نواند.

عَلا الدابَةَ: رَكِبَها/ سەركەوت. سواربوو.

عَلا المكانَ. عَلَى المكانَ: صَعِدَهُ/ سەركەوت. هەڵزنا. چووە سەرەوە.

عَلا به: جَعَلَهُ عالياً/ بەرزی كردەوە.

عَـلاءُ الـصَدَأ: غِطَـاءُ/ ژەنـگ لێـی دا. ژەنـگ دایپۆشی.

عَلـى. عَـلا. صَـعِدَ/ سـەرکەوت. هـەڵزنا. چـووە سەرەوە.

عَلَى: رَفَعَ/ بەرزی کردەوە. هەڵیبڕی.

عَلَى الـصَوتَ: رَفَعَـهُ/ دەنگـی بـەرزکردەوە. دەنگـی لێهەڵبڕی. زیادی کرد.

عَلَى المَتاعَ: نَزَلَهُ/ دایگرتز هێنایە خوارێ.

عَلَى: فَوقَ/ سەر. لەسەر.

عَلَـى: عَـلا: صَـعِدَ/ سـەرکەوت. هـەڵزنا. چـووە سەرەوە.

عَلـى: مَـعَ. (بَـذَلَ المـالَ علـى فَقرِه: مـع)/ (لەگـەڵ. سەرەڕای) هەژاریدا.

عَلَى: عَنْ. (رَضيَ عليه: عَنهُ)/ لێی قایل بوو.

عَلَى: في. (على حينِ غَفلَةٍ: في)/ لەپڕ.

عَلَـى. عَـلامَ. كَلِمَـةٌ مُرَكَّبَـةٌ مِـن علـى حـرف جَـرّ وماالاسـتفهامِيَّة: لأي سبب. لماذا (عَـلام تَـضربني: لماذا. لأي سبب)/ بۆچی. لەبەرچی. لەسەرچی.

بِناءً عَلَى: حَسَبَ. بِحَسَبِ. بِموجِبِ/ بە گوێرەی.

وعَليه: بِناءً عليه. فَعليه/ لەبەرئەوەی. کەواتە.

عَليه أن يفعَل كذا: يَجِبُ/ ئەبێ. پێویستە. ئەبێ بیکا. پێویستە بیکا.

عَلَى. عَلاء: رِفعَةٌ. سُمُوٌ/ پایەبەرزی. شکۆ. بڵندی.

عَلاةٌ: سَنْدان/ دەزگا. دەسگا.

علاج: دَواء/ دەرمان. چاککار.

عـلاج: مُعالَجَـةٌ. مُـداواةٌ/ چارەسـەر. چـارەکردن. دەرمتان.

عَـلاّف: بـائِعُ العَلَـفِ/ عـەلاف. (دانەوێڵـە. ئالیـك) فرۆش.

عَلاقَـة: صِـلَةُ القرابَـة. مـاتَعَلَّقَ بالانسان مِـن مـال وزوجـةٍ وولـد/ خزمایـەتی. خوێشایەتی. مـاڵ و منداڵ.

عَلاقَـةٌ: صَـداقَةٌ. إرتِبـاطٌ. حُـبٌ/ پەیوەنـدی. بەرژەوەندی. هاوڕێیەتی. خۆشەویستی. هاڵی.

عَلاقَةٌ: خُصومَةٌ/ ناڕێکی. ناکۆکی. ناحەزی.

عَلامَ؟: لِماذا. ما الداعي/ بۆچی؟

عَـلاّم: عـالِم. عَلـيم/ زانـا. زانیـار. تێگەیـشتوو. پسپۆڕ. زۆرزان.

عَلاّم الغُيوب/ نهێنزان. خوای گەورە.

عَلامَة: إشـارة. دليـل. رَمـز. سِمَةٌ. خـالٌ/ نیشان. نیشانە. دروشم. ئامار. هێماز شەقڵ. ئامراز.

عَلامة إستفهام/ نیشانەی پرسیار. پرسەك.

علامة تعجب/ ئامرازی سەرسامی. سەیرەك.

علامـة تجاريـة. شـعار أو رمـز تجـاري/ نیـشانەی بازرگانی.

علامة مدرسية: درجة الامتحان/ نمرە.

علامة فارِقَـة: صِفَةٌ مُتَمَيِـزَةٌ/ نیشانەیەکی زەق. جیاکار.

عَلاّمَة.. عالِم/ زانا. بلیمەت.

عَلاّن: فُلان/ فیسار.

عَلاني: الظاهر/ ئاشکرا. دیار.

عَلانِيَةً: عَلَناً. جَهراً/ بە ئاشکرایی.

علاوة: زيادة/ سەربار. سەڵاو. زیادی.

علاوةً على (ذلك)/ سەرەڕای. سەرباقی.

عَلَـبَ: عَبَّـأَ في عُلبَـةٍ/ خـستیە قوتـووەوە. دایکردەوە.

عُلبَة: إناء يُعَلَّبُ فيه إناء من جِلد. معدن أو خشب أو كرتـون.. الخ/ قوتـوو. دەفـر. تەنەکـە. پێـستە. کارتۆن.

علباء: عَصَبَةٌ في صَفحَة العُنُق/ کێبەرەی مل.

عَلَّة: ضَرَّةٌ/ هەوێ.

عَلَّة (الجمع عَلاّت). بنوعَلاّت. بنو أمهات شَتَّى/ برای باوکی. دایك جیایی.

عِلَّة: مَرَض. داء/ دەرد. نەخۆشی. زەدە.

عِلّة: سَبَب/ هۆ. هۆکار.

عِلّة: عَيب. خَلَل. شائبة. نقيصة/ ناتەواوی. زەدە. کەم و کووڕی. خەوش. شووورەیی.

حرف العِلّة (حروف العِلّة): حُرُوف لَيّنَة وهي (ألف. واو. ياء)/ پیتی لاواز. پیتی دەنگدار.

على عِلاّتِه: كما هو/ چۆنە هەروەها. وەك خۆی. بە چاك و خراپییەوە.

عِلج: كافِر/ گومڕا. بێ ئایین. کافر.

علجوم. ضفدع/ بۆق.

عَلَفَ. عَلّفَ: أعلف الدابّةَ. أطعَمَها/ (ئالیك. ئالف. ئاژو)ی دا بە ئاژەڵ.

عَلّفَ. عَلّفَ الدابّةَ: سَمّنَها/ دایبەست. قەڵەوی دەکا.

عَلَف: طعام الدّواب/ ئالیك. ئالف. ئاژو.

عَلِقَ بـ: تَعلّق بـ. تَشَبّثَ. تَمَسّك. إستمسك/ خۆی پیاهەڵواسی. پێوەی نوسا. گیرسایەوە.

عَلِقَ بـ: تَعَلّقَ. أحَبَّ/ خۆشی ویست. هۆگری بوو. بەدڵیا چوو.

عَلِقَ بالحِبالة: تَعَلّقَ. أوقع في فَخّ/ کەوتە داوەوە.

عَلِقَ الصّبيُّ: مَصّ أصابِعَهُ/ پەنجەکانی مژی.

عَلِقَت الأنثى: حَمَلَت/ سکی پڕ بوو. ئاوس بوو. تکەی گرت.

عَلّقَ الآمال على: تَأمّلَ/ خۆی هیوادار کرد. بە هیوا بوو.

عضلّق أهميّةً على: رَكّبَهُ ونَصَبَهُ/ دەرگای دامەزران. داینا. دەرگای کرد.

عَلّقَ جلسَةً: رَفَع الجَلسَة/ کۆبوونەوەی هەڵسان. خستیە کاتێکی تر.

عَلّقَ على: عَقّبَ/ دوابەدوای دووا. بەدوایا قسەی کرد. کۆڵیەوە.

عَلّقَ: دَلّى/ هەڵیواسی. شۆڕی کردەوە.

عَلَق. عَلَقَة: دود يَمتَصّ الدَّمَ/ زەرو. زالو. زاڵو.

عَلَق: دَم: جُلطَة دَمَوِيَة/ خوێن. کڵۆی وردی خوێنی مەییو.

عَلَق: عِلق: نَفيس. النّفيس من كل شيء/ بەنرخ. گران بەها.

عَلقَم: مُرّ. كل شيء مُرّ/ تال. تاڵکە. هەموو شتێکی تاڵ.

عَلقَم: حَنظَل. نبات/ گوژاڵك.

عَلَك: مَضغ. لاك/ جوی.

عَلك: مَضغ/ جوین.

عِلك. عِلكَة. مَضيغَة. كل ضَمغ يُعلَك/ بنێشتز جاچك. جاچکە. بەنوشت.

علك خام/ بنێشتەتاڵ. ژاژك.

عَلّلَ: بَرّرَ. فَسّرَ. بَيّنَ السّبَب/ ڕوونی کردەوە. هۆی دەرخست. پاساوی دایەوە. بیانوی بۆ هێنایەوە.

عَلّلَ النّفسَ بالآمال: تَمَنّى. تَطَلّعَ. تَأمّلَ/ خۆی هیوادار کرد. ئاواتی خواست. خۆزگەی کرد.

عَلّلهُ: عَلّهُ. شَرّبَهُ. سقاه تباعاً/ یەك بینەمز یەك لەسەر یەك ئاوی دایە.

عَلِمَ الشيءَ: عَلِمَ الأمرَ وبه: عَرَفَهُ. شَعَرَ بـه وأدرَكَـهُ/ فێر بوو. فێری بوو. زانی. پێی زانی. هەستی پێکرد. تێیگەیی.

عَلّمَ العِلمَ أو الصّنعَةَ: جَعَلَهُ يَعلَمُها. دَرّسَ/ فێری کرد. دەرسی دادا.

عَلّمَ: هَذّبَ/ پەروەردەی کرد. فێرە ڕەوشتی کرد. تەمێی کرد.

عَلّمَ: وَسَمَ. جَعَلَ لـه علامَـة/ نیشانەی کـرد. نیشانەی لێدا.

عَلَم: راية. لواء/ ئاڵا. بەیداخ.

عَلَـم: مَعلَـم. صُـوَة/ نیشانە. کەڵەکە بـەردی نیشانە. چەخەر.

عَلَم: عَلامَة. إشارَة. دليل. رَمز/ خال. نيشانه. دروشم. ئامار. هێماز شەقل.

عَلَم: سَيِّد/ سەرگەورە.

عَلَم: شخص بارز/ پیاوماقول. دەمڕاست.

إسم عَلَم/ دیارناو. ناوی دیار.

عيد العَلَم/ ڕۆژی ئاڵا. جەژنی ئاڵا.

عَلَم: شَقّ خِلقي في الشَفَة العليا/ قلیشی زگماکی له لێودا.

عِلم: مَعرِفَة. دِرايَة/ زانیاری. زانین. زانست. ئاگاداری. تێگەیشتن. ئاگالێبوون.

عِلم: ضِد جَهل/ خوێندەواری. فێربوون.

طالب علم: تِلميذ/ قوتابی. خوێنکار.

عن علم: عن دِرايَة ومعرِفَة/ زانیارانه.

والعلم عند الله/ خوا ئەزانێ.

ليكن في علمكم/ ئاگاتان لێبێ. بابزانن. پێتان ڕائەگەیەنم.

عِلماني: علمي. دنيوي. غير كهنوتي/ ئایدۆلۆژیای جیهانی.

عِلمانِيَّة: المَذهب الدنيوي/ عەلمانی. جیهانگەری.

عَلَمَة. عَلَمَة. عَلَم. شَقّ خِلقي في الشَفَة العُليا/ قلیشی زگماکی له لێودا.

عَلمَن: جَعَلَهُ عِلمانِياً/ خستیه سەر بیروباوەڕی عەلمانی.

عَلمَنَة: عِلمانِيَّة/ جیهانگەری.

عِلمي: ضِد عملي. مُختَص بِعِلم/ بیردۆزی. زانیاریانه. زانستی.

عَلَن: عَلَن. عَلَن: إعتَلَن. إستَعلَن. خِلاف خَفي/ ئاشکرابوو. زانرا. دەرکەوت.

عَلَن. عَلَناً: جهراً. ضِد خَفي/ دیار. ئاشکرا.

عَلَني. عَلَنِيَّة: جَهر/ به ئاشکرا.

عُلُوّ: سُمُوّ. إرتِفاع/ بەرزیی. بڵندی.

عِلّوس: تُخمَة. مَغص شديد مَصحوب بِالقَيء/ زۆرخواردن. ژانه سك به ڕشانەوەوە؟

عَلوفَة: حَيَوان مَعلوف/ ئاژەڵی دابەستراو. ئالیکدراو.

عَلوفَة: عَلَف. عليق/ ئالیك. ئالف. ئاژوو.

عَلوي: فَوقي. نَقيض سُفلي/ سەرەوە. لای سەرەوە. سەروو.

عَلي: عَلا. إرتَفَع/ بەرزبووەوە.

عَلي. عال/ لەسەر. بەرز.

العَلي: مِن الأسماء الحُسنى/ له ناوەکانی خواوەند.

عَلي: عُلوّ/ بەرزیی. بڵندی.

عِليّ القوم: عِلْيَةُ القَوم. طبقة الاشراف/ چینی (باڵا. سەرەوە). خواپێداوان. پیاوماقوڵان.

عَليا: سَماء/ ئاسمان.

عَلياء: عُلو. مرتفع. مكان عالٍ/ شوێنی بەرز. بڵند.

أهل العلياء: عَلِيَةُ القَوم/ خواپێداوان. ماقوڵان.

عَلِيَة القوم: عِلِيَة القوم: طبقة الاشراف/ چینی (باڵا. سەرەوە). خواپێداوان. پیاوماقوڵان.

عَليل: سَقيم. مَريض. مُعتَضَل/ نەخۆش. دەردەدار. زەحمەدار. لەش بە باز. بیمار.

عَليل: لطيف. مُعتَدِل/ فێنك. خۆش. دڵتەزێن.

عَليم. عالِم/ زانیار. زانا.

عَمّ: شَمَل. ساد. خَيَّم/ گرتیەوە. هەموو شوێن و شتێکی گرتەوە.

عَمّ: أخو الأب/ مام. برای باوك. ئاپ. ئام. مامۆ. هاپۆ.

عَمّ: أبو الزوج او الزوجَة/ خەزوور.

إبن العم. إبنة الزوجَة/ خەزوور.

إبن العم. إبنة العَمّ/ ئامۆزا. مامۆزا. کوڕه مام. کچه مام.

زوجة العم/ ئامۆژن. مامۆژن. ژنی مام.

عَمَّ. عَمَّا: عن ما/ بۆ. بۆچی. لەچی. لەبەرچی.

عَمَّن قریب. بَعدَ وقت. قَریباً/ بەم نزیکانە. پاش ماوەیەکی کەم.

عَم. القَمي: أعمی/ کوێر. بێچاو. نابینا.

عِم صباحاً: صَباحُ الخَیر/ بەیانیت باش.

عِم مساءً: مساءُ الخیر/ ئێوارەت باش.

عَمّی: صَیَّرَهُ أعمی/ کوێر. بێچاو. نابینا.

عِم صَباحاً: صَباحُ الخَیر/ بەیانیت باش.

عِمَ مساءً: مساءُ الخَیر/ ئێوارەت باش.

عَمّی: صَیَّرَهُ أعمی/ کوێری کرد.

عَمّی: ألغَزَ. تَکَلَّم بالألغاز/ بە پێچ و قەمتا قسەی ئەکرد.

عَمّی: مَوَّهَ. أخفی/ شاردیەوە. ئەوریلەخست.

عَمّـی: أعمَـی. أضَـلَّ/ فریـوی دا. دەسـتی بـڕی. خەڵەتانی. لە خشتەی برد. چاوبەستی کرد.

عَمَی: فِقدان أو ذهـاب البَصَر/ کوێریـەز نـەبینین. سۆمایی داهاتن. کوێرایی داهاتن.

عَمَـی: عَمایَـة. عَمِیَـة. ضَـلال/ نـەزانین. دواکەوتوویی. سەرلێشێواوی.

عَمَی لَوني. عَمَی الألوان/ ڕەنگ کوێری.

عَمَـی لَیلـي: یَبـصُر في النهـار ولا یَبـصُر في اللیـل/ شەوکوێری.

عَمَی نَهاري: خَفَش/ ڕۆژ کوێری.

عَماء: سَحاب کَثیف/ هەوری ڕەش. تاڵ.

عِماد: دِعامَة. سَنَد/ کۆڵەکە. پاڵپشت. پایە.

عِمـاد: معمودیَـة. تَنـصیر/ کـردن بـە گـاور. گاورکردن.

عِمادَة: مَنصَب العمید/ بەڕێوەبەرایەتی. ڕاگر.

عَمّار: حلیم. الوَقور في کلامه/ لەسەرخۆ. ئاغر.

عَمّار: مُؤمن. وَرِع. قَوي الإیمان/ ئایندار. ئیماندار.

عَمّار: بَنّاء/ بەنا.

عَمارَة: طائفة من السُفُن. أسطول/ کەلەکەشتی.

عَمارَة: الحَيّ العظیم/ گەڕەکی گەورە. ئاوەدانی.

عِمارَة: قَبیلَة/ هۆز.

عِمارَة: بِنایَة/ ساختمان. باڵەخانە. تەلار.

عَماص: رَمَص. رَشح أبیض في مجری الدَمع/ ڕیپۆق.

عَماقَة: عُمق. قَرار/ قووڵی. قووڵایی. بن. ناخ. تەختی بن.

عَمالَة. عِمالَة. عُمالَة: أجرة العامل/ کرێ. ڕۆژانە. مز.

عَمالَـة. عِمالـة. عُمالَـة: ضـد بَطالَـة. إشـتغال/ ئیشکردن. کرێکاری. شاگردی.

عَمالَة: عُمولة. سَمسَرة/ دەلاڵی.

عَمالَـة: خیانَـة. تَجَـسُّس/ نۆکـەری. خۆفرۆشـتن. سیخوڕی. زیزانە.

عِمامَـة: لبـاس الـرأس/ مێـزەر. سـەرپێچ. سەربەست.

عَمایَـة: جَهـل. حَماقَـة. غـيٌ/ نەخوێنـدەواری. نەفامین. دواکەوتوویی.

عَمَّة: أخت الأب/ پوور. پلە. تیتە. ئامە. پل. مەتە. مەتێ.

اِبن أو اِبنَة العَمَّة/ پوورزا. تیتکزا. تێزا.

عَمَدَ الأمرَ وإلی الأمر: تَعَمَّدَ. قَصَدَ فِعلَهُ/ بە ئەنقەس کردی. بەهەوەس کردی.

عَمَدَ (إلی. لـ): لَجَأ. بـادَرَ. باشَرَ/ پەنای بردەبەر. ناچار بوو.

عَمَدَ إلی: ذَهَبَ. تَوَجَّهَ/ بۆی چوو. چوو بۆ لای.

عَمَدَ: دَعَمَ. سَنَدَ/ ڕایگرت. ڕایوەستان. شتی دایە پاڵ. پشتگیری کرد.

عَمَدَ الولَـد: عَمَّدَ. نَصَّرَ/ کردی بە گاور. بانگی گاورێتی پیادا.

عَمَّـدَ: ثَبَّـتَ. أرسَـی/ ڕایگـرت. ڕاگـیری کـرد. وەستانی. شتی دایە پاڵ.

عَمد: تَعَمُّد. قَصد/ هەوەس. ئەنقەس. ئارەزوو.

عَمد: سَبقُ الإصرار. عَقد النيّة. سَبق التصميم/ بە هەوەس. بە قەستی. بە ئارەزوو. پێشەکی بڕیاردان.

عمد: دَعم. سَنَد/ پشتگیری. پاڵپشت. کۆڵەکە.

عَمداً: عَن عَمد. تَعَمُّداً. قَصداً/ بە هەوەس. بە دەستی ئەنقەس. بە ئارەزوو.

عُمدَة: عماد. دِعامَة. سَنَد/ کۆڵەکە. پاڵپشت.

عُمدَة البلد أو المدينة/ سەرۆکی شارەوانی.

عَمدي: مُتَعَمَّد. قَصدي/ بە هەوەس. بە دەستی ئەنقەست. بە ئارەزوو.

عَمَرَ الدارَ: بناها. عَمَّرَ/ خانووی دروستکرد.

عَمَرَ بالمكان: أقام/ لە جێگەکەدا نیشتەجێ بوو. تیا مایەوە.

عَمَرَ المنزلَ: سَكَنَهُ/ خانووەکەی ئاوەدان کردەوە. چووە ناوی.

عَمَرَ المنزل باهله: كان مسكوناً/ماڵەکە ئاوەدان بوو. خەڵکی تیابوو.

عَمَرَ. عَمَّرَ المكانَ: جَعَلَهُ وعامراً. آهِلاً/ ئاوەدانی کردەوە.

عَمَرَ رَبَّهُ: عَبَدَه/ خوا پەرست.

عَمَرَ: صام وصَلّى/ نوێژی کرد. ڕۆژووی گرت.

عَمَرَهُ الله. عَمَّرَهُ: أطال عُمُرَهُ/ خوا تەمەنی دایە. تەمەنی درێژکرد.

عَمَرَ. عَمُرَ. عَمِرَ: نما. إزدهَرَ/ بووژایەوە. گەش بووەوە. گەورە بوو.

عَمَرَ. عَمِرَ. عَمَّرَ: عاش طويلاً/ زۆر ژیا. تەمەنی درێژ بوو.

عَمَّرَ: أصلح/ چاکی کردەوە. دەسکاری کرد. دەستی پیاهێنا.

عَمَّرَ: ملأ/ پڕی کردەوە. دایگرتەوە.

عَمَّر: عَمرَة: منديل أو لباس الرأس/ مێزەر. سەرپێچ. سەربەست.

عَمر. عَمر: دِين. مُعتَقَد/ ئایین. باوەڕ.

عَمر. عُمر: سِنّ/ تەمەن.

عَمر. عُمر: حياة/ ژیان. تەمەن.

نِصف عُمر: مُستَعمل/ نیوتەمەن. کارکردوو. کۆنە.

طول العُمر. مَدَى العُمر/ درێژیی تەمەن.

عُمران: بُنيان/ ئاوەدانی.

عُمران: كثرة السكان/ خەڵکی زۆر. دانیشتوانی زۆر.

عُمران: تَمَدُّن. مَدَنِيَّة/ شارستانێتی.

العُمَران: ابو بكر وعُمَر/ ئەبوبەکرو عومەر (دوو خەلیفە).

عُمرَة (في الشريعة الاسلامية): الحَجّ الأصغر/ عەمرە. چوونە مەکە و زیارەت. عەمرە بەشێکە لە ئەرکانی حەج لە شەریعەتی ئیسلامدا.

عُمرَة: قَصد المكان العامِر/ ڕووکردنە ئاوەدانی.

عَمِشَت عَينُهُ: ضَعُفَ البَصَرُ مع سيلان الدَمع/ چاوی کز بوو و ئاوی ئەکرد. پڕووپووشاوی بوو.

عَمُقَ: بَعُدَ القَعر. كان عَميقاً/ قووڵ بوو.

عَمُقَ. عَمِقَ: بَعُدَ وطالَ/ درێژبووەوە. دوورکەوتەوە.

عَمَّقَ: اعمَقَ. غَوَّطَ. جَعَلَهُ عميقاً/ قووڵی کرد. دایخست.

عَمَّقَ في. تَعَمَّقَ في: بالَغَ وطَلَب اقصى الغايات/ چووە بنج و بناوانی. کنەوەی تیاکرد. درێژەی پێدا.

عُمق. عُمُق. عَمق: غَور/ قووڵی. قووڵایی. بن. ناخ. تەختی بن.

من أعماق قلبي: بإخلاص. قَلبياً/ لە ناخی دڵمەوە.

عَمِلَ: فَعَلَ. أدّى. صَنَعَ/ دروستی کرد. بەجێی هێنا.

عَمِلَ: إشتَغَلَ/ کاری کرد. ئیشی کرد.

عَمِلَ: سازَ. دارَ. إشْتَغَلَ/ کەوتە گەڕ. کەوتە ئیش. ئیشی کرد.

عَمِلَ (بـ. بِمُوجِب. بحسب): سارَ بموجبه/ کاری کرد بە گوێرەی. پەیڕەویی کرد.

عَمِلَ عَلَی البلاد: إشْتَغَل عاملاً علیه/ بوو بە سەرکردەی وڵات. بوو بە فەرمانڕەوا. فەرمانڕەوایی کرد.

عَمِلَ في: أثّرَ في/ کاری تێکرد.

عَمَّلَهُ علی البلد: جَعَلَهُ حاکماً/ کردی بە سەرگەورە. فەرمانڕەوایی پێ سپارد.

عَمَل: صُنْع/ دروستکردن. دەستکردی. کردەی.

عَمَل: شُغل. صَنعَة. مِهنَة. وظیفَة. فِعل/ کار. کردار. کردەوە. ڕەفتار. ئیش. فرمان.

عَمَل شعبي: عمل جَماعي/ هەرەوەز. کەلەکاری.

عَمَل يد: يَدَوي/ دەستکرد. ئیشی دەست.

إدارة عَمَل/ کار بەڕێوەبردن. سەرپەرشتی. سەرەوکاری.

بالعَمَل/ بە کردە. بە کردەوە.

بَدلَة عمل/ بەرگی ئیش. جلکار. جلی کار.

رَبّ العمل: صاحب العمل/ خاوەن ئیش.

رَجل عمل/ ئیشکەر. پیشەکار. بازرگان.

ساعات العمل/ کاتەکانی ئیش.

عملاً بـ: بموجب. بمقتضی/ بە گوێرەی.

عملاق: مارد. کبیر الحجم. ضخم. مُفرط الطول. جسیم/ کەتە. زەبەلاح. دریژ. دەهۆڵ. چەلاە. بلند. بەلان.

عملاق: جَبّار. مُتمَکّن/ بەتوانا. سەرکەوتوو.

عُملَة. عِملَة: نَقد. نُقود/ دراو. پارە. دراڵ. پەرە. پوڵ. نەختینە.

عُملَة معدنية: غیر وَرَقِیَة. مسکوك/ دراوی کانزا. ئاسن.

عُملَة زائفة: مَغشوشة/ دراوی قەڵب. ساختە.

عُملَة صَعبَة: نادرَة/ دراوی سەخت. دەگمەن. بەنرخ.

عُملَة وَرَقِيَة: غیر معدنية/ دراوی کاغەز.

عُملَة. عِملَة: أجرة العَمَل/ کرێ. مز.

عَمَلي: إجرائي. ممكن إجراؤه. سَهلَ الاستعمال/ ئاسانکار. بەکارهێنانی ئاسانە.

عَمَلياً: بالممارسة. فعلياً/ بە بەکارهێنان. چەندجارکردن و بەکارهێنان.

غیر عملي: صعب الاستعمال. مُتعَذِر عمله أو السیر بموجبه/ ئاسانکار نیە. بەکارهێنانی گرانە.

عَمَلِيَة: قیام بعمل ما. إجراء عمل/ کردن. کردار. کردارێك. کردەوەیەك. ئەنجامدانی کارێك.

عملية تجارية: صَفقَة/ کارێکی بازرگانی. کڕین و فرۆشتنێك.

عمليـة جراحِيَـة: إجراء عمل جراحي/ نەشتەرگەری. برین سازی.

عَمَّمَ: أطلَقَ. ضد خَصّصَ/ بەرەڵای کرد. گشتاندی. هەموانی گرتەوە.

عَمَّمَ: نَشَرَ. رَوّجَ/ بلاوی کردەوە. باوی پێدا. رایگەیان.

عَمَّمَ: ألبَسَ العمامَة/ مێزەری بەست.

عَمَّن. عَن مَن: حَولَ مَن. حَولَ/ دەربارە. کێ.

عَمَهَ. عَمِهَ: ضَلَّ. هامَ. تاهَ/ ون بوو. گومڕابوو. سەری لێ تێکچوو.

عَمود: قائمة. دعامة/ چلاە. دیرەگ. تیرگە. کۆڵەکە. دارتەل. ئەستوون.

عَمود من صَحيفَة/ ستوونێ لە ڕۆژنامەدا.

العمود الفقري (بربرە. موورەگە. تیرەگە)ی پشت. پروسك.

عَمودي: رأسي. قائم/ ستوونی. وەستاو. تان. قیت.

عَمودي: بشكل عمود/ كۆڵەكەیی. ئەستوونی.

عُمولَة: سَمسَرَة/ دەڵاڵی. كرێ. بەش.

عُمـوم: شـمول. إحاطـة/ گرتنـەوە. هـەمووان گرتنەوە.

عُموم: كل/ هەموو. هەمووان. گشت. پەیاپەی.

عُموماً. على العموم. بوجه العموم: بوَجه الإجمـال/ تێكڕا. تێكڕایی. بە گشتی. هەمووان.

عُمومَة: أقرباء الأب/ ماموان. خزمانی باوك.

عُمومي: عام. شامل/ گشتی.

عَمِيَ: ثَعمّى. فَقَد أو ذهب ابصَرَه/ چاوی كوێر بوو. سۆمایی داهات.

عَميَ عن الشيء: لم يَهتَد إليه/ لە ئاستیا كوێر بووبوو. نەی ئەبینی. بۆی نەئەدۆزرایەوە.

عَمِيَ عليه الأمرُ: إلتَبَس. أصبَح مُبهماً غامضاً/ سەری لێتێكچوو. لێی ون بوو. دەركی پێ نەئەكرد.

عَمِيَة: عُميَـة. عَمايَـة. جَهـل. حَماقَـة/ نەخوێندەواری. نەفامین. دواكەوتوویی.

رَجل عَميُ القلب: جاهل/ نەخوێندەوار. نەفام. دواكەوتوو. دڵكوێر.

عَمياء: إمرأة ذَهَب بَصَرُها/ ئافرەتی كوێر. نابینا.

عَميد: رئيس. سيد. (رئيس جماعة أو حزب.. الخ)/ سەرگەورە. سەرۆك. بەڕێوەبەر.

عَميد كلية: رئيس كُليَة/ ڕاگر.

عَميد: رُتبة عسكرية/ عەمید.

عَميد: دعامَة. عماد/ كۆڵەكە. پایە. پاڵپشت.

عَميد: المريض الذي لايستطيع الجلوس الا مُسنَداً/ ئەو نەخۆشەی بە ڕاگر دادەنیشێ.

عَميد: مُتيَّم. العاشق الولهان/ پەرۆش.

عَمير: مَعمور. آهل. مسكون/ ئاوەدان.

عَميرَة: مجموعة خلايا النحل. مَنحَلَة/ هەنگەڕاڵ. هەنگەڕاڵ.

عَميق: بَعيدُ القرار. ذو عُمق/ قووڵ.

عَميل: زُبـون/ كارئاشنا. بەمێن. هەمیشە كڕیار. ئاشنا.

عميل تجاري. وَكيل/ نوێنەر.

عميل سياسي (سرّ): مُخبِر. مُرتَـزِق. مـاجور. خـائن/ سیخوڕ. سووریاش. زیرەوان. بەكرێگیراو.

عَميم: شامل/ گشتی.

عَنْ: إلى/ بۆ.

عَنْ: ألفني. مهموم. مُغم/ پەست. خەمگین.

عَنْ: بدافع. بسبب/ بەهۆی.

عن: لأجل/ لە جیاتی. لەبری.

عَنْ: من خصوص. حول. بشأن/ دەربارەی.

عَـن إذنـكَ: مـن فَـضلك/ تكايـە. بـە یارمـەتی. ماوەبدە.

عَن قليل. بَعدَ قليل/ لە دوای. لە پاش. تۆزێك.

عن قريب: قريباً. عما قَريب/ بەم نزیكانە.

عَن يَساره: من يَساره/ لەلای چەپییەوە.

عَنَّ له الشيءَ: ظَهَرَ/ دەركەوت. بینی.

عَنَّ الفَرَسَ: حَبَسَهُ بالعنان/ ولاخەكەی پەت كرد. بە ڕەشمەكەی بەستیەوە.

عَنَّ فُلاناً: سَبَّه/ جوێنی پێداو قسەی پێوت.

عَنَّ من تَعَب: أنَّ/ لە هیلاكیا. نركانی. ناڵانی.

عَنَّ عن الشيء: أعرَضَ عَنه/ وازی لە شتەكە هێنا.

عنالـه: خَـضَعَ وذَلَّ/ سـەری شۆڕكرد. ملـی كـەچ كرد. خۆی دا بە دەستەوە.

عَنـا عَنـوَةً: أخـذ الـشيءَ قَهـراً/ بـە زۆر (بـردی. سەندی).

عَنا عَنوَةً: أخذ الشيءَ صُلحاً/ بە خوایشت (بردی. سەندی).

عَنا الشيءَ: أبداه أظهَرَهُ/ دەریخست. خستیەڕوو.

عَنا. عَنيَ: تَأسَّرَ. أصبَحَ أسيراً/ بە دیل گیرا.

عَنَاهُ الأمرَ: أهَمَّهُ/ لەلای گرنگ بوو. مەبەستی بوو. گرنگی پێدا.

هذا لايَعنِيكَ: لايَهُمُّكَ/ پەیوەندی نیە بە تۆوە. نیتە بەسەریەوە.

عَنى: تَعَنّى. قَصَدَ. أرادَ/ مەبەستی بوو. بۆی چوو. ویستی.

عَنى بِهِ: حَفِظَهُ/ پاراستی. ئاگاداری کرد. ئاگای لێبوو.

عَنى: أفادَ مَعنى. دَلَّ/ مانایەکی هەبوو. مەبەستێکی گەیان.

عَنّى: حَبَسَ/ بەندی کرد.

عَنّى: عَذَّبَ. أثقَلَ/ سزای دا. باری گران کرد.

عَناء: تَعَب. كَدّ/ هیلاکی. ماندووبوون. شەکەتی. ڕەنج. ڕەنجدان. کۆشش. کوێرەوەری.

عَنّاب: بائِع العِنَب/ تریّ فرۆش.

عِناج: وَجَع الصُلب. ألم الظَهر/ کۆلنج.

عِناد: مُعانَدَة. مُعارَضَة. عُصيان/ ڕک گرتن. ڕق گرتن. خودسەری. سەرکێشی. یاخیبوون. یاخێتی. بەلاسەبوون. بەرهەلستی.

عَناق: الداهِيَة. الشِدّة والخَيبَة/ دەرد و بەڵا. نەهامەتی.

عَناق: أنثى أولاد المَعز/ كار. كاریلە. كارژۆڵە. كارەمەز.

عِناق: مُعانَقَة. حِضن/ دەست لە مل کردن. باوەش بە یەکتریدا کردن.

عَنان: سَحاب/ هەور.

عَنانُ السماء: ما إرتَفَعَ منها/ ئاسمان. فەلەکەی ئاسمان.

عِنان: سَير اللِجام: قایشی لغاو. دەسگیر. هەوسار.

أرخِ من العِنان: رَفِّه/ جلەو شلکە.

أطلَقَ العِنانَ: أرخاه/ جلەوی شل کرد.

إمتَلأ عِنانُهُ: بَلَغَ المَجهود/ گەیشتە ئەوپەڕی توانا و کۆشش.

جَرى الفَرَسُ عِناناً: جرى شَوطاً/ یەک تاو غاری دا.

ذَلّ عِنانُهُ: إنقادَ/ برا بەرێوە. سەری شۆڕکرد.

رَجُلٌ أبِيّ العِنان: إذا كان مُمتَنِعاً/ لاسار و بەلەسە و قیرسچمە بوو. نێ وەستا.

رَجُلٌ طَويل العِنان: قَليل الخَير/ بێ خێر. بێکەڵک. هیچ لەدەست نەهاتوو.

هما يَجريان في عِنان: إذا إستَوَيا/ هاوبوون. وەک یەک بوون لە چاکەو شتی تردا.

عِنايَة: إعتِناء. إهتِمام. رِعايَة/ گرنگی پێدان. بە تەنگەوەهاتن. ئاگاداری کردن.

عِنايَة: إحتِياط. حِيطَة. حِفظ/ ئاگاداری کردن. پاراستن.

عَنَّبَ الكَرمُ: صار ذا عِنَب/ مێوەکە ترێی گرت.

عِنَب: ثَمَر الكَرم/ تری. ئەنگوور.

عِنَب الثَعلَب: نَبات عُشبي/ ڕەزلە.

عِنَب (الذُبّ. الحَيّة. الذِئب): نَباتات/ ناوی چەند ڕووەکێکن.

للعنب أنواع وأصناف عديدة تختلف بحسب اللون والطعم والحجم وبحسب مناطق الزراعة وموسم النُضج: أدناه أنواع العنب في مناطق كردستان/ بۆلبزمارە. بۆلمازو. پاشایی. پایزە. تایەفی. تەوریزی. دڵەکەڵەشێر. دۆشاوی. دۆمیلە. دەریۆڵە. چاوکوتکە. چەمیلە. خۆشناو. خەلیلی. ڕەزاقی. ڕەشمیری. ڕەشکۆیی. ڕەشکە. ڕەشە ڕێحانی. ڕیش بابا. زراقی. زەرەس. زەرەکە. زەردی. زەلکە. سادلنی. سادلنی ڕەش. سالحی. سپیکە. ستەیی. سووراو. سوور سنەیی. سوورە شامی. سەرقولە. شاخ سپی. شیرازی. عەسکەری. فەرخی. کاژاو. کشمیش.

كلكـەڕێوی. گوتتولـە. گوتكـە. لەقلـەقی. مامبایمی. مایەمێو. میانی. نینۆکی خانم.

عَنبَر: طیب معروف. رائحَة/ بۆن. بۆنێكی خۆش. بۆن عەنبەر.

عَنبَـر: مخـزن الغلـة/ عـەماری دانەوێڵـە. چاڵە خەلە. كەندو. كەندو.

عَنبَر: مخزن. مستودع/ عەمار. گەنجینە. كۆگا. شوێن لەناو پاپۆر و فڕۆكەدا.

عَنبَر: حُوت الَمَنّ. حوت عظیم/ نەهەنگ. جۆرێكی زۆر گەورەیە لە نەهەنگ.

عَنبَـر الـشتاء. عَنبَـرَةُ الـشتاء: شـدتُه/ سـەرماو سۆڵەی چلەی زستان.

نَفطَةُ عَنبر: شَبه بالعَنبَر/ بۆن خۆشكراو.

عَنبَري: شراب مُسكر/ مەیی مەستكەر.

عَنـتَ: لَقيَ الـشدَّة. وَقَـعَ فیـب أمـر شـاق/ تووشـی تەنگانە بوو. كەوتە گێژاوەوە.

عَنتَ: أثقَلَ عَلى/ زۆری لێكرد. تەنگی پێهەڵچنی. باری گران كرد.

عَنَت: ضیق. شدَّة. عَـذاب/ تەنگانـە. نـەبوونی. تەنگ و چەڵەمە. نەداریی.

عَنَـت: إكـراه/ زۆرداریێتـی. زۆرلێكـردن. بـە زۆر پێكردن. تەنگاوكردن.

عُنَّة: وَهن. عَجز. عجز جِنس/ پەككەوتن.

عَنجهِیَّة: غَطرَسَة. تَكبُّر/ لووت بەرزی. تەوفیز. خۆ بە زل زانین.

عَنَـدَ. عَنَـدَ. عَنـدَ عـن الطریـق أو القـصد: مـال. إنحرف/ لە ڕێ لایدا. لە مەبەست لایدا.

عَنَدَ. عَنَدَ. عَنَـدَ: كـان عنیـداً (لاسـار. سـەھەندە. چـەموش. بـێ گـوێ. چەقاوەسـو. سـەركێش. كەللەڕەق) بوو.

عَنَدَ العرقُ: سالَ منه الدم فَلَم ینقطِع/ خوێنی (بەر بوو. نەوەستایەوە).

عندَ (اسم لمكان الحضور): حین. لدی. اثناء. سافرت عند مَغیب الشمس: أثناء المغیب/ لە كاتی.

عنـدَ الحاجـة. عنـد الإقتـضاء. حـین الـضرورة/ لـە كاتی پێویستدا.

عندي: لَدَيّ. أملك/ هەمە.

عندي: في رَأيِ/ بەلای منەوە. ڕام وایە.

عندَئذ: حینئذ/ ئەوسا. لەوكاتەدا. ئەودەمەی.

من عند: من طرف/ لەلایەن.

عندك: قِف/ بوەستە. ڕاوەستە.

عند لیب: طائر. بُلبل/ بلبل. شالور. شالۆر.

عندما: لَمّا. حینما لـە كـاتی. لە كاتێكدا. كەی. هەر كاتێ.

عَنز: عَنزَة. حیوان. أنثى المعز/ بزنەمێ. تشتێ.

عَنـزَة: عُكّـازة ذات حَدیـدَة/ دار. داردەسـت. داردەستی (سەر بە ئاسن. نووكدار).

عَنَس. عَنِسَ. عَنُس. عُنّس (ت الفتـاة): طـال مَكثُها ولم تتـزوّج/ كـچ (گـەورە بـوو. مایـەوە) شـووی نەكرد.

عَنَس الرَجُل: أسـنَّ لـوم یتـزوّج/ پیـاو پیر بوو. هێشتا ژنی نەهێنابوو.

عُنصُر: أصل/ ڕیشە. بناخە. بنـەڕەت. بنـچینە. بنەڕەس. ڕەگ.

عُنصُر: عرق. جنس/ توخم. ڕەگەز. جۆر.

عُنصُر: مـادَّة. جَـوهر. عامـل/ تـوخم. بەشێك لـە پێكهێنەرانی شتێك.

عُنـصُري: عرقـي/ ڕەگـەزین. ڕەگەزپەرسـت. ڕەگەزخواز.

عُنصُري: مادّي/ توخمین.

عُنـصُرِیَة: عرقیـة. مـذهب المُتعَـصبین/ ڕەگەزگەریچێتی. ڕەگەزخوازی.

عُنصُل: بَصَل بَرّي. نبات من الأبصال/ پیازی كێوی.

عَنُفَ علی. عَنُفَ. قسا علی. عامَلَ بِشدّة ولم یرفُق/ ڕەق بوو. بە ڕەقی ڕەفتاری ئەکرد. توندوتیژ بوو.

عَنَّفَ: لام بِشدّة؛ عَتَّبَ/ سەرزەنشتی کرد. گلەی کرد. پیاهەڵشاخا.

عُنف. عَنف. عِنف: شِدّة. قُوّة. صَرامَة/ توندی. توندوتیژی. زەبر. زەبروزەنگ. تۆپزی.

لاعُنف: لاشدّة/ هێمنی. نیانی.

عُنفوان: عُنفُوان الشباب: مُقتَبَل. شرخ. ربیع الحیاة. ریعان. أول الشباب/ (هەرەت. تاف)ی لاوی. سێرەی گەنجێتی.

عُنُق. عُنق. رَقَبة. جید/ مل. گەردن. سکور. سکورد. ئەستۆ.

عنقاء: طائر خرافي. مجهول الجسم/ سیمرغ. شامەل.

عُنقود: عِذق/ هێشوو.

عُنقودي: علی شکل عُنقود/ هێشوویی.

عَنکَبوت: دُوَیبة/ جاڵجاڵۆکە. پەسپەسکەرە. بە سپە سکوڵە. داپیرۆشکە. داپیرۆکە. کاترتینک. جاتەنە.

بیت العنکبوت. نسیج العنکبوت/ هێلانە. کەرتێنە. تۆڕی جاڵجاڵۆکە.

عَنَم. عَنَمَة: مِحلاق. خیوط یتَعَلَق بها الکَرم/ تەرز. ڕیشاڵی مێو.

عُنوان (شخص. مکان. رسالة): أدرس/ ناونیشان.

عُنوان مَقالة: رأسها. رَأسِیّة/ سەروتار. سەمناو. سەرباس.

عَنوَةً: إکراه. عُنف. قَسراً/ زۆر. زەبر. ستەم. زۆرداری. تۆپزی.

عَنوَنَ: کَتَب أو زَوَّد بعنوان/ ناونیشانی (نوسی. بۆدانا). ناوی نا.

عَنِيَ: تَعَنَّى بـ: إهتَمَّ بـ/ گرنگی پێدا. بایەخی پێدا.

عَنید: مُعاند. مُتَصَلِّب. شدید. قاس. عاص/ یاخی. بەلاسە. کەللەڕەق. چەپخون. چەقاوەسو. چەمور. چەتاوەرو. ڕقاوی. سەرکێش. قیرسچمە. لاسار.

عَنیف: شدید. قاس/ ڕەق. توند. توندوتیژ. بەزەبر. چەپگەر. شێگیر. سەخت. ڕەشکۆژ.

عِنّین: عاجز جنیساً أو تناسلیاً/ پەککەوتوو. لە پیاوەتی کەوتوو. سست لە سەکسدا.

عَهارة: عَهر. عِهد. زِنَی. فُجور. بیع العرض. فسق/ خراپەکردن. داوێن پیسی. خۆفرۆشتن. سۆزانێتی. جندەیی.

عَهِدَ الشيء: تَعَهَّدَ. رَعَی/ چاودێری کرد. ئاگاداری کرد. چاوی لێوە بوو.

عَهِدَ الأمرَ: عَرَفَ/ زانی. پێی زانی.

عَهِدَ إلیه بکذا: أوصی بـ. فَوَّضَ/ ڕاسپارد. پێی سپارد. پێی ڕاگەیان.

عَهِدَ الوَعدَ: وَفَی/ بە پەیمان بوو. پەیمان ڕاست بوو.

عَهد: أمرٌ عالٍ. أمر الوالي/ فەرمان. فەرمانی والی.

عَهد: حُکم. مُدّة الحُکم. ولایة/ فەرمانڕەوایی.

عَهد: أمان/ دڵنیایی.

عَهد: عَصر. دَور. زمان/ دەم. سەردەم. کاتت. چەرخ.

عَهد: مَوَدّة. وِدّ/ خۆشەویستی.

عَهد: مَعرفَة/ زانیاری. ناسیاری.

عَهد: وفاء/ پەیمان هێنانەدی. دڵسۆزی.

عَهد: وَعد. اِلتزام. ضَمان/ پەیمان. بەڵێن. گفت.

عَهد: میثاق/ پەیمان. ڕێکەوتن. بەڵێننامە.

عَهد: یمین. قَسَم/ سوێند.

العَهد القديم: المكتوب قبل المسيح/ نوسراوەکانی پێش عیسا. پێش زایین.
العَهد الجديد: المكتوب بعد المسيح/ نوسراوەکانی پاش عیسا. پاش زایین.
منذ عَهد بَعيد: قديماً/ لە کۆنەوە.
منذ عَهد جديد: قريب. حديثاً/ لەم نزیکانەدا. لەم دواییەدا.
ثابِتُ العَهد: صادِق. لايَتَغَيَّر/ خاوەن باوەڕ. بەڵێن ڕاست. بە گفت.
عَهدي به أنه كذا: ما أعرِفُه عنه أنه كذا/ ئەوەی من ئەیزانم وایە.
متى عَهدُك به: زُؤيَتُك/ کەی ئەیبینی.
عُهدَة: مَسئولية/ بەرپرسیاری.
عُهدَة: ضمان وكفالة/ زامنی. دڵنیایی.
عُهدَة: رعايَة. وِصايَة/ چاودێری. ئاگاداری. سەرپەرشتیاری.
عُهدَة: ضَعف/ لاوازی. زەبوونی.
عُهدَة: ضَعف في الخَط/ لاوازی لە نوسیندا. خەتی ناخۆش.
في عُهدَتِهِ: في عاتِقِهِ/ لە ئەستۆیدایە. بەرپرسیارە.
عَهَرَ. عَهِرَ اليها: عاهَرَها. زَنابها/ ئیشی ناڕەوای لەگەڵ کرد. گای.
عَهر.. عاهر/ لەشفرۆش.
عَهر. عِهر: عَهارَة. زِنى. فُجور. بيع العرض. فِسق/ خراپەکردن. داوێن پیسی. خۆفرۆشتن. سۆزانێتی. جندەیی.
عَهَنَ بالمكان: أقام/ نیشتەجێ بوو. جێگیربوو.
عَهَنَ من المكان: خَرَجَ/ گواستیەوە. ڕۆی. کۆچی کرد.
عَهَنَ الشيءُ: دام وثَبت/ مایەوە. جێگیر بوو. دایکوتا.
عَهَنَ. عَهِنَ. جَدَّ. عَجَلَ/ خێرایی کرد. پەلەی کرد. گورج و گۆڵ بوو.
عِهن: صوف. صوف. مَصبوغ/ خوری. خوری ڕەنگکراو.
عَهيد: حليف/ هاوڕێ. هاوپەیمان.
عَوى (الكلبُ. الذئبُ. غبن آوي): لَوى مُقدمَ فمه ثمَّ صَوَّتَ/ وەڕی. لووراندی. قووسکاندی. حەپاندی.
عَوَّاء: كثير العُواء. يَعوي كثيراً/ زۆر وەڕ. ئەوەڕێ. ئەلوورێنێ. ئەحەپێ.
عُواء: صوت الكلب. الذئب.. الخ/ وەڕە. وەڕین. لوورەلوور. حەپەحەپ. قووسکە.
عوائد (مفردها عائدة): ربع. مدخولات. نَفع/ سوود. کەڵک. دەستکەوت. قازانج. بەروبووم.
عَوَّاد: عازِف العود. الضارب بالعود/ عوودژەن.
عَوار: عُوار. عيب. عِلَّة. شائِبَة/ ناتەواوی. سووکی. ئەنگی. شوورەیی. خەوش.
عُوَار: قَذى/ ڕیپۆق.
عُوَّار: طائر. خُطّاف/ پەرەسێلکە.
عَواشِب: آكلات العُشب/ گیاخۆر. گیاخۆرەکان.
عَوام: العامَّة. عامة الناس. عامة الشعب. الدهماء/ بەشی زۆری گەل. زۆربەی خەڵک. ڕەش و ڕووت.
عَوَّام: سَبّاح/ مەلەوان.
عَوَّامَة: طافية لإرشاد السُفُن/ دەریانیشان.
عَوَّامَة: طَوف. رَمَث. بيت عائم/ کەڵەک. کەڵەکی سەرئاو. ماڵکەشتی.
عَوان: في منتصف السن. متوسط السن/ تەمەن مامناوەندی.
عَواهِن: أغصان أو جرائد النخل اليابِسَة/ گەڵا (سەعف) وشکەی دارخورما.

ألقى أو رَمَى الكلامُ على عواهِنِه: تكلم إعتباطاً ولم يُبال في كلامه/ بێسەرو پێ قسەی ئەکرد. ئەیدا بەسەریەکدا. کوێرانە قسەی ئەکرد.

عَـوِجَ: إعـوَجَّ. تَعَـوَّجَ. إنحَنَـى/ خواربـووەوە. چەمایەوە. نوشتایەوە.

عَوِجَ الإنسان: ساء خُلُقُهُ/ ڕەوشت و خووی خراپ بوو. لە ڕێی ڕاست ریدا.

عَـوَّج: حَنَـى. لَـوَى/ خواریکردەوە. چەمانیەوە. لاری کردەوە. نوشتانیەوە.

عـِوَج: إعوجـاج. إلتواء وعـدم إستقامَة/ خواری. خۆهرت. چەوت و چێلّی. لاری. پێچ و چەنا.

عَوَّدَ على: مَرَّنَ. جَعَلَهُ يَعتادُه/ ڕایهێنا. ڕامی کرد. فێری کرد.

عَود.. عَودَة/ گەڕانەوە.

عُود: عَصا. قَضيب. خَشَب/ دار. چیلکە. تەختە. شوڵك.

عُود: مزهَر. آلة موسيقية. آلة طرب/ عود.

عُود: بِنيَة: تركيب/ لەش. تەن. جەستە. قاڵب. بەدەن. بەندەن. چەنلەن.

عـود أسنان. خَلالَـة. سلاّكة أسنان/ چیکەڵ دان ئاژنە. خەلیلە.

عود الثقاب عود الكبريت/ دەنکە شخارتە. دەنکە شقارتە.

عُـود: خَـشَب عَطـر/ عـود. چیلکەی بۆنخۆش لە سووتانا.

عَــودَة: رُجــوع. رَجعَــة/ گەڕانــەوە. کــشانەوە. هاتنەدواوە. ڕۆیشتنەوە. پێچدانەوە.

عَــودَة الى: إســتئناف. مُواصَــلَة. مُتابَعَــة/ تێهەڵچوونەوە. دەستپێکردنەوە.

عَـودَة عــن: سَحب. إلغـاء/ پەشـیمان بوونـەوە. پاشگەزبوونەوە. کشانەوە.

عَودَة عن: إحجام. عُدُول. إمتناع/ دەستلێهەڵگرتن. وازلێهێنان.

عَودَة على: مُطالَبَة/ داواکردنەوە.

عَوَّذَ: دَعا له بالحفظ/ داوای پاراستنی بۆ کرد.

عَوذ: مَعاذ. مَلجا/ پەنابردنەبەر.

عَــوَذ: رُذّال النـــاس/ هەرچــیو پەرچــی،، گەجەروگوجەر.

عُـوذَة: تَعويــذَة. رُقيَــة. حِجــاب/ نوشـتە. دۆعـا. چاوەزار. جادوو. نشتوو. نڵرشت.

عَوِرَ: إعوَرَّ. صار أعـوَر/ کوێر بوو. چاوێکی کوێر بوو.

عَـوَّرَ: أعـوَرَ. صَيَّرَهُ أعـوَر/ کوێری کرد. چاوێکی کوێر کرد.

عَوَّرَ عليـه أمرَهُ: قَبَّحَـهُ/ کارەکـەی لـێ تێکدا. لـێ پیس کرد.

عَوَّرَ.. عايَر المِكيـال/ تەرازوویاز. دزی لە پێوانەو کێشانەدا.

عَوَر: حالة الأعور. فقـدان عـين واحِـدة/ نەبینایی یەك چاو. کوێری چاوێك.

عَورَة: سَوءَة. الاعـضاء الـتي يَستُرُها الإنـسان أنَفَةً وحياءً/ ئەندامانی شەرم. گەلوگون.

عَـورَة: كـل أمـرٍ يُـستَحيا منـه/ هـەموو کارێك کـە شەرمی لێ بکرێ.

عَـوِزَ: إعـوَزَّ. إفتَقَـرَ/ هەژارکـەوت. دارایـی نـەما. دەستی کورت بوو.

عَـوَز: فَقـر. عُـدم. الحاجَـة والـضيق/ نـەبوونی. هەژاری. دەستکورتی. نەدارایی.

عَـوِز: عــائز. مُعــوِز. مُحتــاج. فقــير/ هــەژار. کەمدەست. دەستکورت. نەدارا.

عَوسَج: نبات شائك/ تووترك.

عَوِصَ: كلن عويصاً. غامضاً مُبهَمـاً/ (نادیـار. نهێن. شاراوە. ئاڵۆز. پەنهان. سەخت) بوو.

عوَضَ: عاضَ. أعاضَ. أعطى تعويضاً/ بژاردی. بۆی بژارد. دای لە بریتیدا. خەرامانی دا.

عوض: بَدَل. تعويض. مُقابِل/ بژاردن. جیاتی. بری خستن. بریدان. قەرەبووکردن.

عوَضاً عن أو من: بدلاً من/ لە باتی. لە جیاتی. لە بریتی. لەبری.

لایُعَوَّض: لایأتي مكانُه/ نایەتەوە جێی. نابژێرێ. لەبری. لەبری نیە.

عَوَقَ: أعاقَ. عاقَ. عرقَلَ. مَنَعَ/ تەگەرەی تێخست. دوایخست. کۆسپی خستەبەر. رێی لێگرت.

عَـوق: إعاقـة: تـأخير. عرقلـة. مَنـع/ تەگەرەتێخستن. دواخستن. کۆسپ نانەبەر.

عَـوَّلَ علـى: إعتمَـدَ. إتّكـلَ/ پـشتی پێبەست. متمانەی پێکرد.

عَـوَّل علـى: عَـزَمَ. صَمَّمَ. عَقَدَ النيَّة/ بڕیاری دا. نیەتی کرد. ئەبێ بیکاز

عَـوَّلَ: نَحَبَ. نـاحَ. أعـوَل. رَفَعَ صوتَهُ بالبكـاء والصياح/ گریـا. دایـە پرمـەی گریـان. هـاواری لێهەستا.

عَـول: مايُعيـل. قُـوت. كفايـة المعـاش/ بـژێوی. پێداویستی ژیان. ئازووخە.

عَول: عَويل. نحيب. نـواح/ گریـان. قیـژە. هـاوار. لاواندنەوە.

عـول: تعويـل: إعتمـاد. إتّكـال/ پـشتپێبەستن. متمانەپێکردن.

عوَمَ: جَعَلَهُ يَعوم أو يَطوف/ سەرئاوی خست.

عَوم: طَفو/ سەرئاوکەوتن.

عَوم: سِباحَة/ مەلە. مەلەکردن.

عَوَنَ: أعان. عـاوَنَ. ساعَدَ/ یارمەتیدا. پشتگیری کـرد. فریـای کـەوت. دەسـتی یارمـەتی بـۆ درێژکرد.

عَون: إعانَة. نَجدَة/ فریاکەوتن.

عَـون: مُعـاوِن. مُـساعِد/ یـاوەر. یارمەتیـدەر. دەسگیر. هاریکار. فریاڕەس.

عَويص: مُبهَم. صَعب. مُعقَّد/ ئاڵۆز. نادیار. قورس. گران. سەخت.

عَويص من الأمور: الصعب/ کاری گران و سەخت و ئاڵۆزاوی.

عـويص مـن الكـلام: مايَـصعُب فهمُـه/ قسەی ڕەق. نادیار. تێگەیشتنی نائاسانە.

عويص من الدواهي: الشديدة/ دەردوبەڵای قورس. سەخت.

عَويل: عَـول. نحيب. نـواح/ گریـان. قیـژە. هـاوار. لاواندنەوە.

عَيَّ: عَييَ. عَجَزَ. جَهِلَ/ نەیتوانی. پێی نەکرا. بۆی نەکرا. سەری لێدەرنەکرد.

عَيّ: عاجز في نُطقه/ قسەناکا. قسەی بۆ ناکرێ. زمانی ئەگیرێ.

عَـيّ. عَـيّ. عيـاء: إعيـاء. تَعَـب. عجـز/ هیلاکـی. شەکەتی. ماندوویەتی. نەتوانتین. پەککەوتن.

عَياء. داءٌ عَياء: لايُبرَأ/ دەردی بێدەرمان.

عَيّاب: عَيّابَة: كثير العيب للناس. مولَع بالإنتقاد/ ڕەخنەگر. گاڵتەچی. ئابڕووبەر. خراپەکار.

عَيّـاث: عائـث. عَيُـوث. فاسـد. مُـدَمِّر. مُخَـرِّب/ وێرانکەر. زیانگەیێن. بێنابڕوو.

عِياد: تكرار/ دووبارەکردنەوە. وتنەوە.

عِيادَة: زيارَة/ سەردان. دیدەنی.

عِيادَة الطبيب. عِيـادة طِبيّـة/ دیدەنگەی پزیشك. کلینیك.

عِياذ: عَوذ. إعتصام. إلتجاء/ پەنابردنەبەر.

عِياذ: مَعاذ. مَلجَأ/ پەنا. پەناگە. مەڵاسگە.

العيـاذ بـالله: أعـوذ بـالله. ألتجـيء وأعتـصم/ پەنابەخوا. خۆم ئەخەمە پەنای خواوە.

عَيّـار: طَـوّاف. مُتَسكع. مُتَشرد/ گەڕۆک؟. بـەرەڵا. بەلەسە. بێ ئیش. خوێڕی. سوێتەڵی.

عيار: مقياس/ پێوانە. ئەندازە. سەنگ.

عيار ناري: إطلاقة/ گوللە. فیشەک.

عَيّاش: بائع العَيش/ نانفرۆش.

عيـاط: صياح. جَلَبة/ قیژە. قیژاندن. نەڕاندن. قاووقیژ. هاوارکردن. هەراهەرا.

عياط: بُكاء/ گریان.

عياف: عائف. عَيفان. مُشمئز من. كـاره لـ/ بێزار. بە دڵی نیە. قێزی لێدێتەوە.

عَيّال: مُتمايل. مُتبختر/ بە ترووفیز. بە کەنجەڵە.

عيال. عَيل. عائلة. أهل المنزل/ خێزان.

عَيّـان: مُرهَـق. كـالّ/ مانـدوو. شـەکەت. کەفت. هیلاک. بێهێز. کەشەنگ.

عَيّـان: عـاجز. غـير قـادر/ بـێ دەسەڵات. هیچی پێناکرێ. کەفتەکار. زەبوون. دەستەوسان.

عَيّـان: مـريض/ نـەخۆش. دەردەدار. ناسـاخ. خەستە.

عيـان: مُـشافَهَة/ بيـنين. ديـتن. چـاوپێکەوتن. سەیرکردن.

عياني: مَبني على مارُئيَ بالعَين/ ئەبێ بێنراو بێ. بينراوی.

عياني: يُـرَى بـالعَين المجردة/ بە چاو ئەبینرێ. دەرکەوتوو. ئاشکرا.

بادٍ للعيان: واضح. ظاهر/ ديار. دەرکەوتوو. ئەبینرێ.

عَيْب. عاب/ عەیب. سەرزەنشت.

عَيـب: نَقيـصة/ ناتـەواوی. کەمئەنـدامی. کەموکووڕی.

عَيـب: عـار. خِـزي/ شـورەیی. شـام و نـەنگی. بێئابڕوویی. خەوش.

عَيّدَ: إحتَفَلَ بالعيد/ جەژنی. گێژن.

عيد: كل يوم فيه جَمع وتذكار/ جەژن. گێژن.

عيد الأضحى: العيد الكبير/ جەژنی قوربان.

عيد رأس السنة: اليـوم الأول من كـل عـام/ ڕۆژی سەری ساڵ.

عيد سَنَوي: تَذكاري/ (ڕۆژ. جەژن)ی ساڵانە.

عيد العُمّال/ (ڕۆژ. جەژن)ی کرێکار.

عيـد الفصح. عيـد القيامـة/ جـەژنی ئەسـتەر. زیندووبوونەوە (لای گاورەکان).

عيد الفطر: العيد الصغير/ جەژنی ڕەمەزان.

عيـد المولـد النبـوي: يـوم مولـد الرسـول/ ڕۆژی مەولوو. لەدایکبوونی پێغەمبەر.

عيـد الميلاد: ميلاد المسيح/ ڕۆژی لـەدایکبوونی عیسا.

عيـد ميلاد: مناسَـبَة ميلاد شخص/ سـاڵ ڕۆژی لەدایکبوونی زەلامێک.

عيـد نـوروز: يـوم النـصر علـى الظُلـم/ جـەژنی نەورۆز.

عيدِيّة: هَدِيّة تُعطى بمناسبة العيد/ جەژنانە.

عَيّرَ: هَزَأ. عـاب. أخزى/ شكاني. ئابڕووی برد. سـووکی کـرد. ڕسـوای کـرد. تیـزی پێـوە کـرد. گاڵتەی پێکرد.

عَـير: حمـار وحـشي. حمـار الـوَحش/ کـەرەکێوی. کەری بەرەڵا.

عَير: كل ناتيء في مُستَوي/ گرێ. قۆرت. کۆسپ. هەڵتۆقیوی.

عَير: عـرق في وَرَقَـة النبـات/ (ڕەگ. دەمار)ی نـاو گەڵا.

عير: قافِلَة/ کاروان. ڕەوە.

عير: قافِلَة الحمير/ قەتاری کەر.

لافي العير ولا في النفير: زهيد. طفيف. تافه. قليل الأهمية. لاهنا ولا هُناك/ بێبایەخ. لە هیچ لایەک.

عَيّشَ: أعاش. جَعَلَهُ يَعيش/ ژیانی. بەخێوی کرد. خۆراکی پێدا.

عَيش: حَياة/ ژیان. بوون. گوزەران.

عَيش: خُبز. طعام. زاد/نان. نەمەك. خواردن. خۆراك. خواردەمەنی.

عَيش. عيشَة: (حالة. طريقة. اسلوب) الانسان في العَيش وفي حياته/گوزەران.

عَيش وملح/نان و نەمەك.

عَيَّطَ: صاح/قیژاندی. نەڕاندی. هاواری كرد.

عَيَّط. بَكى/گریا.

عَيِفَ: عَيَفان. كَرِه. إشمَئزَّ/بێز. قێزوبێز. نەویستن. ڕقلێبوون.

عَيفان: عائف. كارِه للشيء. مُشمئِزّ/بێزار لە. بەدڵی نیە. قێزی لێدێتەوە.

عَيَّلَ: أعال. قام باوده. أمّن معاشه/ بەخێوی كرد. ژیانی. داڵدەی دا. بژێوی دا.

عَيَّلَ: اعال. قام باوده. أمّن معاشه/ بەخێوی كرد. ژیانی. داڵدەی دا. بژێوی دا.

عَيِلَ: أعالَ. كَثُرَ عياله/مندال و خێزانی زۆر بوو.

عيَلَ: عالَ. أعالَ. إفتَقَر/هەژاركەوت. دەستی كورت بوو.

عيل صَبرُهُ: إستنفذ صَبرَهُ/ئارامی (نەما. لەبەربڕا). خۆی بۆ نەگیرا.

عَيِّل: عيال. عائل. أهل المنزل/خێزان.

عَيلان: ذكر الضَبع/نێرەكەمتیار.

عَيَّنَ: ثَقَبَ/كونی كرد. سمی.

عَيَّنَ: خَصَّص. أفرَدَ/جیای كردەوە. بەشبەشی كرد. خستیەلاوە.

عَيَّنَ: حَدَّدَ/دیاری كرد. دەستنیشانی كرد.

عَيَّنَ في مركز او مَنصَب. وَظَّفَ. جعله فيه/دایمەزراند. خستیە سەر كارێك.

عَيَّنَ الهويَة أو الشخصيَة: سَمّى/ناسنامەی دیاریكرد. ناونووسی كرد.

عَين: عُضو البَصَر/چاو. چاڵ. دیدە. دیە. چەم.

عَين: ثُقب الابرة/كون. كونی دەرزی.

عَين. أعيان. سَيِّد/پیاوماقوڵ. گەورەپیاو.

عَين: جاسوس. دَيدَبان/سیخوڕ. سووریاش. پایی.

عَين: جَوهَر. حقيقة/ڕاستی. بەبێ پێچ و پەنا.

عَين: خيرة. صَفوة/هەڵبژاردە. هەڵبژێرراو.

عَين: ذات. نفس. عَين كذا. عَينَهُ بعينه. نفسه. ذاته/خۆ. خۆی. كەس.

عَين: رِبا. فائدة/سەلەم. سوودو دەستكەوت.

عَين: صنف. نوع/جۆر. بابەت. چەشن.

عَين: مال. أموال. مُلك/مڵك و ماڵ.

عَين: مُستكشف. مُستطلع/دیدەوان. پشكنەر.

عَين: ناظر. مُراقب/چاودێر.

عَين: نَقد. عُملة معدنيَة. خلاف الورق/دراو. دراوی ڕەق. كانزا.

عَين: وجيه. شريف/دەمڕاست. سەرگەورە. پیاوماقوڵ.

عَينُ الماء: ينبوع/كانی. چەشمە. هانە. سەرچەشمە. سەرچاوە. كارێز.

عَينُ مكتب: دُرج/چاوی مێز. چەكمەجە.

الإصابة بالعين/بە چاوەوە بوون.

العَينُ بالعين: واحدة بواحدة. نَقدَةً بنقدَة/یەك بە یەك. سەر بە سەر. داش بە داش.

ذَكَرَ الحَقّ بِعَينه: خالصاً واضحاً/ڕاستی تەواوی وت. پێی لە ڕاستی نا.

قَويّ العَين: حاسة بَصره قويَّة/چاوی تیژە.

لايملأ العَين/چاو تێرناكا.

نَزَل من عَيني/لەبەرچاوم كەوت.

على عَيني: في الإكرام والحفظ/ئەوپەڕی ڕێز. بەسەرچاو. بەسەرچاوم.

عين: بَقَر الوَحش/گاكێوی.

عَيِّنَة: نُموذج. مثال/نموونە. نمینە.

عَيني: ذو علاقة بالعين/پەیوەندیدار بە چاوەوە.

عَينيَّة: عدسة المجهر/شووشەی گەردبین.



غائِب: غيْر حاضِر/ ئامادەنەبوو. نەهاتوو. بزر.
غائِب: مُستَتِر/ ون. نادیار. شاردراوە. نهێن کراو.
غائِب: صیغة الغائب في اللُغة. الشخص الثالث/ کەسی سێیەم. بزر.
غائِر: مُنخفِض. نازل وداخل في الأرض/ نقوم بوو. چالْ. کلۆر. نزم. نەوێو. بە ناخاچوو.
غائر العینین/ چاوبەقووڵاچوو.
غائِص: غَوّاص. غَطّاس/ مەلەوان.
غائِط: بُراز/ پیسایی. گوو.
غائِص: مَن یَغوصُ في البَحر/ ژێرئاوکەر.
غائِط: المُطمَئِن من الارض/زەوی نزمان. چالْ.
غائلة: غول. داهِیَة. مُصیبَة/ مەور. مەور هەیە. مەورە.
غائلة: الشرّ. الحقد الباطن/ ڕق. قین. دلّرەشی.
غائِلة: المرأة ترضع ولدها وهي حامل/ سلە پرێی مندالّمیمر.
غائم: مُغَیِّم. کثیر السَحاب. مُلَبَّد/ مەور. مەور هەیە. مەورە.

غائي: غائِیّة: متعلق بالبحث عن غایَة الطبیعة/ پەیوەندیدار بە سروشت. مەبەست و ئەنجامی سروشت.
غابَ: تَخَلّفَ عن الحضور. تَغَیَّبَ/ دواکەوت.
غابَ: إختفى. إستَتَرَ/ ون بوو. خۆی شاردەوە. دیارنەما.
غابَ: أفَلَ. غَرَبَ/ ئاوابوو.
غابَ: إغتابَ. غابَهُ من ورائه. وَشى بە/ پاشملە باسی کرد. بوختانی بۆ کرد. خراپ باسی کرد.
غابَ عَن: بَعُدَ عَن. فارَقَ/ کۆچی کرد. ئاوارە بوو. جیابووەوە. دوورکەوتەوە.
غابَ عن البال: نَسِيَ/ لەبیرچوو. بیرکرا. لەبیرچووەوە.
غابَ عن (الصواب. صَوابُه او وعیه): أغمِيَ علیه. أضاعَ صوابَه/ هۆشی نەما. لە هۆشی خۆی چوو. بورایەوە.
غاب: غابَة. حَرَج. حَرَجَة. أجَمَة/ دارستان. بێشە. بێشەلان. لێڕ. جەنگەلْ.
غابِر: ماضٍ. مُنصَرِم/ ڕابوردوو. تێپەڕیوو.
الازمان الغابِرة. القدیم الغابِر/ زەمانی کۆن. دێرین. دێرزەمان.
غابي: حَرَجي. مختص بالغابات والأحراش أو ساکنها/ دارستانی. دارستان نشین.
غاثَ: اغاثَ. أعانَ. نَصَرَ/ یارمەتیدا. پشتگیری کرد.
غاثَ الله البلادَ: أنزل بها الغَیثَ/ خوا بارانی باران. باران باری.
غادٍ. الغادي. القادِم مُبَکِراً/ زوو هاتوو.
غادٍ ورائح: آتٍ وذاهب/ هاتوو ڕۆیشتوو.
غادَى: أتاه باکراً. ذهب الیه مبکراً/ زوو چووە لای.

غادة: إمرأة ناعمة. لَيِنَة/ ئافرەتی نەرم و نیان. شۆش.

غادَرَ: تَرَكَ. رَحَلَ/ ڕۆی. ڕۆیشت. دەرچوو. چووە دەرەوە. کۆچی کرد. بەجێی هێشت.

غادر: غَدّار. خاتِل. خائِن/ ناپاك. زۆردار. خایەن.

غادرون: مِقذَف. مِجذاف/ سەوڵ.

غارَ: خَسَفَ. إنخَسَفَ/ تەپی. داتەپی. قوپا. چوو بە قوڵا. چوو بە ناوا.

غار في: دَخَلَ. غاصَ/ چووە ناوی. نقوم بوو. تیا نقوم بوو. پیاچوو.

غارت الشمس: غربت/ ئاوابوو. خۆرئاوابوو.

غارَ منهُ: حَسَدَ منه وكَرِهَهُ/ لێی زۆم بوو. ڕەشکی لێکرد. غیرەی لێکرد.

غارَ عليه: كَرِهَ شَرِكَةَ الغَير في حَقِّه/ بۆی بە پەرۆش بوو. هەر بۆ خۆی ئەویست.

غار: مَغارَة. كَهف/ ئەشکەوت. شکەفت. زفنك.

غار: غُبار/ تەپوتۆز.

غار: الجيش العظيم/ لەشکری گەورە.

غار: غَرّار. غرور. خَدّاع/ فێڵباز. گزیکەر. ساختەچی.

غارب: حارك. أعلى الكاهل/ سەرشان.

غارَة: غَزوَة/ هێرش. پەلامار. هەڵکوتانەسەر. چەپاوکردن. شەبەیخون. چەپخون.

غارس: زارِع/ ڕوێنەر. چەقێنەر.

غارِق: غريق. غاطس. مَغمور/ نقوم. نقوم بوو. بنئاوکەوتوو.

غارِق في أو بـ: مستغرق في أو بـ. مُنهَمِك/ خەریك. چۆتەژێری.

غاز: جوهر هوائي قابل للضغط/ گاز. غار.

غاز البطن: ريح البطن/ باوێژەی ناوسك.

غاز سام/ گازی کوشندە. ژەراوی.

غاز طبيعي/ گازی سروشتی.

غاز مُسَيِّل للدموع/ گازی فرمێسك ڕژێن.

غازِ. الغازي: مُغير. مُعتَدي/ هێرشبەر. داگیرکەر. پەلاماردەر.

غازَلَ: تَوَدَّدَ. تَحَبَّبَ. داعَبَ. راوَدَ/ دەستبازی و چاوبازی کرد. یاری و گەمەی ئەکرد. خۆی خۆشەویست کرد.

غازِل: مَن يَغزِل. غَزّال/ ڕێسەر. ئەوەی ئەڕێسێ.

غازي: منسوب إلى الغاز/ پەیوەندیدار بە گازەوە.

ماء غازي: فَوّار/ ئاوی هەڵچوو. ئاوی کاربۆنراو.

غاسِل. غاسِلَة. . غَسّال. غَسّالَة/ شۆرەر. جلشۆر.

غاسول صابون/ سابون.

غاسُول: نبات الشنان/ ئەسپۆن. چۆخان. زروێ.

غاشِم: ظالم. غاصِب. غَشوم/ زۆردار. ستەمکار. داگیرکەر.

غاشِيَة: تامُور. غِلاف القلب/ پێستی دڵ. توورەکەی دڵ. کیفی دڵ.

غاشِيَة: مُصيبَة. داهِيَة. نَكبَة/ بەڵا. کارەسات. جورتم.

غاشِيَة: قيامَة/ دواڕۆژ. زیندووبوونەوە. قیامەت.

غاشِيَة: خَدَم. حاشِيَة/ دەست و پێوەند. ئیشکەر.

غاشِيَة: غطاء/ داپۆشەر. بەرگ.

غاصَ في الماء: غَطَس ونَزَل/ نقوم بوو. چووە بن ئاو. بن ئاو کەوت. لە ئاوەکەیدا.

غاصٌ بالطعام أو الشراب: مُعتَرِض الطعام والشراب في حَلقه/لە بینی گیراوە. لە بین گیران.

غاصٌ بـ: مُزدَحِم. مَليء/ پڕ. چڕ. جەنجاڵ.

غاصِب: مُغتَصِب. مُنتَزِع. مُبتَز/ داگیرکەر. زۆردار.

غاضَ: نَقَصَ. إنخَفَضَ/ کەمی کرد. کەم بووەوە. داشکا. هاتەخوارێ. نیشتەوە.

غاضَبَ: أغضَبَ. حَمَلَهُ على الغضب/ تووڕەی کرد. ڕقی هەڵسان. زویری کرد.

غاضِب: غَضبان. ساخِط. مُغتاظ/ تووڕە. پەست. بە ڕقاکەوتوو. ڕقهەڵساو. قینگرتوو.

غاطِس. غَطّاس. غَوّاص/ مەلەوان. ژێرئاوکەر.

غاظَ: غايَظَ. غَيَظَ. أغضَبَ/ تووڕەی کرد. ڕقی هەڵسان.

غافٍ. الغافي: نائم/ نوستوو. خەوتوو. خەفتگ. نوستگ. نقستی.

غافِر: غَفور. غَفّار. صَفوح/ بەخشەر. بەخشندە. لێبەخشی.

غافَلَ: إستَغفَلَ. تَحَيَّنَ غَفلَتَهُ وتعمدها/ خافڵی کرد. فرسەتی لێهێنا.

غافَلَ: باغَتَ. فاجأ/ کوتوپڕی کرد. (لەپڕ. لە ناکاو) جووڵایەوە.

غافِل: ساهٍ. غير مُنتَبِه/ خافڵ. بێئاگا. بێخەبەر. بێخەوەر.

غاق: غُراب/ قەلەڕەشکە. قاڵوو.

غال: قُفْل/ قفڵ.

غالٍ. الغالي. غير رخيص. غالي الثَمَن/ گران. گرانبەها. بەنرخ. نرخ گران.

غالٍ: عَزيز محبوب/ خۆشەویست.

غالَت المرأةُ وَلَدها: أرضَعَتهُ وهي حامِل/ منداڵەبەرەو سکیشی پڕە. سفتەڕژێی کرد.

غالَهُ: قَتَلَهُ غَدراً/ تیرۆری کرد. بەناهەق کوشتی.

غالٍ. الغالي: غير رَخيص. غالي الثَمَن/ گران. گران بەها. نرخ گران.

غالٍ: مُتطرِف/ زیادەڕەو. چەپڕەو. ڕادیکاڵ.

غالٍ: في حالة الغليان/ ئەکوڵێ. کوڵ ئەدا.

غالَى في: بالَغَ. أفرَطَ/ زۆری پێوەنا. زیادەڕەوی کرد. هاشەو هوشەی کرد. فیشاڵی لێدا.

غالَى بـ: رَفَعَ ثَمَنَهُ/ نرخی بەرزکردەوە. نرخەکەی زیاد کرد. گرانی کرد.

غالَبَ: قاهَرَ ونازَعَ. صارَعَ. حاوَلَ أن يَغلِبَ/ زۆرانی گرت. گرەوی کرد. بۆربۆڕێنی کرد.

غالِب: ظافِر. مُنتَصِر. قاهِر/ سەرکەوتوو. براوە. زاڵ. شکێنەر. بۆڕدەر.

غالِب: سائد. مُسَيطِر/ باو. بڵاو.

غالباً: في الغالب. بالأكثر/ زۆرجار. زۆرێتی.

غالِبيَّة: أغلَبيَّة. سَواد/ بەشی زۆر. زۆربە. زۆرێتی.

غالَطَ: أغلَطَ. ضَلَّلَ. أوقَعَهُ في الغَلَط/ هەڵەی پێکرد. خستیە هەڵەوە. خەڵەتانی. دەستی بڕی. بەهەڵەیا برد.

غالِط: غَلطان. مُخطيء/ هەڵەکار. هەڵە.

غامَت: غَيَّمَت السماء: كانت أو أصبحت ذات غَيم/ بوو بە هەور. کردی بە هەور. هەوری هێنا. ئاسمان دای بە یەکدا.

غامَ: أغيَمَ. عَطِشَ/ تینووی بوو.

غام: مُغِمّ. مُحزِن. كَئيب. حزين/ پەست. خەمگین. بە پەژارە.

غام: مُغِمّ: كثير الغيوم/ هەور. هەوری زۆر.

غامَرَ: جازَفَ. خاطَرَ/ خۆی خستەمەترسیەوە، جەربەزەیی کرد. سەرەڕۆیی کرد. سەرپێچی کرد.

غامِر: كثير. فائض/ زۆر. لێشاو. فرە. زەبەندە.

غامِض: مُبهَم. خَفي/ نادیار. شاراوە. پەنهان. ئاڵۆز. لێڵ.

غامِق: داكِن. قاتِم/ تاریک. تۆخ. تەڵخ.

غانِم: ناجِح. مُفلِح. فائز. ظافِر. مُنتَصِر/ سەرکەوتوو. براوە.

غانِيَة : إمرأة جَميلَة/ ئافرەتی جوان. شۆخ و شەنگ. موترفە.
غانِيَة : إمرأة مُتَزَوِّجَة/ ئافرەتی بەشو. هاوسەردار.
غاوٍ. الغاوي: مُغو. مُظِل. مُغرٍ. خادِع. مُخادِع/ فریودەر. دەستبڕ. هەڵخەڵەتێن. فێڵباز.
غاوٍ. الغاوي. ضال. المُنقاد للهوى/ شوێن ئارەزوو کەوتوو. شەیدا. وێڵ. پەرۆش.
غاوي: هاوي/ باز. حەزلێکەر. (کۆتربان).
غايَة : غَرَض. هَدَف. بُغيَة. قَصد/ مەبەست. ئامانج.
الغاية تُبَرر الوسيلة/ ئەنجام هۆ پێشئێل ئەکا.
لغاية كذا : لِحَدّ كذا/ تا ئەو ڕادەیەی تاکو.
للغاية : جداً. للدرجة القصوى/ تا ئەوپەڕی. زۆر.
غايَرَ: خالَفَ/ جیاوازی کرد.
غايَرَ: بادَلَ/ گۆڕی. گۆڕیەوە. ئاڵوگۆڕی کرد.
غايَظَ. أغاظَ. أغضَبَ. غَيَّظَ. غاظَ/ تووڕەی کرد. رقی هەڵسان.
غَبَّ: زار غِباً. في فَترات مُتَقطعَة. بين وقت وآخر/ درەنگ درەنگ دەرئەکەوت. سەری ئەدا. ناوبەناو ئەچوو بۆ لای.
غَبَّ عَنهُ : أتاه يوماً وتركه آخر/ ڕۆژمناڕۆژێك ئەچوو بۆ لای.
غَبَّت عليه الحُمّى : أخذته يوما وتركته آخر/ ڕۆژمناڕۆژێك تای لێ ئەهات.
غِبّ: عُقبَة. عاقِبَة/ ئەنجام.
حُمّى الغِب: هي التي تَنوب يوماً بعد يَوم/ تای ڕۆژمناڕۆژ. پچڕپچڕ.
زارَهُ غِبّا : في فَترات متقطعة/ درەنگ درەنگ دەرئەکەوت. سەری ئەدا. ناوبەناو ئەچوو بۆ لای.

غَبّ: شُرب الماء بلون تَنَفُّس/ بێ پێوەنان. ئاوخواردنەوەی یەك بینە.
غُبّ: خليج صَغير/ کەنداوی بچووك. کەندر. ئاودر.
غَبا. غَباء: غَباوة. جَهل. غَفلَة/ نەزانین. ئەقڵ پێنەشکان. گەوجی. کەرێتی. بێئاگایی.
غُبار: غَبرَة. تُراب/ خۆڵ. تۆز. تەپوتۆز.
لاغُبارَ عَلَيه : لايُعاب. لايُنتَقَد/ بێخەوش. بێگەرد. پاك. داوێن پاك. دەستپاك. ڕەخنەی لێناگیرێ.
لايُشَقُّ غُبارُهُ. لايُشَق له غُبار. لايَفوقُه شيء. ليس له مثيل/ بێهاوتا.
غَباوَة: غَباء. جَهل. غَفلَة/ نەزانین. ئەقڵ پێنەشکان. گەوجی. کەرێتی. بێئاگایی.
غَبَب: لُغد. اللحم المتدلي تحتَ الحَنَك/ بەرچێلە. گۆشتی ژێرچەنە. غەبغەبەی مل.
غَبَرَ: مَضى/ تێپەڕی. ڕابورد.
غَبَرَ: مَكَثَ/ مایەوە. خایاندی.
غَبَّرَ: أثار الغُبار/ کردی بە خۆڵ و تەپوتۆز.
غَبَّرَ: لَطَّخ بالغُبار/ خۆڵاوی کرد. تۆزاوی کرد.
غُبر: ناسور/ مایەسیری.
غُبَّر. غُبر: بَقِيَّة/ پاشماوە. بنەڕۆك.
غَبراء. أغبَر/زەوی. بوون بەغوبار. تەپوتۆزو خۆڵ باران.
الغَبراء: الارض/ زەوی. زەمین.
بَنو غَبراء. بَنو الغَبرا : الفقراء/ هەژاران. بێنەوایان.
سَنَةٌ غَبراء. جَدبَة/ ساڵی وشك و بێباران. وشکەساڵ. نەهاتی و قاتوقڕی.
غَبرَة: غُبار/ تُراب/ خۆڵ. تۆز. تەپوتۆز.
غُبرَة: لون الغُبار/ بۆر. بێز. ڕەنگ خۆڵی.

غَبَشَ الليلُ: خالَطَ البياضَ ظلمته في آخره/شەبەقی دا. شەو تاریك و ڕوون بوو. کۆتایی هات.

غَبَش. غُبشَة. آخر الليل/تاریك و ڕوون. تاریك و لێڵ. بەرەبەیانی زوو. پێش شەبەق.

غَبِش: أغبَش ومُظلم/تاریك. لێڵ.

غَبَطَ: تَمَنَّى مثل (حاله. حال فلان)/خۆزگەی بۆ خواست. ئاواتەخوازی بوو.

غِبطَة: مسرَّة. هناء. سعادة/خۆشی. شادی. بەختیاری. خۆشگوزەرانی.

غَبَطَة: تَمَنِّي نعمة/خۆزگە. ئاواتەخوازی.

غِبطَة: صاحِب الغِبطَة. صاحب السَعادة/خاوەن ڕێز. پایەرز. نازناوی قەشەی گاورەکانە.

غَبط. غِبط. قبضات محصودَة/مەلۆ. کورزە. دراخە.

غَبَنَ الثوبَ: ثَناهُ ليَضيق او يَقصر/قارەمی کردەوە. تەسکی کردەوە. نوشتانیەوە. کورتی کردەوە.

غَبَنَ الطعامَ: خَبَأَهُ للشدة/ئازوخەی هەڵگرت بۆ تەنگانە. پەسەندەی کرد.

غَبَنَ في البيع والشراء: خَدَع وغَلَبَ. ظَلَمَ/فێڵی کرد. گزی کرد. دزی کرد. دەستبڕی کرد.

غَبَن: ماقُطِع من أطراف الثوب/بڕشت.

غَبَن. غَبْن: خديعَة في البيع والشراء/فێڵ و فەرەج. گزی ساختە لە کڕین و فرۆشتندا.

غَبِيَ الشيءَ او عنهُ: لم يَفطُن له. جَهِلَه/ئەقڵی پێ نەشکا. نەیزانی. تێی نەگەیی.

غَبِيَ الشيءُ عليه: خَفِيَ عليه ولم يَفطِنه/ نەکەوتەوە بیری. بیری چووەوە.

غَبي: أحمق. أبله/کەر. گەوج. کەوەدەن. گەلحۆ. گەمژە. دەبەنگ. حەپۆڵە. سەپۆڵە. مێشو. تەپۆ. لاژ.

غَبي: جاهل/نەزان. نەفام. سەرکوێر. تێنەگەیشتوو.

غَتَّ: غطَّ. غَطَسَ/کردی بە ئاودا. چووە ئاوەوە. نقومی کرد.

غَتَّ الضحكَ: أخفاه/پێکەنینەکەی شاردەوە. لە پێکەنینا دەستی لەگرت بە دەمیەوە.

غَثَّ: كان مَهزولاً/لەڕ. لاواز. سیس بوو.

غَثَّ الجُرحُ: تَقَيَّحَ. سالَ غَثيثُهُ/کێم و پیسی لێهات.

غَثّ. غَثيث: مَهزول. رديء/لەڕ. لاواز. سیس. سیسەڵە. بووەڵە. چروك.

غَثَى. غَثَت نَفسُهُ: غَثَيَت نفسُهُ: إضطربت حتى تكاد تَتَقَيَّأ/دڵی تێکڵەمات.

غُثاء. زَبَد. طُفاوَة/کەف. سەرتوێژ.

غَثاثَة: غُثوثَة. هُزال. رداءَة/لەڕولاوازی. بووەڵەیی. چروکی.

غَثْي: غَثَيان: جيشان النَفس/دڵ تێکەڵهاتن. دڵ بەیەکداهاتن.

غَثيث: قَيح/کێم. زۆخ. زلزلە.

غَجَر/قەرەج.

غَدَ. الغَدَ: اليوم الذي بَعدَ اليوم/سبەی. سبەینێ. سبە. سبێ. سبیانی. سۆزی.

غَداً. في الغد: بكرةً/ڕۆژی سبەینێ. لە سبەینێدا.

غَدا: ذَهَبَ غُدوَةً. إنطَلَقَ/زوو ڕۆی. دەرچوو.

غَدا: صار/بوو. بوو بە.

غَدّى: قَدَم الغَذاء. أطعَمَ. ظُهراً/ژەمی نیوەڕۆیدا. قاوەڵتی پێشکەش کرد.

غَداء: طعام الصُبح/خواردنی بەیانی. ژەمی بەیانی. بەرچایی.

غَداء: طعام الظهر/خواردنی نیوەڕۆ. ژەمی نیوەڕۆ. قاوەڵتی. فراڤین.

غَداة: غُدوَة. بُكرة. مابين الفجر وطلوع الشمس/ شەبەقى. بەرەبەیان. سبەینێ.

غَدَّار: غادِر. خائِن/ ناپاك. خایەن. زۆردار.

غَدَّارة: سلاح ناري/ دەمانچە. ساچمەزەنگ. تفەنگی ڕەشۆکی. تفەنگ.

غُداف: غُراب أسود/ قەلەڕەشکە.

غدان: ماتُعَلق عليه الثياب/ جل هەڵواس.

غُدَّة: جهاز في الجسم يفرز مواد خاصَّة/ ڕژێن. ئالو.

غُدَّة: قطعة لحم صلبة بين الجلد واللحم/ لوو.

غُدَّة صَمّاء. مُنقطعَة. لاقناة لها/ کوێرە لوو.

غَدَرَ. غَدَرَ الرَّجُلَ وبه: خانَهُ ونَقَضَ عَهدَهُ/ ناپاكی لەگەڵ کرد. خیانەتی لێکرد. غەدری لێکرد.

غَدر: خيانَة. خَتر/ ناپاکی. خیانەت. غەدر.

غَدَر: موضع كثير الحجارة/ بەردەلان.

غَدراء: ظُلمَة/ تاریکی. تاریکایی.

غَدَقَ: أغدَقَ المَطَرُ. غَزُرَ/ بەخوڕ باری. بارانی زۆر باری.

غَدَق: غَزير/ زۆر. لێزمە.

غَدَق: مُبتَل/ تەڕ.

غَدَا. غُدُوّ. غَدوَة: الحركة والسفر في الصباح الباكر/ بەیان گرتن بە کۆڵەوە.

غُدوَة: بُكرَة/ زوو. زۆر زوو. شەبەقی.

غَدِيَ: تَناوَل طعام الصباح/ بەرچایی کرد. نانی بەیانی خوارد.

غَدِيَ: تَناوَلَ طعام الظهر/ قاوەڵتی کرد. نانی نیوەڕۆی خوارد.

غَدير: بِركَة ماء/ ئەستێرك. ئەستێڵ. ئەستێڵە. گۆم. زەلکاو. پەنگاو. سەراو.

غَدير: جَدوَل. نهر صغير/ جۆ. جۆگە. چەم.

غِدِّير: غَدَّار. غادِر. خائِن/ ناپاك. خایەن. زۆردار.

غَديرَة: جديلة المضفور من شعر النساء/ پرچ. هۆنراوە. قژی هۆنراوە.

غَذَّ: أغَذَّ الجرحُ. سال قَيحَهُ/ برینەکە دەرك بوو. کێم و پیسی لێهات.

غَذَّ: أغَذَّ السيرَ وفي السير. أسرَعَ/ پێی هەڵگرتز خێرا ڕۆی.

غَذا. غَذَى: أطعم. قاتَ. زَنَى/ خواردنی دا. خۆراکی دا. بەخێوی کرد.

غِذاء: قوت/ خۆراك. خواردەمەنی.

غِذاء خاص. غِذاء مُنَظَّم: حِمية/ پارێز. رجیم. خواردنی تایبەتی.

غِذائي: مختص بالاطعمة/ شارەزاو پەیوەند بە خۆراکەوە.

مواد غِذائِيَة: ماکولات/ خواردەمەنی. خۆراك.

غَذيئة: مافي الجرح من قيح وصديد/ کێم و ئاوو زۆخی برین.

غَرَّ: خَدَع. أغوى. أطمع بالباطل/ خەڵەتانی. هەڵیخەڵەتان. فریوی دا. خەڕۆی کرد. دەمی چەورکرد.

ماغَرَك بفلان: كيف إجترأت عليه/ چۆن (دەرفەتی هاتی. فریوت دا. خەڵەتانت).

غَرّ: حَدّ السَيف/ دەمی شمشێر.

غَرّ: ثَنية. طَيَّة/ قەد. نوشتاوەیی.

غِرّ: عَديم الخبرة/ ناشی. نەفام. ساویلکە. نەزان.

غِرّ: مُجَنَّدغر. جندي حديث غيرُ مُدَرَّب/ سەربازی تازە نەزان. ناشی.

غَرا. غَرِيَ: ألصَقَ/ کەتیرەی لێدا. بەیەکیەوە نوسان.

غَرا. غَراء: مايُلصَق به. لِزاق/ کەتیرە. جەوی. هێڵم. غرە.

غَرا: حُسن/ جوانی. ناسکی.

غَرّاء (مؤنث أغَرّ).. أغَرّ.

غُراب: بَرَد. ثَلج/ تەرزە. بەفر.

غُراب: مُؤَخِر الرأس/ پشتی سەر.

غُراب: شفرة الفأس/ دەمەتەور.

غُراب أسود أو أسحم: عوهق/ قەلەڕەشکە.

غُراب أعصم: الأعصم. زُمّت/ قاژو.

غُراب الزرع: قاق/ قەلەباچکە. قشقەرە.

غُراب نوح (مَثَل): غاب ولم يَرجِع/ ڕۆی و نەگەڕایەوە.

أرض لايطير غُرابها: مُخصِبَة/ زەوی بە پیت.

طار غُرابُهُ: شابَ/ پیر بوو. سەری سپی بوو. ڕەشی تیانەما.

غَرابَة: كَون الشيء غريباً/ سەیر. شتەکە سەیرە. دەگمەن. سەیرێتی.

غَرّار: غَرور. خدّاع/ فێڵباز. گزیکەر. ساختەچی.

غِرار: غَرّ. حَدّ السيف/ دەمی شمشێر.

غِرار: حَذو. مِثال. نموذج/ نمونە. وەکو. هاو.

على غِرار: بِعَجَلَة. على عَجَل/ بە پەلە. بە هەڵەداوان. بە گورجی. بە خێرایی.

على غِرار كذا: مِثلُهُ/ وەکو ئەو. لە شێوەی.

على غِرار واحِد: مُتشابِهون/ وەك یەکن. چونیەکن. هاوشێوەن.

غِرارة: سَذاجَة/ ساویلکەیی. ناشێتی.

غِرارة: غَفلَة. غِرّة. سَهو. عدم التفات/ بێئاگایی. ناکاو. کوتوپڕ.

غِرارة: جَوالِق. عِدل. كيس/ هۆر. گونیە. توورەکە. خەرار. خورج. جەواڵ. کیسە.

غَرّاس: غارِس. زارِع/ ڕوێنەر. چەقێنەر.

غِراس: غَريسة. شَتلَة/ شەتڵ. نەمام. ئەوەی (ئەچێنرێ. ئەچەقێنرێ. ئەڕوێنرێ).

غِراس: وقت الغَرس/ کاتی ڕواندن و چەقاندن.

غِراسَة: زراعَة/ ڕواندن. چەقاندن.

غُراف: كَثير. غَزير/ زۆر. لێشاو.

غَرّاف: مغرَفَة. أداة الغَرف/ ئەسکوێ. چەمچە. ئاوگردان. میلاك. کەپچە. کەفگیر.

غَرام: حُبّ. عِشق/ خۆشەویستی. حەزلێکردن. دڵداری. ئەڤین. خولیا. شەیدایی. سەودایی.

غرام: ١/١٠٠٠ من الكيلو غرام/ گرام.

رسالة غراميَّة/ نامەی دڵداری.

غَرامَة: مايلزم أداؤه. جَزاء/ زیان. زیانانە. بژاردن. پێ بژاردن.

غراموفون: حاكي/ قەوان. سندوقی قەوان.

غَرامي: عِشقي/ دڵدارییانە.

غراميات: غَزَل/ دڵ و دڵخوازی. حەزلێکردن.

غرانيت: صَوّان/ بەردی سەخت. بەرد ئەستی. گرانێت.

غَرَبَ: غابَ. أفَلَ/ ئاوابوو. دیار نەما.

غَرَبَ: غَرُبَ. ذَهَبَ/ ڕۆی. کۆچی کرد. سەری خۆی هەڵگرت.

غَرَبَ: غَرَّبَ. إغتَرَبَ. نَزَحَ. هاجَرَ/ کۆچی کرد. ئاوارە بوو. وڵاتی بەجێهێشت. ڕەوەند بوو.

غَرُبَ: كانَ غير مالوف/ نائاسایی بوو.

غَرُبَ: كانَ أجنبياً/ بێگانە بوو.

غَرَّبَ: أبعَدَ. نَفَى/ دەریکرد. دووری خستەوە. شاربەدەری کرد.

غَرَّبَ: خَفِي. نفَر/ شاردیەوە.

غَرَّبَ: إتَّجَهَ نحو الغرب/ ڕوویکردە خۆرئاوا. ڕووەو خۆرئاوا ڕۆیشت.

غَرب: مكان غُروب الشمس. مُقابِل الشرق/ خۆرئاوا. شوێنی خۆرئاوابوون.

غَرب: حِدّة. نشاط/ توندوتیژی. گەرمە.

غَرب: بلاد الغرب/ ولاتی خۆرئاوا.
غَرباً: نحو الغرب. لجهة الغرب/ ڕووەو خۆرئاوا.
غَرب. سَهمُ غَرب وغَرب: لايُدرى رامِيَهُ/ (تیر. پلار)ی وێڵ. گوللەی وێڵ.
غَرَب: شجر/ درەختی غەرەب.
غَرَب: ذهَب. فضّة. خمر/ زێڕ. زیو. مەی.
غَرَب: عينٌ دامعَة. دَمع/ فرمێسك. چاوی پڕ لە فرمێسك.
غِربال: مايُغربَل به. مُنخُل/ بێژنگ. کەو.
سەرەدەسەرەن. خاك بێژ. ئاشینە. کارماخ. قەلبیر.
غُربَة: إغتِراب. تَغرُّب/ ولات بەجێهێشتن. کۆچ کردن. ئاوارەبوون.
غُربَة: وَحشَة/ تەنهایی. دووره ولاتی. دوورکەوتنەوە لە کەسوکار.
غَربَلَ: نَخَلَ/ بێژایەوە. لە بێژنگی دا.
غَربَلَة: نَخل/ بێژانەوە. کەوکردن. لە کەودان.
غَربي: مُقابل شرقي. منسوب الى الغرب. أحدأ بناء الغرب/ خۆرئاوایی.
غُرَّة: أول. مَطلع/ سەرەتا. نۆبەرە. نوخشە.
غُرَّة: بياض في جبين الفَرَس/ ئاوچەوان سپی. مارێ.
غُرَّة القوم: شريفهم/ دەمڕاست. پیاوماقوڵ.
غُرَّة: طائرمائي. وجاج الماء/ مەلێکی ئاوییە. قەلەمراو.
غِرَّة: غَفلَة. غِرارة/ بێئاگایی. ئاکاو. کوتوپڕ.
غَردَ. غَرَّدَ: تَغرَّدَ. غَنّى. صَدَح. زَقزَقَ/ جریوانی. خوێندی. دەنگی لێهەڵبڕی. گۆرانی وت.
غَرد: تَغريد. غِناء/ جریوە. قاسپە. ئاوازی مەل. گۆرانی.
غَرِد. غَرِد: غِرّيد. مُغَنّي/ ئاوازخوێن. گۆرانی بێژ.
غَرَّرَ بـ: عَرَّضَ للخَطَر/ تووشی کرد. دەستخەڕۆی کرد. خستیە مەترسیەوە. دەستی بڕی.
غَرَّرَ بـ: غَرَّ. خَدَع. أغوى/ خەڵەتانی. هەڵیخەڵەتان. فریوی دا. دەمی چەور کرد. دەستخەڕۆی کرد.
غُرَر: ثلاث ليالٍ من أول الشهر/ سێ شەوی سەرەتای مانگ.
غَرَر: خَطَر/ مەترسی. ئەنجام ڕەشی.
عَقد غَرَر. عَقد مجهول العاقِبَة/ بەڵێننامەیەکی ئەنجام کوێر.
غَرَزَ. غَرَّزَ: أغرَزَ الشيءَ في. أدخَلَهُ/ پیاچەقان. پیاکرد.
غَرَزَت. غَرَّزَت الجرادَة: أدخَلَت ذَنَبَها في الارض لتبيض/ کوللە کلکی چەقان. گەراینا.
غَرَزَ بالإبرَة: نَخَس/ دەرزی پیاکرد. دەرزی ئاژنی کرد.
غَرَزَ: أطاع بَعد عُصيان/ پاش یاخێتی ملی دا.
غَرز: العود المغروز بالارض/ نەمام. داری چەقێنراو.
غَرز: رِكاب من جلد/ ئاوزەنگی چەرم.
غُرزَة: دَرزَة/ تەقەڵ. تیك.
غَرس: زرع/ چەقاندن. ڕواندن. ناشتن.
غَرس: مَغروس. مَزروع/ ڕواو. نێژراو. چەقاو.
غَرس. غِرس. غَريسَة. مايُغرَس. شَتلَة/ نەمام. شەتڵ. خەڵف. قەلەم.
غَرَّضَ الشيءَ: جَعَلَهُ غَرَضاً/ کردی بە مەبەست. دەستنیشانی کرد.
غَرَض: هَدَف. غايَة. بُغيَة. قَصد/ مەبەست. ئامانج. هیوا. خواست. نیشانە. خواز.

غَرَض: مَصلَحَة/ بەرژەوەندی. سوود.

اغراض: حاجات. حوائج/ کەلوپەل. شتومەك.

غُرضُوف. غُرضوفي.. غُضروف. غُضروفي.

غَرَضِيَّة: تَحَيُّز. محاباة/ لایەنگری.

غَرغَرَ: تَغَرغَرَ/ لە دەمی وەردا. غەرغەرەی کرد.

غَرغَرَ: بَقبَقَ/ بلقە بلقی کرد. قولپی دا.

غِرغِر: دِجاج حَبَشَة/ مریشکی حەبەشە. مریشکی شاخدار.

غَرغَرَة: ترديد الماء في الحلق/ ئاو لەدەم وەردان. غەرغەرە.

غَرغَرَة: بَقبَقَة/ بلقەبلق. قولپە قولپ.

غَرَفَ: إغتَرَفَ. اخذ بالمِغرَفَة/ بە ئەسکوێ کەفی گرت.

غُرفَة: حُجرَة/ ژوور.

غُرفَة إستقبال/ ژووری میوان. دیوەخان.

غُرفَة جُلوس/ ژووری دانیشتن. نیشتمان.

غُرفَة الاكل. طعام/ ژووری نانخواردن.

غرفة الطَبخ: مطبَخ/ ژووری چێشت لێنان. مویەق.

غُرفَة نوم/ ژووری نوستن. خەوگە.

غَرِقَ: غاصَ. غارَ ورَسَبَ/ نقوم بوو. بن ئاو کەوت. بە قوڵ چوو. کەوتە بن ئاو.

غَرِقَ الحَيُّ: مات غَرَقاً/ خنکا. لە ئاوا خنکا. نقوم بوو.

غَرِقَ في أو بـ: إستغرق. إنشغل. إنهَمَكَ/ خەریك بوو. پێوەی خەریك بوو.

غَرَّقَ: أغرق. جَعَلَهُ يغرَق/ نقومی کرد.

غَرَّقَ الحَيَّ: أغرَقَ. أماته غَرقاً/ خنکانی لە ئاوا. لە ئاوا نقومی کرد.

غُرلَة: قُلفَة. غَلفَة. جلدة عضو التناسل/ پێستی چوك. چەرمی کێر.

غَرَّقَ المكان: ملأهُ بالماء/ جێگەکەی پڕکرد لە ئاو.

غُرلَة: قُلفَة. دَفَعَ الغرامة. أُلزِم بغرامة/ زیانانەی (دا. لێ سەنرا). پێی بژێررا. بژاردی.

غَرِمَ: خَسِرَ/ دۆڕانی. زیانی کرد. زەرەری کرد. زیانانەی دا.

غُرم: خَسارَة/ زیان. دۆڕاندن. زیانانە.

غُرنوق: غِرنيق: طائر مائي/ جۆرێکە لە سەقاکوژ. قولنگ.

غُرنوق: غِرنيق: شاب جميل/ کوڕو کچی جوان. قۆز.

غَرو. غَروَ. لاغَرو. لاغَروَ: لاعَجَب/ سەیر نیە.

غُروب: غياب. أُفول/ ئاوابوون.

غَرور: غَرّار. خَدّاع/ فێڵباز. گزیکەر. ساختەچی.

غُرور: عُجب. زَهو. الإعجاب بالنفس/ تەڕوفیز. بادیبوون. بەخۆنازین. خۆپەسەندی.

غُرور: إنخداع/ فریوخواردن. خەڵەتاندن. ساختە.

غُرور: اباطيل/ درۆو دەلەسە. خەیاڵ. خۆهەڵکێشان.

غَرِوَي: لَزِج. كالغراء/ لینج. مڵ. کەتیرەیی.

غُرِيَ. غَرِيَ: اولع به على جهل/ کوێرانە بە دڵیا چوو. خووی دایە.

غَريب: البعيد عن وطنه/ ئاوارە. دوورە وڵات. نامۆ. ئاوەکی.

غريب: أجنبي. دخيل. ليس من القوم/ بیانی. تاجیك. بێگانە.

غريب: العجيب. غير المألوف/ نائاسایی. نابار. سەیر.

غريب من الكلام: بعيد الفَهم/ قسەی گفتاری گران. نادیار. دەرمتک ئەزانرێ.

غريب الأطوار. منفرد برأيه. شاذ/ خاوەن ڕەوشت و کردارێکی تایبەتی و نائاسایی.

غِرِّيد: مُغرِد. مُغني/ ئاوازخوێن. گۆرانی بێژ.

غَرير: مَغرور. مُغِر بنفسه/ لەخۆبایی/ خەڕۆ.

غَرير: غِر. عديم الخبرة/ ناشی. نەفام. ساویلکە. نەزان.

غَريزة: فِطرة. طبيعة. طَبع. قَريحة/ خۆڕسک. خۆماک. سروشت. بەهرە. توانا.

غَريزي: طبيعي. فِطري/ خۆڕسکی. سروشتی. ڕەوشتی خۆڕسکی. خوی سروشتی.

غَريس: مَغروس. مَزروع/ ڕوێنراو. چەقێنراو. چێنراو.

غَريسة: مايُغرَس. شَتلة. بِذرة. نَواة/ نەمام. شەتڵ. خەڵف. قەڵەم. تۆو. دەنک.

غَريض: طازَج. طَري/ تازە. پاراو.

غَريق: غارِق. غاطِس. مَغمور/ نقوم. نقوم بوو. بن ئاو کەوتوو.

غريق في أو بـ: غارِق. مُستَغرِق/ خەریک. چۆتە ژێری.

غَريم: دائِن/ خاوەن قەرز. قەرزدەر. خاوەن وام. وامدەر.

غَريم: مَدين/ قەرزار. قەرزدار. وامدار.

غَريم: خَصم/ دژ. ناحەز. خەنیم. زشت.

غَرين. غِرْيَن: طَمي/ لیتە. قوڕ و لیتەی (پاش لافاو. بن ئاو).

غَريني: طَمي/ لیتەیی.

غَزا: أغار على/ هێرشی بردە سەر. پەلاماری دا. دا بەسەردا. چووە سەری.

غَزا: إكتَسح. إجتاح. غَمَر/ ڕایدا. ڕایماڵی. بەریادی کرد. پایەماڵی کرد.

غُزاة: غَزو. غَزوة. غارة. هجوم. حَملة/ هێرش. پەلامار.

غَزارة: كَثرة. وَفرة/ زۆری. خوڕەمی. لێشاو.

غَزال: حَيوان/ ئاسک. مامز. ئاهو. کەژاڵ.

غَزّال: عنكبوت/ جاڵجاڵۆکە.

غَزُرَ: كَثُرَ/ زۆر بوو. خوڕەم بوو. مشە بوو.

غَزر. غُزر: غَزارة. كَثرة. وَفرة/ زۆری. خوڕەمی. لێشاو.

غَزَلَ: إغتَزَلَ. رَدَنَ. فَتَلَ/ ڕستی. بایدایەوە. ڕێسای.

غَزَلَ بـ: غازَلَ. تَغَزَّلَ. تَغَنّى بمدحِه/ پیاهەڵدا.

غَزَل: مغازَلة. تَحَبُّب/ چاوبازی. خۆشەویستی. دەمەتەقێ. دەستبازی.

غَزَل: شِعر غَزَلي/ هۆنراوەی دڵداری و خۆشەویستی.

غَزْل: فَتل. بَرم/ ڕستن. بادانەوە. ڕێسان.

غَزْل: خَيط مَغزول/ ڕێس. ڕێسراو. بادراو.

غَزْل البَنات: حَلوى طَرِيّة/ پەشمەک.

غَزَلي: غرامي/ دڵداری. خۆشەویستی. سەوداییی.

غَزو: إغارة/ پەلاماردان. هێرش بردنە سەر.

غَزو: غَزوة. غَزاة. غارة. هُجوم. حَملة/ پەلامار. هێرش.

غَزير: كَثير. وافِر/ زۆر. خوڕەم. لێشاو. مشە.

غَسّال. غَسّالة: الشخص الذي يَغسِل الملابس/ جل شۆر.

غَسّال. غَسّالة: الشخص الذي يغسل الموتى/ مردووشۆر.

غَسّال: ماكِنة الغَسيل/ جل شۆر. ئامێری جل شتن.

غُسالة: ماءٌ غُسِلَ به/ ئاراو.

غَسَان: حِدّةُ الشباب. رِيعان/ تاقی لاوی. هەرەتی گەنجی.
غَسَقَ الليلُ: إشتدت ظلمَتُهُ/ شەو تاریکی کرد. تاریك داهات.
غَسَق: ظُلمَةُ أو الليل/ تاریك داهاتن. زەردەپەڕ.
غَسَلَ. غَسْلَ. نَظَّفَ بالماء/ شتی. شۆشتی.
غَسل: تَغسيل. تَنظيف بالماء/ شتن. شۆشتن.
غَسل الدماغ: جعل الشخص يُغيّر أفكاره وأقواله/ مێشك شتن. مێشك پڕکردن.
غَسل (في الشريعة الاسلامية): إغتسال/ وسڵ کردن. وسڵ دەرکردن.
غُسل. غِسل. غِسلَة. ماء الغَسل. مايُغسَل به/ ئاراو.
غَسُول: غاسول. صابون/ سابون.
غَسُول: غاسول. نبات الشنان/ ئەسپون. چۆخان. ندۆی.
غَسيل: مَغسول/ شۆرراو.
غَسيل: ثياب مَغسولة أو تَنتظر الغسل/ جلی شۆراو. جلی چڵکن.
غَشَّ: خَدَعَ/ فێڵی کرد. گزی کرد. کەڵەکی دا. خەڵەتانی. هەڵیخەڵەتان.
غَشَّ: زَيَّفَ/ قەڵبی کرد. شتی قەڵبی دروست کرد. شتی ساختەی دروست کرد.
غَشَّ: تلاعَبَ بـ/ فروفێڵی کرد. دزی کرد.
غَشّ. غِشّ: خِداع. تدليس/ فێڵ. گزی. کەڵەکە دان. خەڵەتاندن.
غِشّ: خيانَة/ ناپاکی. خیانەت. دەست پیسی. داوێن پیسی.
غِش: مَذَق. زَغَل/ گزی. ساختەکردن. شتی قەڵب و ساختەو دروستکردن.
غِشّ: حِقد. سواد القَلب/ کینە. ڕق. قین. دڵ ڕەشی. دڵ پیسی.

غَشا: تَرَدَّدَ إلى. زار/ ئەچوو بۆ. ناوبەناو سەری ئەدا.
غَشّى: جَعَلَهُ أغبَش/ لێڵی کرد. تەماوی کرد.
غَشّى: غَطَّى/ دایپۆشی. شاردیەوە.
غَشّى: طَلَى/ تێی گرت. ڕووکەشی کرد. دایپۆشی. بەرگی تێگرت.
غِشاء: غِلاف. قِشرة. جِلد/ بەرگ. توێکڵ. کەلو. پێست. توێژ. سەرتوێژ.
غِشائي: قِشري/ توێکڵدار. پێستدار.
غَشَّاش: مُخادِع/ فێڵباز. گزیکەر. خەڵەتێنەر. کەڵەکچی. سەرچەوت. جامباز. تەڵەکەباز. دەست پیسی. قومارباز. دەستپ.
غَشاوَة اللحاف: شَرشَف/ بەرگەلێفە.
غَشاوَة: ضَباب. سَديم/ لێڵی. تارمایی. تاریکایی. تەم.
غَشَمَ: ظَلَمَ/ زۆری کرد. زۆرداری کرد. جەورو ستەمی کرد.
غَشَمَ: فَعَل بِغَيرِ رَوِيَّة. إعتَبَطَ/ گێل بوو. کوێرانە ڕەفتاری کرد.
غَشوَة: غُشوَة. غِشوَة: غَشاوَة/ لێڵی. تارمایی. تاریکایی. تەم.
غَشوم: غاشِم. ظالم/ زۆردار. ستەمکار. داگیرکەر.
غَشِيَ المَكان. أتاه. تَرَدَّدَ. زار/ سەری دا. بۆی چوو.
غَشِيَ: غَطَّى/ دایپۆشی.
غَشِيَ: حَلَّ بـ. أصابَ/ بەسەری هات. تووش بوو. گرفتار بوو.
غَشِيَ الليلُ: أظلَمَ/ تاریکی کرد. تاریك داهات.
غَشِيَ المرأةَ: دَخَلَ عليها. جامَعَها/ لاقەی کرد. چووە لای. گای.

غَشِيَ: الحِصانُ الفَرَسَ: نَطّ عليها. سافَدَها/ ئەسپەکە سواری ماین بوو. چاکی کرد. لێی پەڕی.

غَشِيَهُ بالسَوط: ضَرَبَهُ/ بەر قامچی دا. بە قامچی لێی دا. دایە بەر قامچی.

غُشِيَ عليه: أُغمِيَ عليه/ لە هۆش خۆی چوو. بووڕایەوە. بووڕدەوە.

غَشْي. غُشْي. غَشَيان. غَشْيَة: إغماء/ لە هۆش خۆچوون. بووڕانەوە. بووڕدنەوە.

غُشيَه: غَشاوَة/ لێڵی. تارمایی. تاریکایی. تەم.

غشيم: جاهل. عديم الخِبرَة/ ناشی. نەزان. گێل.

غَصّ بالطعام أو الشراب: إعترض في حَلقِه/ لە بینی گیرا. لە قوڕگی گیرا.

غَصّ المكانُ: إمتلأ. إزدحم/ پڕ بوو. بوو بە قەلەبالغی. جەنجاڵ بوو.

غَصَبَ على: اجبَرَ. ارغَمَ/ بە زۆر پێی کرد. زۆری لێکرد. ناچاری کرد.

غَصَبَ: إغتَصَبَ. اخذ الشيءَ قهراً/ بە زۆر بردی. بە زۆر لێی سەند. دڵگیری کرد.

غَصَبَ المرأة: إختطفها. زَنى بها كُرهاً/ ئافرەتی هەڵگرت. ئەتکی کرد. لاقەی کرد. گای.

غَصب: إجبار. إرغام/ زۆرلێکردن. ناچارکردن. بەزۆر پێکردن. بەزۆر لێسەندن.

غَصب: إغتصاب: إختطاف. الزِنا كُرهاً/ هەڵگرت. بەزۆر لاقەکردن و ئەتک کردن.

غَصباً. بالغَصب: جَبراً/ بە زۆر.

غَصباً عن: على الرغم من/ لەگەڵ ئەوەشدا. سەرەڕای ئەوەی.

غَصباً على: رَغماً على/ بەزۆری زۆردارەکی. بیەوێ و نەیەوێ.

غَصبان.. غاضِب/ زۆر توڕە جامی ڕقی پڕبووە.

غُصّة: مايَعتَرِض في الحلق/ لە بین گیران. لە قوڕگ گیران.

غُصّة: هَمّ. حُزن/ خەم و خەفەت. پەژارە.

غَصَّنَت الشجرةُ: نَبَتَت أغصانها/ درەخت لقی کرد. پەلی دەردا.

غُصن: فَرع الشجرة/ لق. پەل. چڵ.

غُصَنَة: غُصَين: عُلوج. غُصن صغير/ تەرز. لقی ورد.

غَضّ طرفه أو من طرفِه او بَصَرِه: خَفَضَه/ چاوی دانەواند. چاوی داخست.

غَضّ الطرفَ أو النَظَر عن: تغاضى عن. تجاهل/ چاوی لای پۆشی. لێ بورد. خۆی لێ گێل کرد.

غَضّ من قَدرِه/ بێبایەخی کرد. شکانی. سووکی کرد. لە نرخی کەم کردەوە.

غَضّ النباتُ: نَظُرَ وطَرُؤَ/ تەڕو پاراو بوو. گەشایەوە.

غَضّ الغصنَ كَسَرَهُ ولم يَتِم كَسرَهُ/ نوشتانیەوە. خواری کردەوە.

غَضّ الشيءَ: نَقَصَه/ کەمی کردەوە. دایشکان.

غَضّ صوتَهُ ومن صَوتِه: خَفَضَه/ دەنگی (نزم کردەوە. هێواشی کردەوە. کز کرد).

غَضّ: ناضِر. طَري/ تەڕو پاراو. ئاودار. گەش. گەشاوە.

غَضّ الطَرف او البَصَر: خَفض النَظَر/ چاوداخستن. چاوشۆڕکردن.

غَضّ الطرف او النظر عن: تَجاهُل/ چاولێپۆشین. لێبوردن. خۆلێگێلکردن.

بِغَضّ النظر عَن: بِغير إلتِفات إلى/ لەگەڵ ئەوەشدا. ئەگەرچی.

غَضاب. غُضاب: القذى في العَين/ ڕیپۆق.

غُضابي: سريع الغَضَب/ تووڕەو تڕۆ. زوو هەڵئەچێ.

غَضار. غَضارَة: طِينٌ حُرّ. صلصال/ گڵە سوور.

غَضارة: طراوَة/ تەڕو پاراوی.

غَضاضة: طراوة. نضارَة/ تەڕو پاراوی.

غَضاضَة: نَقيصة. عَيب. غُضَّة/ سووکی ناتەواوی. شووڕەیی. کەمی.

غَضِبَ منهُ أو عليه: تَغَضَّبَ: ثارَ واحتَدَّ عليه/ لێی تووڕە بوو. ڕقی لێهەڵسا. لێی زویر بوو. پیاهەڵشاخا.

غَضَب: حَنَق. سُخط. غَيظ/ تووڕەیی. ڕق. قین. خەشم.

غَضِب. غَضبان: غاضِب. ساخِط/ تووڕە. پەست. بەرقاکەوتوو. ڕق هەڵساو. قین گرتوو.

غَضَّة: غَضاضة. نَقيصة. عَيب/ سووکی. ناتەواوی. شووڕەیی. کەمی.

غَضَّ عن: عَدَلَ عن. إنصرفَ عن/ وازی لێهێنا. دەستی لێهەڵگرت.

غَضَدَ عليه: عَطَفَ/ بەزەیی پیاهاتەوە.

غَضِرَ: كَثُر مالُه. طاب عَيشُهُ/ بوو بە خاوەن سامان. گوزەرانی چاک بوو.

غَضَر: غَضارَة. طراوة/ تەڕو پاراوی.

غُضروف: عظم مَرِن/ کرکراگە. قلێنچە.

غَضَّنَ: جَعَّدَ. شَنَّجَ/ چرچی کرد. چرچ و لۆچی کرد. ژاکاندی. لوول کرد.

غَضَن. غَضن: تَجَعُّد/ چرچ بوون. چرچ و لۆچ. کرژ. ژاکاو. لرچ هەڵاتوو.

غَضَن. غَضن: عَناء/ شەکەتی. ماندووبوون. هیلاکی. ناڕەحەتی. کێشە.

غُضون: تَجَعُّدات وتَكَسُّر/ چرچ و لۆچ. کرژ. چرچی ناوچەوان و کرکراگە.

في غُضون: في خلال/ لە ماوەی.

في غضون ذلك: في أثناء/ لە کاتی. لەو کاتەدا.

رَجُل ذو غُضون: في جَبهَتِه تَجَعُّد وتَشَنُّج/ ناوچەوان چرچ. کرژ. لۆچ.

غَضَنفَر: أسَد/ شێر.

غَضوب: سريع الغَضَب/ زوو هەڵئەچێ. تووڕەو تڕۆ. توند خوو. ڕقاوی.

غُضوضَة: غَضاضة. نضارَة. طراوە/ تەڕو پاراوی.

غَضير: غَضّ. طَرِيّ/ تەڕو پاراو. ئاودار. گەش. گەشاوە.

غَضيض: غَضّ. طري/ تەڕو پاراو. ئاودار. گەش. گەشاوە.

غَطَّ: أغَطَّ. غَمَسَ. غَطَس/ خستیە ناوەوە. لە ئاوی هەڵکێشا. نقومی کرد.

غَطَّ النائمُ: شَخَرَ/ پرخاندی. پرخەی هات. پرخە پرخی کرد. ئەپرخێنێ.

غَطّ: غَمس. تَغطيس/ لە ئاو هەڵکێشان. خستنە ئاوەوە. نقوم کردن.

غَطا. غَطى. غَطّى: سَتَرَ. أخفى/ دایپۆشی. سەری نایەوە. شاردیەوە. پێچایەوە.

غَطّى: بَزَّ. فاقَ/ ئەم ئەوی بڕدا. لەو بەهێزتر بوو. لێی بردەوە. بەزاندی.

غِطاء: كل ما يُغطّى به/ سەرقاپ. تۆپەوانە. گوڵبێنە. دەرپۆشە. داپۆشەر. بەرگ. دەرخۆنە. سەرپۆش.

غِطاء جوي/ بەرگەهەوا.

غِطاء السرير/ چەرچەف. سەرجێگە.

غِطاء المائدة/ سەرمێز.

غَطّاس: غاطِس. غَوّاص/ مەلەوان. ژێرئاوگەڕ.

غطاس عند النصارى: عيد الظهور الالهي. عيد التَجَلّي/ یەکێکە لە جەژنی گاورەکان.

غطرَسَ: ئَغطرَس. تَكَبَّر. تَبَختَرَ/ كەنجەڵەی ئەكرد. خۆی بائەدا. خۆی بە زل ئەگرت.
غِطرِس. غِطرِيس: مُتَغَضطرِس: متكبر. معجب بنفسه/ پۆح زل. تپزل. خۆ بەزل زان. بە خۆیەوە ئەنازێ.
غَطرَسَة. عَجرَفَة. تَكَبُّر/ كەنجەڵە لێدان. خۆپادان. پۆح زلی. خۆبەزل گرتن.
غَطَسَ: غاص. إنغَمَسَ/ چووە بن ئاو. نقوم بوو. ژێرئاو كەوت.
غَطَّسَ. غَطَسَ. غَمَّسَ/ نقومی كرد. لە ئاو هەڵكێشا. خستیە بن ئاو.
غَطس: إنغماس. غَوص/ نقوم بوون. چوونە بن ئاو.
غَطس: تَغطيس. غَمس/ نقوم كردن. لە ئاو هەڵكێشان. خستنە بن ئاو.
غَطَشَ: أظلَمَ/ تاریكی كرد. تاریك داهات. بوو بە شەومزەنگ.
غَطَشٌ في العَين: ضعيف في البصر/ چاوی كزو پەرپووشاوی. لێڵ.
غَطيط: شَخير أو خَرير النائم/ پرخە. پرخەپرخ. پرخاندن.
غَفا: غَفِيَ. أغفى. نامَ. نام نوماً خفيفاً/ نوست. خەوت. خەوی لێكەوت. سەریەخەوی شكان. چاوی چووە خەو. كەم نوست.
غَفّار: غَفور. صَفوح. كَثير المَغفِرَة. مَن يَغفِر/ بەخشەر. بەخشندە. ئەبەخشێ.
غَفّار: غَفور. من أسماء الله الحُسنى/ یەكێكە لە ناوەكانی خوا.
غِفارة: غِطاء. غَفرة. مايُغطى به الشيء/ سەرقاپ.
غِفارَة: لباس للرأس/ سەرپۆش.
غَفَرَ: إغتَفَرَ. صَفَحَ عن/ بەخشی. لێی بورد. لێی خۆش بوو. بۆی پۆشی. چاوی لێ پۆشی.
غَفَرَ. غَفْر الشيء: غَطّاهُ وسَتَرَهُ/ داپۆشی. سەری نایەوە.
غَفَر. غُفار: زَغَب. شعر كالزَغَب/ كەنەمموو. كەنكەموو.
غُفر: عِجل/ گوێرەكە. گوێرەكەی گاكێوی.
يَغفِر. يَغتَفِر. يُسامِح/ ئەبەخشێ. چاوی لێ ئەپۆشێ.
لايَغفِر: لايَغتَفِر. لايُسامِح/ نابەخشێ. چاوی لێناپۆشێ. چاوپۆشی لێناكرێ.
غُفران: غَفر. صَفح. مَغفِرَة/ بەخشین. لێبوردن. چاولێپۆشین.
صك الغُفران عند المسيحين: رسالة الغفران/ نامەی بەخشین. نامەی لە گونا. خۆشبوون.
غَفرَة. غِفارة: غِطاء. مايُغطى به الشيء/ سەرقاپ.
غَفَلَ عن: أغفَلَ. تَرَكَ وأهمل. سَها عن/ فەرامۆشی كرد. خستیە پشتگوێ. لە بیری چو. پەرانی. خافڵ بوو. بەجێی هێشت.
غَفَّلَ: جَعَلَهُ غافلاً/ لەبیری بردەوە. پێی فەرامۆش كرد. گێلی كرد.
غَفل: غَفلَة. سَهو. غِرَّة/ بێئاگایی. لەبیرچوون. سەهووكردن.
غُفل: لاعَلامَةَ فيه/ بێ نیشانە. بێ ناونیشان. نیشانەی پێوە نییە.
غُفل: من لاحَسَبَ لَه/ نەناسراو. بێڕەگەز.
غُفل: لايُرجى خَيرُهُ ولايُخشى شَرُّهُ/ بێكەڵك. بێ زیان. بێوەی. نە خێری هەیە نە شەڕ.
غُفل من (التاريخ. التوقيع): غير (مؤرخ. مُوَقَّع)/ بێ بەرواروو بێ ئیمزا.

قاهر: جبّار. قويّ/ بەهێز. بەتوانا. دەسەڵاتدار.

قاهر: غالب/ سەرکەوتوو. براوە. بەزێن. زاڵ.

قاهر: مُستَبِد/ زۆردار.

القاهر: الله/ خوا.

قُوّة قاهِرة/ هێزی شکێنەر. هێزی باڵاو بەزێن.

قاوي: غالِبُهُ في القُوّة/ هێزی تاقی کردەوە.

قـؤود: أقـوَد. سَـهل الإنقيـاد/ بـە ئاسـانی (ڕام ئەکرێ. ئەبرێ بەڕێوە). دەستەمۆیە.

قـاوَلَ: فـاوَضَ. سـاوَمَ/ وتوێـژی کـرد. لێـی دوا. گفتوگۆی کرد.

قاوَلَ: جادَلَ/ مشتومڕی کرد. چەنەچوونی کرد.

قـاوَلَ: إتَّفـقَ علـى. عاقَـدَ. تعاقَـدَ/ پێکهـات. ڕێکەوت.

قـاوَمَ: ضـدَّ. إعتَـرَضَ. مَنَـعَ/ بـەرەنگاری کـرد. بەرهەڵستی کرد. بەرگری کرد.

قاووق: قُلَنسوَة طويلة/ کڵاوقووچە.

قايَسَ بَيْنَ شيئَين: قارَنَ/ بەراوردی کرد.

قايَضَ: بادَلَ/ گۆڕییەوە. شت بە شتی کرد.

قَبَّ: قَبَّبَ. بَنَى قُبَّة/ گومەزی دروستکرد.

قَبَّ: قَطَعَ/ بڕی. پەڕاندی.

قَبَّ: إرتَفَعَ/ بەرزبووەوە. هەڵئاوسا. ئاوسا. ورگی دا. بڵقی کرد.

قَبَّ: يَبِسَ. جَفَّ/ وشك بووەوە. سیس بوو. وشك هەڵات.

قَـبَّ الخَصرُ أو البطن: ضَمُرَ/ سك بە قووڵاچوو. ناوقەدی باریك بووەوە.

قَبا: عَقَدَ. قَوَّسَ/ کردی بە تاق. بە تاق سەری گرت. بەخشت چنی. سەری گرت.

قَبـاء: ثـوب يُلـبَس فـوق الثيـاب. ثـوب خـارجي/ سەرجل. کەوا. خەفتان.

قَباء. قَباءُ قوسين.. قاب. قاب قَبوسين.

قَباحَة: قُبح. شَناعَة. بَشاعَة/ ناشیرینی. شێوەی ناشیرین. کردەوەی ناشیرین و ناپەسەند.

قَباحـة: فحشاء. أمرٌ قَبيح. زِنـا. فِـسق/ داوێـن پیسی. کاری ناڕەوا.

قَباحَة: مُخالَفَةُ القـانون/ سەرپێچی. هەڵەکردن. لە یاسادەرچوون.

قَبّاع: خنزير/ بەراز.

قَبّاع: جَبان/ ترسنۆك.

قُباع: قُنفُذ/ ژیشك. ژوشك. ژووژوو.

قَبالَة: مَسؤوليَة/ بەرپرسیاری.

قَبالَة: عَقد. إتفاق/ ڕێکەوتن. پێکهاتن.

قَبالَة: مَسؤوليَة/ بەرپرسیاری.

قَبالَة: إلتزام. تَعَهُّد/ بەڵێندان.

قَبالَة: عَقد. إتِّفاق/ ڕێکەوتن. پێکهاتن. پەیمان بەستن.

قَبالَة: ضَمان/ گەرەنتی. زامنکردن.

قُبالَـة: تجـاه. أمـام/ بـەرەدەم. بەرامبـەر. پێش. لەپێش.

قِبالَة: علم القِبالَة. صِناعَة التوليد/ مامانی.

قَبّان: ميزان/ قەپان. تەرازوو.

قَبانَة/ أجرَة الوَزن/ کرێی قەپان.

قِبانَة: عَمَل أو حِرفَة القَبّاني/ قەپانچێتی.

قَبّاني: مُقَبِّن. عمل القَبّاني/ قەپانچی.

قَبَّبَ: قَبَّ. بَنى قُبَّة/ گومەزی دروستکرد.

قَبَّبَ: جَعَلَهُ على شكل قُبَّة. حَدَّبَ/ قۆقزی کرد. ئاوساندی. هەڵیتۆقاند.

قَبَّبَ: غَطّى بِقُبَّة/ (بە خری گومەزی) سەری گرت.

قَبَّبَ العُصفورُ او البَطنُ: دَقَّ. ضَمُرَ/ سك بە قووڵا چوو. ناوقەدی باریك بووەوە.

قُبَّة: سَقف مُستَدير/ گومەز. گومەت.

قُبَّة الإسلام: بَصرَة/ شاری بەسرە.

قُبَّة الشهادة عند اليهود. قُبَّة الزمان: خَيمَة الإجتماع/ دەواری كۆبوونەوەی جولەكە.

قُبَّة الجَرَس: مرج الجَرَس/ گومەزی زەنگ.

قُبَّة: المعدة الثانية في المجترات/ هەزار لۆغانە. هەزارپرتی. كلاوقازی.

قَبِيح: طائر/ كەو.

أنثى القَبَج/ چیل. ماكەو.

صغار القَبَج. أفراخ القَبَج/ كوار. بارەكەو.

قَبُحَ: كان قبيحاً. بَشعاً شَنيعاً/ ناشیرین بوو. ئێسكی قورس بوو.

قَبَّحَ: صَيَّرَهُ قَبيحاً. بَشَّعَ. شَنَّعَ/ ناشیرینی كرد.

قَبَّحَ عليه فِعلَهُ: بَيَّنَ قُبحَهُ/ سەرزەنشتی كرد. كردەوە ناشیرینەكانی دەرخست. توانجی تێگرت.

قُبح. قَبح: قَباحَة. بشاعَة. شَناعَة/ ناشیرینی. شێوەی ناشیرین. كردەوەی ناشیرین.

قُبحاً له: بُؤس/ رەزای خوالەوە.

قَبَرَ: دَفَنَ/ ناشتی. خستیە چاڵەوە. كردی بەژێر خاكەوە.

قَبر: دَفن/ ناشتن.

قَبر: ضَريح. جَدَث. لَحد. مَدفَن/ گۆڕ. كلكۆ. زێد.

قَبر رَمزي/ نەزرگە. جیێ نەزرگە.

قُبَّرَة: قُنبَرَة. قُنبُرَة. طائر/ كلاوكوڕە. كلاونە.

قَبَسَ. إقتَبَسَ/ بلێسە. گولبژێری. دەستەبژێری.

قَبَس. قَبسَة: مِقباس. جَمرَة. جَذوَة/ پشكۆ. سكڵ. پزیسك. بزووت.

قَبَصَ. قَبَّصَ: تَناوَلَ بأطراف أصبعه/ بەسەری پەنجە گرتی.

قَبَضَ الشيء أو عليه: أمسَكَ بِه/ گرتی. بەدەست گرتی.

قَبَضَ على: ألقى القبض على: إعتَقَل/ بەندی كرد. گرتی.

قَبَضَ: قَلَصَ/ كرژی كرد. گوشی. هێنایەوە یەك.

قَبَضَ البَطنُ او الأمعاء: أمسَكَ/ سكی دەرنەچوو. قەبز بوو. گرفتی كرد.

قَبَضَ الصَدرَ: غَمَّ. إكتَأَبَ/ پەست بوو. پەستی دایگرت.

قَبَضَهُ الله. قَبَضَ الله روحه: أماته/ خوا كوشتی. خوا بردییەوە.

قُبِضَ المَريضُ: أشرف على الموت/ هاتە سەر گیانەڵا. وا لە سەرەمەرگایە.

قُبِضَت رُوحُهُ: مات/ مرد. گیانی سپارد.

قَبَضَ وَجهَهُ أو مابين عَينيه: تَقَبَّضَ: تَكَشَّرَ في عبوس/ مۆن بوو. ڕووی گرژ كرد. ناوچەوانی گرژ كرد. دەموچاوی دا بە یەكدا.

قَبَّضَهُ مالاً: أعطاه/ پارەی دایە. پارەی پێدا.

قَبض: مَسك. إمساك بـ/ گرتن. بەدەستەوە گرتن.

قَبضٌ على: إعتقال. ألقاء القبض على/ گرتن. بەندكردن.

قَبض المال: إستلام. تناول. يوم القبض/ وەرگرتن. دراو وەرگرتن. ڕۆژی موچە وەرگرتن.

قَبض: إمساك البطن/ سك دەرنەچوون. گرفت. گیراوی.

قَبضَة. يلىءُ الكَفِّ. حَفنَة/ پڕ بە چنگ.

قَبضَة: مقبَض. يد. يَدَة/ دەسك. قوڵف.

قَبضَةُ اليَد: جمع اليَد/مشت. مشتەكوڵە.

في قَبضَتِه. في قَبضَةِ يَدِه: تحت سيطرتِه/لەژێر دەستيايە. لەژێر دەسەڵاتيدايە.

قَبَّطَ وَجهَهُ: قَطَّبَ/ ڕووی گرژ كرد. دەموچاوی دا بە يەكدا.

قِبط. قُبط. اقباط: نَصارى مصر/قيبت. گاورەكانی ميسر.

قَبَعَ القُنفُذ: أدخل رأسَهُ في جِلدِه/ژيشك خۆی كرموڵە كرد. سەری كردەوە بە (لەشيا. ناوا).

قَبَعَ رأسَهُ: أدخَلَهُ في ثَوبِه/ سەری كردەوە بە ناو جلەكانيا.

قَبَعَ في مَنزِله أو مَكانه: إنزوىَ/ پەناى گرت. گۆشەگيری كرد. خۆی تەريك گرت.

قَبَعَ الخنزيرُ والفيلُ: صاتَ. صَوَّتَ/زريكاني. مرانی. مرقانی. مرخانی. مرەی لێوەهات.

قَبَعَ في الارض: دَخَل فيها/خۆی كرد بەناو زەويدا.

قَبَعَت المرأةُ: إستَتَرت/خۆی داپۆشی.

قُبَع: قُباع. قُنفُذ/ژيشك. ژوشك. ژوژوو.

قُبع: بُوق/كەرەنا. بۆری.

قُبَعَة: غطاء أو لباس الرأس/شەپقە.

قَبقاب: لباس الرجل. حذاء شعبي/قاپقاپ.

قَبِلَ: اقبَلَ. دَنا. قَرُبَ/نزيك بووەوە.

قَبِلَ على: أقبَلَ على. بادَرَ الى. إنصَرَفَ الى. إهتَمَّ بـ/ دەستی پێكرد. دەستی دايە. بڕياری كردنی دا. خۆی تەرخان كرد.

قَبِلَ بـ: وافَقَ على. رَضي بـ/ قايل بوو. پێی قايل بوو. قبوڵی كرد. ملی دريژكرد. گوێڕايەڵی كرد.

قَبَّلَ: باسَ. لَثَمَ/ماچی كرد.

قَبلُ: من قَبلُ. قَبيّ. نقيض بَعدُ/لە پێشا. بەر لە.

قَبلَ أوانِه: سابَق وقتَهُ. بَكير/پێش كات. پێش كاتی خۆی. بەر لە كات.

قَبلَ فَواتِ الأوانِ. قَبلَ مُضيِّ الوقتِ/پێش تێپەڕبوونی كات. تا كار لە كار نەترازاوە.

قَبلَ المسيح: قَبلَ الميلاد/پێش زايين.

قَبلَ ذلك. قَبلَئذٍ/لە پێشترا؛ لەوەوپێش.

قَبلَ الظُهر/پێش نيوەڕۆ.

قَبلَ أن/پێش ئەوەی.

قَبلَ كل شيء/پێش هەموو شت. بەر لە هەموو شت.

مِن قَبل. من ذي قَبل. عن ذي قَبل: سابِقاً/لە پێشدا؛ پێش ئێستە. بەر لە ئێستە. هەر زوو.

قُبُل. قُبل: مُقدَم/پێش. پێشەوە.

قِبَل: طاقَة. قُدرَة/توانا. وزە.

قِبَل: بإتجاه. صَوب. شَطر/ئاراستە. ڕووەو.

مِن قِبَل. مِن عِند/لەلايەن.

لي قِبَلَهُ دَينٌ: عِندَهُ/قەرزم لايەتی. وامم لايەتی.

أتاني مِن قِبَلِه: مِن عِندِه/لە لايەنيەوە. لەلايەن ئەوەوە هات.

قُبلَة: لَثمَة. بَوسَة/ماچ. مووچ. ڕاموسان. ڕاموس.

قِبلَة: الجِهَةُ التي يُصَلّى نحوها/قيبلە. ڕووگە.

قِبلَة: مَحَبَّة/كابە. كەعبە.

قِبلَة الأنظار: جاذب أو مَطمَع الانظار/ سەرنجڕاکێش.

قَبَلي: عَشائري/ تیرەگەری.

قِبَليَّة: جِهَة الجنوب/ باشور.

قَبَّن: وَزَنَ بالقَبان/ کێشای. ترازووی کرد. قەپانی کرد. دا لە قەپان.

قَبو: البناء المعقود/ دیوار و بنمیچی چنراو. گومەزی.

قَبو: سرداب. نَفَق/ ساردباو. ژێرزەمین. توونێل.

قُبوة: قَبو صغیر/ کۆڕیچە.

قَبوط: جُندُب/ کوللە مسکە.

قَبول: قُبول: رِضَی/ قایلی. قایلبوون. قبولْ کردن. پەسەندکردن.

قَبول: قُبول: أخذ. تَلَقٍ/ وەرگرتن. پێگەیشتن.

قَبول. قُبول أعضاء: إدخال وسماح الاعضاء/ وەرگرتن. وەرگرتنی ئەندام.

قُبيّ الشكل: على شكل قُبَّة. مُستَدير/ گومەزی.

قبيح: قبيح المَنظَر: بَشِع. شَنيع/ ناشیرین. ئێسك قورس. ئێسك گران. دەعەجان.

قبيح: شائن. فاضِح. سَفيه/ نابڕوپەر. بێئابڕوو. خوێڕی. لەوچە. دەم شڕ.

قبيح: بَذيء. قَذِر/ چەپەڵ. پیس.

قَبيحَة: العمل القبيح/ کردەوەی ناشیرین و نابەجێ.

قَبيل: ضامِن. كفيل/ دەستەبەر.

من قَبيل كذاك على سبيل كذا/ لەو بابەتە. لەوپێیە.

من هذا القبيل: مثل هذا. من هذا الخصوص/ لەم بابەتە. وەك ئەمە. لەم ڕووەوە. لەم پێیە.

قُبَيل: تصغير قَبل. زَمَن يسر/ ماوەیەکی کەم.

قَبيلة: عشيرة/ هۆز. عەشرەت. خێڵ.

قَبيلي: قَبَلي. عشائري/ تیرەگەری.

قَتَّ: كَذِبَ/ درۆی کرد.

قَتَّ: قَلَّل/ کەمی کردەوە.

قَتّ: كَذِب/ درۆ. درۆ و دەلەسە.

قُتار: دُخان المطبوخ/ هەڵم و هالاوی کوڵاو.

قُتار: رائحة البَخور والشواء/ بۆنی بخورد و گۆشتی برژاو.

قَتّال: مُميت. فَتّاك/ کوشندە. کوژەر. مرۆك. بکوژ.

قِتال: تَقاتُل. حَرب/ جەنگ. جەنگ کردن. جەنگین. شەڕکردن. کوشتار.

ساحة القِتال: مَيدان الحَرب/ شەڕگە. مەیدانی جەنگ.

قَتام: ظُلمَة. عَتمَة. ظَلام. قَتَمَة/ تاریکی. تاریکایی.

قُتام: سَواد. قَتَمَة/ ڕەشی.

قَتَرَ على. قَتَّرَ على: بَخَلَ: أقتَرَ/ دەستی گرتەوە. ڕژدی کرد. چرووك بوو.

قَتر: تَقتير. تضييق في النَّفَقَة. بُخل/ دەستگرتنەوە. دەسنده. ڕژدی. چرووکی.

قَتْر: القليل من العَيش/ کەم گوزەرانی. دەست کورتی. نەدارایی.

قَتَلَ: أزهَقَ روحَهُ. أماتَه. فَتَكَ به. أعدَمَ/ کوشتی. مراندی.

قَتَلَ الجُوعُ أو البَردُ: كَسَرَ حِدَّتَهُ/ برسێتی نەما. تەشقی سەرما شکا.

قَتَلَ الخَمرَةَ: خَفَّفَ. مَزَجَ بالماء/ ئاوی تێکرد. ڕوونی کردەوە.

قَتَلَ عَلیلَهُ: سَقاهُ/ تینوێتی شکان.

قَتَلَ نَفسَهُ: إنتَحَرَ/ خۆی کوشت.

قَتَلَ الوَقتَ: أمضاهُ/ کاتی کوشت. کاتی بردەسەر. خۆی خلافان.

قَتَّلَ قَتَلَ کَثیراً. ذَبَحَ/ کوشتاری کرد. زۆری کوشت.

قَتل: إعدام الحیاة/ کوشتن. کوشتار. خوێن ڕشتن. سەربڕینز خوێنکردن.

قَتل عَمدي أو مُتَعَمد: ماکان مقصوداً. مع سبق إصدار/ کوشتن بە ئەنقەست.

قَتل خطأ: ماکان غیر مقصود. بدون سبق إصرار/ کوشتنی هەڵە.

قَتل بدون ذبح. بدون إراقة دَم/ مردارکردنەوە.

قَتل ظَهراً: غِیلَةً/ کوشتنی ناڕەوا. نامەردانە. لەدواوە.

قَتل الذات: إنتحار/ خۆکوشتن.

قَتل جَماعي: عبادة جماعیة/ کۆمەڵ کوژی.

قَتَمَ. قَتِمَ الغُبار: إرتَفَعَ/ بوو بە تەپ و تۆز. خۆڵ باری. بوو بە خۆڵەپەتانی.

قَتَمَ وَجهُهُ: تَغَیَّرَ/ ڕەنگی گۆڕا. ڕەنگی تێکچوو.

قَتَمَ: عَتَمَ. ضَرَبَ الی السواد/ ڕەش دلگیرسا.

قَتَمَ: عَتَمَ/ ڕەشی کرد. لێڵی کرد.

قَتم. قَتَمَة. غُبار/ خۆڵ. تەپوتۆز. خۆڵەپەتانی.

قَتَمَة: ظلام. سواد/ تاریکی. ڕەشی.

قُتمَة: لون فیه غُبرة وحُمرة/ ڕەنگی دێز.

قُتمَة.. قَتام/ خۆڵەمێشی. ڕەشتاڵە.

قَتیل: مقتول/ کوژراو. کوشتە.

قَثّاء: قِثّاء: خیار/ خەیار.

قَحّ: الخالص من کل شيء/ بێ خەوش. پوخت. پەتی.

قُحاف: السَیل الجارف/ لێشاو. لافاو.

قَحبَة: مُومس. الفاسِقة الفاجِرة/ داوێن پیس. سۆزانی. جندە. قەحبە. گاندەر.

قَحّة: وَقاحة. قِلّة حیاء/ بێ شابڕوویی. بێحەیایی. لەوچەیی. ترۆی. چەقاوەسوویی.

قَحَطَ. قَحِطَ المطرُ: إحتَبَسَ/ باران نەباری.

قَحَطَ. قُحِطَ العام: إحتَبَسَ فیه المطر/ وشکەساڵ بوو. ساڵەکە بارانی تیا نەباری. نەهاتی بوو.

قَحط. عام قحط. جَدب. إمتناع المطر. إحتبس فیه المطر/ وشکەساڵ. بێبارانی.

قَحَفَ. إقتَحَفَ مافي الإناء: شَرِبَهُ کُلّهُ بِشدةٌ. جَرَعَهُ/ هەڵیلووشی. هەمووی خواردەوە.

قَحَفَ. إقتَحَفَ السَیلُ: جَرَفَ کل شيء/ ڕایدا. هەموو شتی ڕادا. ڕاپێچی کرد.

قَحَفَ: کَشَطَ/ کڕانی. ڕنی.

قِحف: إناء مکسور/ سواڵەت.

قِحف: إناء من خشب/ تەشتی. کاسەی دار. کاسە.

قِحف الرأس: جُمجُمة/ کاسەی سەر. کاپوڵ. کەپوڵ.

قَحَلَ. قَحِلَ. قُحِلَ: یَبِسَ/ وشک بوو. وشکی کردن وشک بووەوە.

قَحَلَ الشیخُ: یَبِسَ جلده علی عظمه/ لە پیریدا پێستەکەی وشک بووەوە بەسەر ئێسقانەکەیدا.

قُحول: قُحولة. یُبوسة/ وشکی. وشکایی. وشکانی.

قَحِل. قَحَل. قاحِل. يـابِس/ وشك. وشكەوە بوو. گرۆێ. ئیمەڕۆك.

قَدَّ إقْتَدَّ. قَـدَّ. قَطَعَ مُستَأصِلاً/ لەبن دەریهێنا. ریشەكێشی كرد. بنەبڕی كرد.

قَدَّ: إقْتَدَّ. قَدَّدَ. قَطَع بالطول/ دڵیهێنا. بە درێژی بڕیەوە. توێی كردەوە.

قَدَّ الكلامَ: قَطَعَهُ/ قسەكەی بڕی.

قَدّ: حَجم. مِقدار/ قەبارە.

على قَدِّه: على مِقداره أو حَجمِه/ بەئەندازەی خۆیەتی. هێندەی قەبارەی ئەوە.

قَدّ: قامَة. قِوام/ بەژن. بالا.. قەد. قەڵافەت.

قَـدْ: قَلَّمـا (قَـد يَـصدق الكَـذوب)/ (زۆركـەم. بـە دەگمەن) درۆزن ڕاست ئەكا.

قَـدْ: رُبَّمـا. (قَـد يَحـضُر)/ لەوانەیـە. ڕەنگـە بەشكوبێت.

قُدّ: سَمَك. زَيت كَبَد القُدّ/ جۆرە ماسییەكە. ماسی قود. ڕۆنی ماسی.

قِدّ: سَير شَريط. حِزام/ پشتێنی چەرم.

قِدّ: إناء من جِلد/ هەمانە. هیزە. مەشكە. كوندە.

قَـدّاح. قَدّاحَة: حَجَر (النـار. القَدّاحَة. الـصوان)/ بەرد ئەستێ.

قَدّاحَة: مِقـداح. مِقدَحَة. فولاذة تُقـدَح بهـا النـار/ ئەستێ.

قَدّاحَة: وَلاعَة/ چەرخ. چەخماخە.

قُـدّاس: صَـلاة القُـدّاس (نَـصرانية)/ كۆنوێـژی گاورەكان.

قُدّاس لِراحة المَيِّت: صلاة المَيِّت/ نوێژی مردوو.

قَداسَة: طَهارَة/ خاوێنی. پیرۆزی.

قَداسَة البابا: لَقَب الحَبر الأعظَم/ نازناوی پاپا.

قُدّام: أمام. تُجاه. إزاء/ پێش. بەردەم. نووا.

قُدّام: ضد بعيد. قَريب/ نزیك. دەماتوو. لەمەولا.

قِـدَّة: شَـريحَة. قِطعَة طَويلة/ پارچە. تیلماسك. تووڵ. پارچەیەكی درێژ.

قَدَحَ فيه: طَعَن فيه وعابَهُ. شَهَّرَ به. ذَمَّهُ/ ئابڕووی برد. سووكی كرد. شكانی. قسەی پێوت. ناوی زڕان. زەمی كرد.

قَـدَحَ في سـاق أخيـه: غَـشَّهُ/ فێڵ و گزی لە برای خۆی كرد. دەستی بڕی. هەڵیخەڵەتان.

قَدَحَ في: ثَقَبَ/ كونی كرد. سمی.

قَدَحَ: إقتَدح النار: أشعَل النار/ ئاگری كردەوە.

قَـدْح: تَـشهير. ذَمّ/ ئـابڕووبردن. پاشملـە باسكردن. ناوزڕاندن. قسەپێوتن. زەمكردن.

قِدح: سَهم/ تیر.

قَدَح: كأس/ پیاڵە. پەرداخ. جام.

قَدَّدَ: قَدَّ. إقْتَدَّ. قَطَعَ بالطول/ دڵیهێنا. بە درێژی بڕیەوە.

قَـدَّدَ: قَـدَّ. إقتَـدَّ. إستاصـل/ لـەبن دەریهێنـا. ریشەكێشی كرد. بنەبڕی كرد.

قَدَّدَ اللَحمَ: قَطَعَهُ طولاً/ توێی كردەوە.

قَدَرَ: قَدِرَ. إقتَدَرَ على الشيء: قَوِيَ عليه. إستطاع/ توانی. توانی بیكا. كردی. پێی كرا. بۆی كرا.

قَدَرَ الشيءَ بالشيء قَدَّرَ: جَعَلَهُ على مِقداره/ پێی پێوا. هێندەی ئەوی دانا. ئەوەندەی ئەوی لێكرد.

قَدَرَهُ. قَدَّرَهُ قَدَر: إحترَمَهُ. إعتبره/ ڕێزی لێنا.

قَـدَّرَ (الظـروف. الوضـع.. الخ): تَفَهَّمَ. راعَـى/ لـە هەلوێست و كاتەكە تێگەیی. ڕەچاوی كرد.

قَدَرَ: خَمَّنَ. قَوَّم. ثَمَّنَ/ هەڵی سەنگان. مەزندەی کێش و نرخەکەی کرد. قەبلاندی. نرخاندی.

قَدَرَ اللهُ عليه الأمرَ وقَدَّرَ له الأمر: قضى وحكم عليه/ فەرمانی خوایە بەسەریدا ئەبێ بیکا. لە چارەی نووسیوە.

قَدَّرَ على عِيالِه: ضَيَّقَ/ دەستی لێگرتنەوە.

لايُقَدَّر: لايُثَمَّن. فائق القيمة/ بەهادار. نرخی بۆ دانانرێ.

لاقَدَّرَ الله: لاسَمَحَ اللهم خوانەکا.

قَدَر: قِسمَة. نَصيب/ چارەنووس. چارەنێیس.

قَدر: مِقدار. كمِيَّة/ بڕ. هێندە. ئەوەندە.

قَدر: قيمَة. أهَمِيَّة. شأن. مَقام/ بەها. گرنگی ڕێز. پلە. پایە.

قَدر: بِقَدر. على قَدر: بنسبة كذا. تبعاً لـ/ لە گوێرەی.

قَدرَ: بِقَدر. على قَدر: مُساوٍ لـ/ وەك يەك.

(قَدر. على قَدر. بِقَدر) المستطاع أو الإمكان: حَسَب الإمكانية/ بە گوێرەی توانا.

بِقَدر ما: بِقَدر كذا: لِلدَرَجَة كذا/ تا ئەو ڕادەیەی.

على قَدر كبير من الأهمِيَّة: مُهم جداً/ زۆر گرنگ.

مبلغ قَدرُهُ كذاك فَقَط/ تەنها.

قِدر: إناء يُطبَخ فيه/ مەنجەڵ. قازان. پاتێڵ. بەرۆش.

قِدر صغير: قُدَيرَة/ مەنجەڵۆكە. پاتێلە.

قُدرَة: مَقدِرَة. الاقُوَّة على الشيء والتمكن من فعله/ هێز. توانا. توانين. توانست. وزە ڕايە. دەسەڵات.

قَدري: جَبري/ تەوزی. بە زۆر. ناچاری.

قَدرِيَّة: جَبرِيَّة. الإعتقاد بالقضاء والقَدَر/ باوەڕكردن بە چارەنووس.

قَدُسَ: كانَ مُقَدَّساً طاهراً. طَهُرَ/ پیرۆز بوو.

قَدَّسَ: جَعَلَهُ مُقَدَّساً/ پیرۆزی كرد. ڕێزی لێنا.

قَدَّسَ: مَجَّدَ الشخص بعد وفاته/ بەڕێز و پیرۆزیەوە یادی كراو ناوی هێنراو باسكرا پاش مردن.

قَدَّسَ الكاهنُ عند النصارى: اقام القُدّاس/ كۆنوێژی كرد.

قَدَّسَ اللهُ فُلاناً: طَهَّرَهُ وبارَكَ عليه/ داواكردن لە خوا، كە پیرۆز و ڕێزداری كا.

قُدس: مكان مُقَدَّس/ شوێنی پیرۆز.

القُدس: الجَنَّة/ بەهەشت.

القُدس: بيت المقدس. أورشليم/ شاری قودس. ئورشەلیم.

قَدَمَ: سَبَقَ/ پێشكەوت. كەوتە پێشەوە.

قَدُمَ: عَتَقَ. صار قديماً/ كۆن بوو. باوی نەما.

قَدِمَ: أتى. جاءَ/ هات.

قَدِمَ: عادَ. رَجَعَ/ گەڕایەوە. ڕۆیشتەوە. هاتەوە.

قَدِمَ: قَرُبَ/ نزیكی خستەوە.

قَدَّمَ: ضد أخَّرَ/ پێشی خست.

قَدَّمَ: مَنَحَ. وَهَبَ. أعطى. أهدى/ بەخشی. دای. پێشكەشی كرد.

قَدَّمَ: أورَدَ. ذَكَرَ. أدلى/ باسی كرد. دركاندی. ڕاستی وت.

قَدَّمَ إستقالةً. إستقال. عَرَضها/ داوای وازهێنانی كرد. ئیستیقالەی كرد.

قَدَّمَ إمتحاناً. إمتَحَنَ/ چوو بۆ تاقیكردنەوە. بەشداری تاقیكردنەوەی كرد.

قَدَّمَ التهاني: هَنَّأ/ پیرۆزبایی كرد.

قَدَّمَ إلى: سَلَّمَ الى. رَفَعَ الى. أحالَ إلى/بۆی نارد. دای پێی. خستیە بەردەمی.

قَدَّمَ خِدمَةً الى. اَدّاها. اَكرَمَ. خَدَمَ/خزمەتی كرد. چاكەی لەگەڵ كرد.

قَدَّمَ ذبيحةً: ضَحّى/قوربانی دا. ئاژەڵی سەربڕی. خێری كرد.

قَدَّمَ رِجلاً واخَرَ أُخرى: تَرَدَّدَ/دوودڵ بوو. بە گومان بوو. ڕاڕابوو.

قَدَّمَ الساعةَ: أسبَقَها/كاتژمێری پێشخست.

قَدَّمَ شخصاً الى آخر: عَرَّفَهُ بە/پێی ناساند.

قَدَّمَ شخصاً الى المحكمة أو المحاكمة: إستحضَرَهُ الى المحكمة/دای بە دادگا. شكاتی لێكرد.

قَدَّمَ الشكرَ: شَكَرَ/سوپاسی كرد.

قَدَّمَ رأياً: طَرَحَ رأياً. اَثارَ/پێشنیاری كرد. ڕا دەربڕی.

قَدَّمَ طلباً أو عريضةً أو إستدعاءً/سكالانامەی دا. داوای كرد.

قَدَّمَ عرضاً: عَرَضَهُ/نمایشی پیشاندا. ڕایگەیاند. پێشنیاری كرد.

قَدَّمَ على: أعطى الأولية أو الأفضلية لـ/ پەسەندتری كرد. بە باشتر و چاكتری دانا. پێشی خست.

قَدَّمَ يميناً: حَلَفَ/سوێندی خوارد.

قَدَّمَ سِعراً أو عطاءً: عَرَضَ/نرخی دا. چووە ناو كارەكەوە.

قَدَم: رِجل/پێ. پا.

قَدَم: خطوة/هەنگاو. شەقاو.

قَدَم: مقياس أنكليزي للطول/پێ. ١٢ (ئینچ. گرێ). فوت. (٣٠,٤٧٩سم).

قَدَم. ذو قَدَم: شجاع/ئازا. نەبەز.

ذو قَدَمين: كائنات ذو رِجلَين/دوو پێ.

على قَدَم وساق: مُتَهَيِّأ/ئامادە. لەسەرپێ. لەسەر تێز.

قِدَم. قُدُم. قُدُم: مِقدام/ئازا. نەبەز. چەربەزە.

قِدَم: عَتاقَة/كۆنی. كۆنێتی. دێرینێتی.

قِدَم: سابِقَة. لە قديمة/كۆن. سەدە كۆنەكان.

مُنذُ القِدَم: منذ الازمنة الغابرة/هەر لە كۆنەوە. لە مێژەوە. لە دێرینەوە.

مُمعِن في القِدَم. مُوغِل في القِدَم: قديم جداً/ یەكجار كۆنە. زۆر كۆنە.

قُدمِيَّة: أجرة/كرێ. پێشەكی. پێیانە.

قُدُم: شجاع/ئازا. نەبەز. بوێر.

قُدُم: المُضي الى الأمام/كۆڵنەدان. بەرەوپێشەوە.

مَضى قُدُماً: لم يَعرج ولم يَنثَنِ/كۆڵی نەدا. بەردەوام بوو.

قُدوَة. قِدوَة. قُدوَة: مثال يُحتذي بە/نموونە بۆ پەیرەوی كردن. ڕابەر. پێشەنگ.

قُدُّوس. قِدّيس طاهر/خاوێن. پیرۆز.

القُدُّوس: الله. من أسماء الله الحسنى/یەكێكە لە ناوەكانی خوا.

قَدوم: أداة للنحت. فأس/پیلە. تەشوێ.

قُدُوم: مَجيء. حضور/هاتن. ئامادەبوون. دیمانە.

قَديم: عَتيق/كۆن. دێر. دێرین. كەڤن.

قَديم: سابق/پێشوو. بەروو. بەرین. لەمێژ.

قَديماً: في القَديم. منذ زمن بعيد/لە كۆنەوە. لە دێرینەوە. لە مێژەوە.

قَذىً. قَذاة: مايَقَع في العَين/خۆڵ و پووش و هەر شت كە بكەوێتە چاوەوە.

قَذى: غَمَص. رَمَص. وَسَخ ابيض في مجرى العَين/ ڕیپۆق. جیلقنه.

قَذَّى عَينَهُ: اخرج مِنها القَذى/ ڕیپۆق و پیسی له چاوی دەرهێنا.

قَذَت عَينُهُ: قَذَفَت بالغَمَص والرَّمَص/ چاوی ڕیپۆقی کرد.

قَذِيَت عَينُهُ: وَقَع فيها القَذى/ چاو شتی تێچوو.

يَغُضُّ على القَذى: يَحتَمِل الضَيمَ ولايَشكو/ دەردی ناخۆشی دەچێژێ و دەری نابڕێ. پیش دەخواتەوە.

قَذارَة: قَذَر. وَسَخ/ پیسی/ پۆخلی. چلکنی.

قَذّاف: قاذِف. رامي/ هاوێژەر. تووڕدەر. فڕێدەر. ئاوێژ.

قَذّاف: مَنجَنيق/ ئاگرهاوێژ.

قَذال: مُؤَخَّر الرأس. مابين الأذنين من مُؤَخَّرُ الرأس/ پشتی سەر.

قَذُرَ. قَذِرَ. قَذَرَ: كان قَذِراً وَسِخاً/ پیس بوو. چەپەڵ بوو. چلکن بوو.

قَذَّرَ: جَعَلَهُ قَذِراً. وَسَّخ/ پیسی کرد. چلکنی کرد. پۆخلی کرد.

قَذَر: قَذارَة. وَسَخ/ پیسی. چلکنی. پۆخلی. ئەنوایی. گەماری.

قَذِر. قَذْر. قَذُر: وَسِخ/ پیس. چلکن. پۆخڵ. ئەنوا. گەمار.

قَذَعَ: شَتَمَ/ جنێوی دا. دژوێنی دا.

قَذَعَ: شَهَرَ بـ. رماهُ بالفَحش وسوء القَول/ قسەی ناشیرینی پێ وت. ئابڕووی برد.

قَذَع: فحش في الكلام. بَذاءَة/ قسەی قێزەو ناشیرین.

قَذَع: قَذَر. وَسَخ/ پیسی. چلکنی. پۆخلی. ئەنوایی. گەماری.

قَذَع. قَذِع: فاحِش. بَذيء/ بێئابڕوو. دەمشڕ.

قَذَفَ الشيءَ وبِهِ: رَمَى بِهِ. رَشَقَ/ فڕێی دا. هاویشتی. هەڵی دا. تووڕی دا.

قَذَفَ: أخرَجَ/ دەری دا. دەرییهێنا.

قَذَفَ: قاءَ. تَقَيَّأَ/ ڕشایەوە. هێنایەوە. هەڵیهێنایەوە.

قَذَفَ: ساق بالمجذاف. جَذَفَ/ سەوڵی لێدا. بە سەوڵ بەلەمی برد بەڕێوە.

قَذَفَ بـ: إتَّهَمَ بـ. رَمَى بـ/ تاوانباری کرد. قسەی شوێن خست.

قَذَفَ بالحَجَر: رَمَى. رَشَقَ/ بەردی هاویشت. بەردبارانی کرد.

قَذَفَ القنابل او المدافع: رَمى/ گوللە و بۆمبای هاویشت.

قَذَفَ في حَقِّهِ بالشَرّ: فَضَحَ. طَعَنَ/ ئابڕووی برد. قسەی ناشیرینی پێوت. جنێوی پێدا.

قَذَفَ المَني: انزَى المَني/ ئاوی هاتەوە.

قَذف: رَمي: رَشق/ هاویشتن. فڕێدان. تووڕدان. هەڵدان. تێگرتن.

قَذف: إخراج. إطلاق/ دەردان. دەرهێنان.

قَذف: قَدح. طَعن. تشهير/ قسەپێوتن. قسە شوێن خستن. ئابڕووبردن. جنێو پێدان.

قَذف: تَقَيُّوء إستفراغ/ ڕشانەوە. هێنانەوە.

قَذف: تجذيف/ سەوڵ لێدان. بەلەم لێخوڕین.

قَذف: خروج المني/ ئاوهاتنەوە.

قذف بالقنابل أو المدافع: رمي. رشق/ گوللەباران. بۆردومان. بۆمباباران.

قَنُور: نَيِّق. صَعبُ الارضاء/ بە قێز و بێز. هیچی بە دڵ نیە. دڵپێ نابێ.

قُنبُلَـة: مَقـذوف. كـل مایُرمَـی بـە/ فڕێدراو. هاوێژراو. مووشەك. گوللەتۆپ. بۆمبا.

قُنبُلَة مَدفَع/ بۆمبا.

قُنبُلَة يَدَويَة/ نارنجۆك.

قَرَّ: بَرَدَ/ ساردبوو. ساردبووەوە. ساردی کرد.

قَرَّ عیناً. قَرَّت عَينُهُ: إبتهج. سُرَّ/ گەشایەوە. دڵی خۆش بوو.

قَـرَّ: إسـتَقَرَّ في المكـان. ثَبَـتَ وسَكَنَ/ جێگیر بـوو. جێنشین بوو. نیشتەجێ بوو. تونتکەی گرت.

قَرَّ الرأيُ على أمرٍ او رأي. تَقَـرَّرَ. ثَبَتَ/ بڕیـار درا. ساخ کرایەوە.

قَرَّ. قَرَّرَ/ بڕیاریدا.

قَرَّ الكلامَ في أذنهِ: وَضَعَ فاهُ على أذنـهِ. ثَبَـتَ/ بڕیـار دراز ساخ کرایەوە.

قَـرَّتِ الدَجاجَـةُ: صَوَّتَت/ قیرانـی. قیرەقیری کـرد. گارانی. گارەگاری کرد.

قَرَّت بطنُهُ: قَرقَرَت/ سکی قوڕەی هات. قوڕانی.

لایَقَرُّ: لە قـرار: مضطَرِب. ضَجور. قَلِق/ شپرزە. پەشۆکاو.

قَرّ. قُرّ: قار. بَرد/ سەرما. ساردی.

قَرَأَ: طالَعَ/ خوێندیەوە.

قَرَأَ عليه الدرسَ: تَلاهُ/ پێی وتەوە.

قَرَأَ عليه السلام: حَيّاهُ. سَلَّمَ عليه. رَحَّبَ بِهِ/ سڵاوی لێکرد.

قَرَیَ الضَیفَ: إستضافَهُ/ میواندار‌ی کرد.

قُـرء: حَـیض. طَمـث/ پـۆنی. پیـسار. خـوێنی مانگانەی ئافرەتز مەمك.

قِرىً: ضِيافَة. ماتُقَدِّم للضيف/ میوانداری.

قِراءَة: مُطالَعَة/ خوێندنەوە. کۆشش.

قِراءَة: تِلاوة/ خوێندنەوە بە دەنگی بەرز.

قِـراءَةُ البَخـت: عِرافَـة. كِهانَـة/ فالگرتنـەوە. ڕەمڵ لێدان.

قِراءَةُ الكَفّ. قِراءَة خطـوط الكَـف/ دەستگرتنەوە. دەستخوێندنەوە.

قِراب: غِمد/ کالان. کێلان.

قِراب المسدس/ کیف.

قِـراب مـن جلـد البقـر/ گـاوس. مانگـاوس. مانگاوەس.

قَرابَـة: قُربَـى. القُـرب في الـرحم/ خزمایـەتی. خوێنشایەتی.

قَرابَـة زواج/ خزمایـەتی بـە هـۆی ژن و ژن خوازیەوە. کەسایەتی.

دَرَجَة القَرابَة/ پلەی خزمایەتی.

صِلَة القَرابَة/ پەیوەندی خزمایەتی.

قُرابَة: تقريباً/ نزیکەی.

قَراح: قَريح. صافٍ/ ڕوون. ڕووناك. خاوێن. پاك.

قُـراد: قُـرد. حَشَرَة تَمتَصُّ دم الحيـوان/ گەنـە. زیچ. سیچ. تەنپو. قرنو.

قَرار: قاع. قَعر/ بن. ناخ.

قَرار: حكم: مااَقَرَّ عليه الحُكم/ بڕیـار. بڕیـار دراو. بڕیاری کۆتایی.

قَــرار: إســتقرار/ دامەزرانبـوون. جێگیربــوون. هێوربوون. هێمنی.

قَرار: مُنخَفَض/ نشێو. نزمان.

قَـرار: مَقَـرّ. مُـستَقَر. مـسكن/ بنكـە. نـشینگە. ئارامگە. ماڵ. مەڵبەند.

قرار الأغنية: عبارة تتكرر في الأغنية/ سەندنەوە. بۆ سەندنەوە.

اهل القرار: أهل الحضر/ شاری. دانیشتوانی شار. شار و گوندنشین.

دار القرار: الآخرة/ جیهانی دووەم. ئەوە دنیا.

لاقرار له. لایَقَر له قرار/ بێ بڕیار. بێ ڕا. ڕای نیه. جێی باوەڕ نیه. باوەڕی پێناکرێ.

قُرار: ثُعاب: نَقاق/ قیرەقیرکەر. قوڕناویلکە.

قَرارَة: عُمق/ قوولی. قووڵیی.

قرارة: راسب. ثُفل/ نیشتو. خڵتە.

قُراس: قُريْس. نبات/ گیاگەزنە. نوسەنەک. نوسەکە.

قُراضَة: قُصاصة. قُلامَة/ بڕشت. سەرەپارچە. پارچە. لەت. کەرت.

قُراضَة: المُغتاب للناس/ پاشەملە دوو. بوختانکەر.

قَرّاع: نَقّار الخَشَب/ دارکونکەرە. دارەسمە.

قَرافَة: جَبّانَة. مَقبَرَة. مَدفَن/ گۆڕستان.

قِران: إقتران. زواج/ جووتکردن. هاوسەرگرتن. ژنهێنان و شووکردن.

قِران: إقتران. تَرابُط. إتِّصال/ تێکەڵی. بەیەکگەیشتن.

قَرُبَ منه إليه: إقترب منه. دَنا منه. قَرِنَ/ نزیکبووەوە. لێی نزیک بووەوە. توخنی کەوت.

قَرَّبَ إلى: أدنى/ نزیکی کردەوە.

قَرَّبَ بينهم: وَفَّقَ بينهم. صالحهم/ ئاشتی کردنەوە. ڕێکی خستنەوە. لە یەکی نزیک کردنەوە.

قَرَّبَ القُربان لله: قَدَّمَهُ. ذَبَحَ ذبيحَةً/ قوربانی دا. قوربانی کرد.

قُرب: کَثَب. دُنُو. مَقرَبَة/ نزیک. کن.

قُرب. بِقُرب. بالقُرب من: قريب منه/ لە نزیک. لە کن. نزیکە لێیەوە.

عن قُرب. عن کَثَب/ لە نزیکەوە.

قُربى. قَرابَة/ خزمایەتی.

قُربان: ذبيحة. کلا مایُقَدّم الى الله من ذبيحة/ قوربانی.

عيد القُربان: عيد الأضحى/ جەژنی قوربان.

قُربَة. قُربَة: عَمَل صالح/ کرداری باش.

قِربَةُ الماء أو اللبن: زِقّ. مَطرة/ مەشکە. کونگە. کوندە. جەوەنە. شیارۆک. مانگاوەس.

مزمار القِربَة: آلة نَفخ موسیقية/ زوڕنای مەشکە.

قَربوس السَرج: حِنو السَرج. القسم المقوس المرتفع من السرج/ کەللەزین. قەڵپۆز. بەرکۆ. زینکۆ.

قُرَّة: قُرارَة. راسب. ثُفل/ نیشتوو. خڵتە.

قُرَّةُ العَين: ماتُسَرُّ بِه العَين/ دڵخۆشکەرە. چاوڕوونکەرەوە. خۆشیهێن.

قُرَّة العَين: نبات مائي. جرجر الماء/ کووزەڵە.

قَرَت. قَرِتَ الدَمُ: جَمَدَ. تَخَثَّرَ/ خوێن مەیی. بەستی.

قَرِت: دَمٌ قارِت. دَمٌ مُتَجَمِد أو مُزرَق بين اللحم والجلد/ خوێنی مەییو. شێن هەڵگەڕاو لەژێر پێستدا.

قَرَّة: بَرد/ سەرما.

قَرَحَك قَرّحَ: جَرَحَ/ برینداری کرد. زامداری کرد. بڕی.

قَـرِحَ: تَقَرَّحَـكَ خَرَجَـت بـه قـروح/ برینـدار بـوو. برینـی لێهات. زامدار بوو. زامـی لێهات. هـەوی کرد.

قَرِح: مَقرَح. مُتَقَرِّح/ برینـدار. زامدار. زۆخاوی. هەوکردوو.

قَرحَة. قُرحَة. قَرح/ زام. برین. هەو. دومەڵ.

قُرد: قُراد: حَشَرَة تَمتَصّ دم الحیوانـات/ گەنە. زیج. سیج. ئەنیو. قرنوو.

قِرد: سَعدان: حیوان/ مەیمون. سەگسار.

قَـرَّرَ: بَـتَّ. فَـصل في أمـر. حَـسَمَ. جَـزَمَ/ بڕانیـەوە. کۆتایی پێهێنا.

قَرَّرَهُ: جَعَلَهُ یُقِرّ. حَمَلَهُ علی الإعتراف/ پێـی درکان. ڕاستی پێوتن قسەی لێدەرهێنا.

قَرَسَ. قَرِسَ البَـردُ: إشتَدَّ. کـان قارسـاً/ زۆر سارد بوو.

قَرَسَهُ البَردُ: جَمَّدَهُ. إشتَدَّ علیه/ سەرماتەزانی.

قَرَشَ: تَقَرَّشَ: جَمَعَ/ کۆیکردەوە. گردی کردەوە. کەڵەکەی کرد. نایەسەریەك. پەسەنەدەی کرد.

قَرَشَ. قَرَّشَ. إقتَرَشَ لِعیاله: إکتسب/ پـەیای کردن دەستی کەوت.

قِرش: غِرش/ قیرش. جۆرە دراوێکە.

قِرش: سَمَك کَوسَج. سمكٌ مفتَـرِس/ ماسی قیرش. درندە ماسی. کۆسە.

قَرَصَ لَحمَهُ: أخذه لَـویَ بأصبعه فآلَمَهُ/ نوقورچی لێگرتن قورنجی لێگرت.

قَرَصَ: لَدَغَ. لَسَعَ: پیا چزا. گەستی. پێوەی دا. گازی لێگرت.

قَـرَصَ الـشيءَ: قَطَعَـهُ/ بڕی. لێـی بڕی. قارسـی کرد.

قَرَصَهُ بِلسانِهِ: قـال لـه کلمةً مؤلِمَةً/ قسەی ڕەقی پێوت.

قَرص: مَصدَر قَرَصَ/ نوقورچ. قورنج.

قُرص: کل شيء مُستَدیر مُنبَسِط/ پەپکە. پانکەل. پانکەلە. خڕیان.

قُـرص: قُرصَـة خُبـز: رَغیـف/ کـولێرە. نـان. لەواشە. ئەستورك. خەپلە.

قُرص دَوائي: حَبّ. حُبوب/ حەب. دەنکۆڵە. دەنك.

قُرص دَوائي: حَبّ. حُبوب/ حەب. دەنکۆڵە. دەنك.

قُـرص النَّحل: قُـرص عَسَل: شَمع العَسَل/ شانەی هەنگوین.

قُرصـان: لـصوص البَحـر. قـاطع طریـق/ جەردەی دەریاز تەریدە. جەردە. ڕێبڕ.

قَرصَة: المَرَّة من قَـرَصَ/ نقورچ. نوقورچ. قورنج. نقوچ.

قُرصَـة خُبـز. رَغیـف/ کـولێرە. نـان. لەواشـەز ئەستورك. خەپلە.

قَرصَنَة سَرِقَة. مایرتکبُهُ القُرصان کالسَطوُ والسَلب/ دزی. دزێتـی. جـەردەیی. ڕێ بـڕی. تەریـدەیی. چەتەگەری.

قُرصـي الـشکل: مُـستَدیر. مُنبَـسِط/ خەپلـەیی. خڕیان. پانکەلە. پەپکەیی.

قَـرَضَ. قَـرَضَ: قَـضَمَ. أکـل. نَخَـرَ/ خـواردی. هەڵیکۆڵی. کلۆری کرد.

قَـرَضَ. قَـرَضَ: قَـصَّ/ پچڕی. قرتـانی. کرتـانی. بڕی.

قَرَضَ رِباطَهُ. قَرِضَ: مـاتَ/ مرد. گیانی دەرچوو. گیانی سپارد.

قـرَضَ الـشِعرَ: قالَـهُ/ هۆنراوەی وت. هەلبەستی وت.

قرَضَـهُ: مَدَحَـهُ. ذمَّهُ/ پیاهەلدا. بە باڵیا هەلدا. ستایشی کرد. زەمی کرد.

قـرض: نـظَمَ الـشِعر/ هۆنراوە دانـان. هەلبەست وتن.

قَرض. قِرض: سُلفَةٌ/ قەرز. وام.

قَرَطَ. قَرَّطَ: قَطَعَ قِطعاً صَغيرةً/ وردی کرد. جنی. لەتوکوتی کرد.

قـرَّطَ الفتيلَـةَ: نَظَّفَهـا/ پلیتەکـەی بـڕی. قرتـانی. ڕێکی خست.

قرَّطَ عليه: أعطـاه قليلاً قليلاً/ بەدەستەوە دایە. لێی گرتەوە.

قُـرط: حَلَـق. حِلْيَـةُ الأذن/ گـوارە. گـوهـار. ئەلقـەی گوێ.

قُرط: شُعلَةُ النار/ گڕی ئاگر. ڕووناکی ئاگر.

قُرط: عُنقود/ هێشوو. بۆشە.

قُرط: نبات البرسيم/ سێپەرە. سەمەن.

قِرطاس. قُرطاس: صحيفَةٌ. وَرَقَةٌ. وَرَق/ تیانووس. پەرە. کاخەز.

قِرطاســـي: بـــائع ادوات الكِتـابَـــةِ/ فرۆشـیاری (کەرەستەی نوسین. نوسینەمەنی).

قِرطاسِيَّة: أدوات الكِتابَـةِ/ کەرەسـتەی نووسـین. نووسینەمەنی.

قِرطَلَة: سَلَّةٌ/ قولینە.

قُرطم: نبات العُصفُر/ گیاگەزیە.

قُرطمان: نبات الحِمَّص الجبلي/ نۆکی کێوی.

قَرَّظَ: مَدَح بِحَقٍّ أو باطِل. أطرى/ پیاهەلدا. بەباڵیا هەلدا.

قَرَعَ: دَقَّ. طَرَقَ. خَبَطَ. ضَرَبَ/ لێی دا. پیاکێشا. کوتـای. ژەنـدی. لـە دەرگـای دا. زەنگـی لێـدا. تەپلی ژەن.

قَـرَعَ الـسَهمُ الغايَـةَ: أصـابَها/ لێـی دا. پێکـای. نیشانی شکان. بۆی دەرچوو.

قَرَعَ سِنَّهُ: حَرَقَها نَدَماً/ لە پەشیمانیدا ددانی خۆی کرۆشت.

قَـرِعَ: صَلِعَ. سَقَطَ شَعر رأسِهِ/ سەری ڕووتایەوە. تووکەکەی وەری.

قَرَّعَ: عَنَّفَ. وَبَّخَ/ لێی تووڕە بوو. سەرزەنشتی کرد. قسەی پێوت. پیاهەڵشاخا.

قَرع: دَقّ. طَرق. خَبط. ضَرب/ لێدان. پیاکێشان. کوتان. ژەندن.

قَرع: نَبات. ضَربٌ مِن اليقطين/ کولەکە. کولەکە سەنگەری.

قَرعَـة: دَقَّـة. خَبطَـة/ لێـدانێک. پیاکێـشانێک. کوتانێک.

قَرَعَة: قَرَع: مرض جلدي/ کەچەڵی.

قُرعَة: سَهم. نَصيب/ بەش. بەرکەوت.

قُرعَة: مايُلقيه لتعيين النصيب/ پشك. یانسیب.

ألقى القُرعَةَ/ پشکی (خست. فڕێدا. کرد).

قَـرَفَ. قَـرَّفَ: قَـشَرَ/ پـاکی کـرد. توێکڵەکـەی لێکردەوە.

قَرِفَ مِن: إشمأزّ. تَقَزَّزَ/ بێزی لێهاتەوە. دڵی لێ تێکەڵ هات. قێزی لێکردەوە.

قَـرَف: إشمِئـزاز نُفـور. كراهَـة/ بێزلێهاتنـەوە. دڵتێکەڵهاتن. قێزلێکردنەوە.

قَرِفان: مُشمَئِز/ بێزار. بێزلێهاتوو. قێزەون.

قِرفَة: قِشرَة/ توێکڵ. توێخ. کاژ. توێك.

قِرفَة الجُرح. قُرفَة: جُلبَة/ قەتماخەی برین.

قِرفَة: نوع من البَهار/ دارچینی.

قَـرفَصَ: قَعَـد القُرفُصاء/ هـەڵتوتا. هەڵتروشکا. هاتە سەر چیچکان.

قُرفُـصَى. قُرفُـصاء: جلـوس علـى الـرجلين/ هەڵتروشکان. هەڵتوتان. چیچکان.

قَرَقَـتِ الدَجاجَـةُ: صَـوَّتَت/ مریـشك. گـارانی. گارەگاری کرد. قرتەقرتی کرد.

قَرَقُ الدجاجَة: صوتها/ گارەگار. قرتەقرت.

قُرقُـب: عـصفور صـغير/ بـاڵندەیەکی بـچووکە وەك چۆلەکە وایە.

قَرقَنان. قَرقَنوف: سنجاب/ سمۆرە.

قَرقَرَ البطنُ او المَعدَةُ: صَوَّتَ/ سك قۆڕەی هات.

قَرقَـرَ الجَمَـلُ: هَـدَرَ/ وشـتر مڕانـی. مرقـانی. بۆڕانی.

قَرقَرَة المَعدَة او البَطن/ قۆڕەی سك.

قَرقَعَــة الاصــابِع: دَقّ الاصــابِع/ چــەقەنە. چەقەنەلێدان. بستەلێدان. پل تەقاندن.

قَرلى: طائر. السَمّاك. ابو الرقص/ ماسیگرە.

قَرَمَ: اكَلَ. قَـضَمَ/ قرتانی. کرتانی. بە شێنەیی خواردی.

قَرم: سَيِّد/ گەورە. گەورەپیاو.

قَرمَة الشجرة: مابَقيَ من أسفل جذعها إذا قُطِعَت/ کۆتەرە. بنەکۆتەرە. بنەدار. موور.

قَرمَدَ: كَسا أو طَلا بالقَرمَد/ کاشی کرد. خشت ڕێژی کرد. ڕووکەشی کرد بۆ جوانی.

قَرمَد: جِص/ گەچ. تـەراو. سـواخ. ڕووکەشـی دیوار. دیوارپۆش.

قِرمِز: صَبغ أحمَر/ ڕەنگی سوور. ئاڵ.

قِرمِزي: كان بلون القِرمِز/ ڕەنگ سوور. ئاڵ.

قَرمَطَـة: التَقـتير والتَـضييق/ دەسـت گرتنـەوە. ڕژدی. چرووکی. تەسك کردنەوە. کورتکردنەوە.

قِرميد. قِرميدة: آجُر/ خشتی سوور.

قَرَنَ. زاوَجَ. رَبَطَ. ضَمَّ. وَصَل/ دوو شتی گەیان بە یەك. جوتی کردن. بەستنی بە یەکەوە.

قَرن: مَصدَر قَرَنَ. مُزاوَجَة/ جوت (بوون. گرتن). بەیەك (گەیشتن. گەیاندن).

قَرن: ذؤابَة المرأة/ پرچ.

قَرن: رأس الجَبَل. أهل زمـان واحـد/ هـاو (تەمەن. چەرخ. چاخ).

قَرن: مِئة سَنَة/ سەدە. چەرخ. چاخ. سەد ساڵ.

قَرن الحيوان: الزيادة التي تَنبُت في رأس الحيـوان/ شاخ. قۆچ. ستۆ. شەقۆن. ئەسرۆ.

قَرن الحشرة. قَرن إستِشعاري: زُباني. مَلمَس/ شاخ.

قَرن الشمس: أول مايبد و منها/ شەبەقی. تیشکی سەرەتای خۆرهەڵاتن.

قَرن الفول وامثاله: غلاف الحَبّ. سِنفَة/ پیلە.

قَرن لتسهيل لبس الحِذاء: لَبّاسَة الحِذاء/ کەرەتە.

وَحيـد القَـرن: حيـوان/ ن یـەك شـاخ. یـەك قـۆچ. کەرکەدەن.

قِـرن: نظـير. مثيـل. نِـدّ/ هـاو. وەکو. لەیەکچوو. یەکسان. چونیەك.

قَرنَبي: خُنفُساء طويلَة القرنين/ قالۆنچەی شاخ درێژ.

قَرنيط: نَبات/ گوڵ کەلەرم.

قُرنَـة: زاويَـة. ناصيَة/ قوژبن. گۆشـە. سووچ. قوڕنە.

قَرَنفُل: نبات/ مێخەك.

قَرني: كـالقَرن أو منهُ/ شاخى. قۆچى. له شاخ ئەكا. له شاخ دروستكراو.

قَرني: من الفصيلة القرنيَة من النبات/ پيلەدار.

قَرنيَة العَين: الجزء البارز الشفاف من العين/ گلێنه. گلێنەی چاو.

قَرو: حَوض/ حەوز. حەوزی درێژکۆلە.

قَروانَة: إناء كبير/ لەگەن. تاس. تەشت. ساج.

قَـرَوي: مـن سـكان القُـرى/ گوندنـشین. دێهـاتی. لادێیی.

قَريب: دانٍ. مجاور. ضد بَعيد/ نزيك. نێزك.

قَريب: نَسيب. ذو القُربَى/ خزم. خوێش. كەس.

قَريب قَريب الحدوث. وشيك/ لەسـەر ڕوودانـه. لەسەرپێيه.

قَريبُ العَهد. قَريب عَهد بـ: حـديث/ تازەكـار. ڕانەهاتوو. فێرنەبوو. نەشارەزا.

قَريباً: عَمّا قَريب/ بەم نزيكانه. هاكا.

منذ عهد قريب: منذ فترة قريبة/ لـەم نزيكانـەدا. لەم چەندانەدا.

قَريَة. : قَريَة: ضَيعَة/ گوند. دێ. لادێ.

قَريَة. قَريَة النَمل: مملكة النَمل/ شارەمێروله.

قَريَة الانصار: المدينة. يَثرِب/ شاری مەدینه.

قَريح: جَريح/ برينداو. زامدار.

قَريحَة: طَبع/ خو. ڕەوشت. ئاوەز.

قَريحَـة: موهِبَـة. مَلَكَـة يَقتَـدِر بهـا الانـسان علـى الإجادَة/ بەهرە. توانا. لێهاتوویی.

قَريـر العَـين: مَسرور/ شـاد. شـادمان. ئاسوودە. خوشنود.

قَريض: شِعر/ هۆنراوە. هەڵبەست.

قَرين: زَوج. بَعل/ مێرد. هاوسەر.

قَرين: رفيق. خَدين/ هاوڕێ. برادەر.

قَرين: مقرون بـ. مُتَّصل. مزدوج/ دوولـه. جووت. بەستراو پێکەوە.

قَرينَة: زوجَة/ ژن. هاوسەر. خێزان. هاوەل.

قَرينَة: دليل. إستنتاج/ بۆچوون.

قَرينَـة: حـال. إفـتراض. إحتمـال/ مەزنـدە. گریمانەیی.

قَرينَة: علاقة صلَة/ پەيوەندی.

قَرينَـة الكَلام: مايُصاحِبهُ ويَـدُل علـى المـراد بـه/ مەبەست.

قَـزُّ: تَقَـزُّز. إشمـأزّ. قَـرَف/ قێزی هاتـەوه. بێـزی لێكردەوە. دڵی تێكەڵهات.

قَزّ: تَقَزُّز. إشمئزاز/ قێزهاتنەوه. بێزلێكردنەوه.

قَـزّ: حريـر/ ئاوريـشم. هەوريـشم. هەفريـشم. هەفروشم. هەورمێش. ئارموش.

دودة القَزّ: دودة الحرير/ كرمی ئاوریشم.

جَوزَة القَـزّ: فَيلَجَـة/ قۆزاخـەی كرمـی ئاوریشم. پیلە.

قَزّاز: بائع القَزّ/ ئاوریشم فرۆش.

قَـزَح: قَـوسُ قَـزَح/ پەلكەزێرینـه. كۆلكەزێرینـه. پەلكەڕەنگینه.

قُزَحيَـة العَـين: حَدَقَـة. الجـزء الملـون مـن العـين/ ڕەشێنه. ڕەشێنەی چاو.

قَـزَز: قَـرَف. أثـار الاشمئـزاز/ دڵـی تێكـەڵ هێنـا. قێزی هێنایەوه.

قَـزَع: سَحاب مُتَفَـرِق/ پەڵەهـەور. هـەوری بڵاو و تەنك.

قَزَع. قُزعَة: خُصلَة شَعر/ پارچەقژ.

قَزَل: عَرَج/ شەلین. لەنگین.

قَـزَم: قـصير القامـة/ كورتـەبالا. كورتـە بنـە. بالابستە. قزم. گرگن. گولە. كوڵەبنە.

قَزَمَة: صاقور/ پاق.

قَسّ قِسّيس: كاهِن/ قەشە.

قَسا: صَلُبَ/ ڕەق بوو. پتەو بوو. سەخت بوو. جێڕ بوو.

قسا مَعَهُ وعَلَيه: عَنَفَ. تَشَدّدَ/ دڵڕەق بوو لەگەڵی. دڵڕەقی نواند.

قَسّى: أقسى. صَلَّبَ/ ڕەقی كرد. ڕەقی نواند. دڵڕەق بوو.

قَسام: قَسامَة: حُسن/ جوانی. شۆخی.

قَسّام: مُقَسِّم/ دابەشكەر. دابەشنامە. بەشنامە.

قَسّام شرعي: قانوني/ دابەشنامەی یاسایی. بەشنامەی یاسایی.

قَساوة. قَسوة/ سەرسەختی و دڵڕەقی.

قَسَرَ على: إقتَسَرَ على. أكرَهَ. أرغَمَ/ زۆری لێكردن ناچاری كردن بە زۆر پێی كرد.

قَسر: إكراه. إرغام/ زۆرلێكردن. ناچاركردن. بەزۆر پێكردن. زۆرملی.

قَسري: كُره. إرغام/ ناچاری. زۆرملێ. نابەدڵ.

قَسَطَ: اقسَطَ: كانَ عادِلاً/ بەداد بوو.

قَسَّطَ: فَرّقَ. وَزّعَ/ بڵاوی كردەوە. لە یەكی جیاكردەوە.

قَسَّطَ الدَّينَ: جَزّأَهُ/ قەرزەكەی كرد بە ژەم. بەشبەشی كرد. پارچەپارچەی كرد.

قَسَط: مرض تَصَلُّب وتَيَبُّس في الأعضاء/ جومگەی ئەندام وشك بوونەوە. ڕەقهەڵاتن.

قِسط: حِصّة. نَصيب/ بەش. بەركەوت. پاژ.

قِسط: جُزء مُقَسَّط من الدَّين/ ژەم. ئیستی قەرز.

قِسط: رزق/ دەرامەت. دەسكەوت. گوزەران. تفاقی ژیان.

قِسط: عادل/ بەداد.

قِسط: عَدل/ داد.

قِسط: مِقدار. كَمِيّة/ بڕ. ئەندە. چەندێتی.

قِسط: ميزان/ ترازو.

على قسط كبير: جداً. للغاية/ زۆر. یەكجار زۆر.

قُسطاس. قِسطاس: ميزان/ تەرازو.

قَسطَر: أنبوب القسطرة/ لوولەی میزكردن.

قَسطَرَ. عملية القسطرة: تشخيص مرض القلب/ قەستەرە. دۆزینەوەی نەخۆشی دڵ. كلۆ دۆزە.

قَسطَل: أنبوب الماء. ماسورة/ لوولەی ئاو. بۆری ئاو. سۆندە.

قَسَمَ. قَسَّمَ: وَزّعَ. خَصّصَ. فَرّقَ/ بڵاوی كردەوە. دابەشی كرد.

قَسَمَ: شَطَرَ. نَصَّفَ/ كەرتی كرد.

قَسَّمَ الدَّهرُ القَومَ: فَرّقَهُم/ ڕۆژگار بڵاوەی پێكردن. پەرەوازەی كردن.

قَسَمَ. قَسَّمَ عدداً على آخر/ ژمارەیەكی دابەشكرد بەسەر ژمارەی تردا. دابەشی كرد.

قَسَم: يَمين/ سوێند.

قَسَماً بـ: حَلَفَ بكذا/ سوێند ئەخۆم بە. سوێند بێ بە.

قَسم: قِسمَة. تَقسيم/ دابەشكردن.

قِسم: جُزء/ پارچە. كەرت.

قِسم: حِصّة/ بەش. پاژ.

قِسم: فرع أو شعبة من إدارة/ لق. بەش. كەرت. یەكە.

قِسم من بلاد: مِنطَقَة. مقاطعة/ ناوچه. هەرێم. پارچەیەکی وڵات.

قسم من كتاب. جزء منه/ بەشێك لە كتێب.

قِسمَة: تقسيم. تَجزِأة/ دابەشبوون. دابەشكردن. كەرتبوون. لەتبوون.

قِسمَة: نصيب. قَدَر/ بەركەوت. چارەنووس. سەرنووشت.

قِسمَة: عملية القِسمَة في الحساب/ دابەشكردن.

قابل للقِسمَة: يَنقَسِم. يُمكن التجزئة/ دابەش ئەكرێ.

غير قابل للقِسمَة: لايَنقَسِم. لايَتجَزأ/ دابەش ناكرێ.

قابلية القِسمة: خاصيته التجزئة/ بارىبەش. دابەشبوون. توانايى كەرت بوون.

قَسوَة: قَساوَة. شِدَّة. عُنف/ دڵرەقى. بێبەزەیىیەتى. ستەم. توندوتیژى.

قَسِي. قاس/ سەختكىر.

قِسيس: قَس. كاهِن/ قەشە. كەشە.

قَسيم: نَصيب/ بەش. بەركەوت. پاژ.

قَسيم: مُقاسِم. شريك. مُشارِك/ بەشدار. خاوەن بەش.

قَسيمَة: بِطاقَة/ بليت. كۆبون.

قَسيمَة. قَسيم: جميل/ جوان. ئێسك سووك.

قَشَّ: جمع من هنا وهُناك/ كۆیكردەوە. مرومۆش ئەكا. لەملاو لەولا ئەماشێتەوە.

قَشَّ: كَنَس. مَسَحَ/ گسكى دا. پاكى كردەوە.

قَشَّ من المرض: بَرأَ/ لە نەخۆشى چاكبووەوە.

قَشَّ النبات: يَبَس/ وشك بووەوە. وشكى كرد.

قَش: تِبن. اليابس من النبات/ پووش. كا. پەڵم. پەڵاش. پووش و پەڵاش.

قُشادَة: قِشدَة. رَغوَة. طُفاحَة/ كەف. توێژ. سەرتوێژ. سەرانسەر.

قَشّارَة: مِقشَرَة. اداة التقشير/ پاككەر. پاكەر.

قُشارَة: مايُنتَزَع من الشئ المَقشور/ توێكڵ. توێكڵى لێكراوە. توێخ.

قِشاط: حِزام. سَير/ قەیاسە. قایش قەیاسە.

قُشاعَة: بَلغَم. نُخامَة/ بەڵغەم.

قَشَبَ. قَشَبَ الطعامَ بالسم: خَلَطَهُ بِه/ خواردن ژارى تێكرد. ژاراوى كرد.

قَشَبَهُ السُمَّ: سَقاهُ إيّاهُ/ ژارى دایە. دەرمانخواردى كرد. ژارخواردى كرد.

قَشَبَ عليه: إفتَرى. غَيَّرَه وعابَهُ/ بوختانى بۆ كرد. تانوتى لێدا. قسەى پێوت. پاشملە قسەى پێوت.

قَشِبَ: تَقَشَّبَ الجِلدُ: تَقَشَّرَ/ پێست زبر بوو. قلیشا.

قِشب. قَشب: سَمّ/ ژار. ژەهر.

قِشب: صَدَأ الحديد/ ژەنگ.

قَشَب: خُشونَة مع تَقَشُّر في الجلد والشَفَة/ زبرپوونى پێست. قلیشاوى.

قَشَّة: واحِدَةُ القَش/ پووشێك.

قِشَّة: قِردَة أو ولَدها/ دەڵە مەیمون. بەچكەى مەیمون.

قِشَّة: خُنفُساء/ جۆرێكە لە قالۆنچە.

قَشَدَ: قَشَطَ. نَزَعَ الرَغوَة. أزال القِشدَة عَن/ (توێژ. كەف. سەرانسەر. سەرتوێژ)ەكەى گرت.

قِشْدَة: الزُبْدَة/ کەرە. سەرتوێژ. قەیماغ. سەرتوو.

قَشَرَ. قَشَّرَ: نَزَعَ القِشْر/ پاکی کرد. توێکڵەکەی لێکردەوە.

قَشَرَ. قَشَّرَ الذُرَة وأمثالها: نَزَعَ حَبَّها/ هەڵیوەران. دانەکان. پڕوانی.

قَشَّرَ الجَوزْ: أخرَجَ اللُبّ/ ناوکەکەی دەرهێناو شکانی و کاکڵەکەی دەرهێنا.

قَشْر: تَقشير. تَفليس/ پاککردن. توێکڵ لێکردنەوە.

قِشْرَة. قِشْر: غِطاء الشيء/ توێکڵ. بەرگ. تێکڵ. تێڵکل.

قِشْرَة الثَمَرَة: جِلد. بَشَرَة أو لِحاء الثَمرة/ توێکڵ.

قِشْرَة الجُرح أو القُرحَة: جُلبَة/ قەتماخە.

قِشْرَة الحُبوب: غِشاء الحَبّ/ قەلاس. سوس. پێڵە.

قِشْرَة الرأس: هِبرِيَة/ کرێش.

قِشْرَة السَمَك: حَرشَ. فلوس/ پوولەکە ماسی.

قِشْرَة الحَيَّة: مِسلاخ/ کاژ. کاژی مار.

قِشْرَة الجسم: جِلد/ پێست.

قِشْري: قِشريات. حيوان قِشري: قِشريات/ توێکڵدار. توێکڵدارەکان.

قَشَّشَ: قَشَّ. جمع من هنا ومن هناك/ کۆی کردەوە. مرومۆشی کرد. لەملاو ئەولا ئەماشێتەوە.

قَشَطَ: نَزَعَ/ لێیکردەوە. دای ماڵی.

قَشَطَ القِشدَة وأمثالها: أزالَها/ توێژەکەی گرت. کەفەکەی گرت.

قَشَطَ: كَشَطَ. سَحَجَ/ کڕانی.

قَشَطَ: سَلَبَ. نَهَبَ/ تالانی کرد. دزی. هیچی نەهێشت. ماڵیەوە.

قَشط: نَزع/ لێکردنەوە. داماڵین.

قَشط: كَشط. سَحج/ کڕاندن. داتاشین.

قِشطَة اللَبن وامثاله: قِشدَة/ سەرتوێژ. کەرە. قەیماغ. سەرتو. سەرتڵ.

قَشَعَ: انقَشَعَ. بَدَّدَ. فَرَّقَ. شَتَّتَ/ بڵاویکردەوە. لایبرد. ڕەوانیەوە.

قُشَعرِيرَة: رَعدَشة. بُرداء/ لەرز. لەرزین. موورچڕک. تەزوو.

قَشعَم: مُسِنّ/ پیر. بەساڵاچوو.

قَشعَم: صغير الجسم/ بوودەڵە.

قَشعُوم: قُراد/ کەنە.

قَشِفَ. قَشُفَ: ساءت حالُهُ. ضاقَ عَيشُهُ/ گوزەرانی تێکچوو. دەستی کورت بوو. کەسا ژیا.

قَشَم: فَرط الشَهوَة الى الطعام/ تێرنەخواردن. زۆرخۆری.

قَشيب: جديد. نظيف. مصقول. مَجلو. جَذاب/ تازە. نوێ. پاك. خاوێن. ساف. لووس.

قُشيش: لُقاطَة. كُناسَة. فَضَلات/ گژوگیای وشکەوەبوو. خۆڵ. گسکدراو. پاشماوە.

قَشيش: حَفيف الأفعى/ فیشکەی مار.

قَصَّ: قَصَّصَ. قَطَعَ. جَزَّ/ بڕی. بڕیەوە. لێیکردەوە. تاشی.

قَصَّ: قَصَّصَ. شَذَّبَ. قَلَمَ/ مەلی پاچی.

قَصَّ: رَوَى. حَكَى. سَرَدَ/ گێڕایەوە. باسی کرد.

قَصَّ أثَرَهُ: تَقَصَّصَ أثَرَهُ. إقتَصَى أثَره. تَتَبَّعَهُ/ شوێنی کەوت. شوێن پێی هەڵگرت.

قَصّ: قَطع. جَزّ/ بڕين. بڕينەوە. لێكردنەوە. تاشين.

قَصّ: تشذيب. تقليم/ هەڵپاچين.

قَصّ: سَرد. رواية. إخبار/ گێڕانەوە. باسكردن.

قَصّ: سَرد. رواية. إخبار/ گێڕانەوە. باسكردن.

قَصّ: قُصاصة. ماقُصّ. عظم الصدر/ كۆڵەكەی سنگ. پەراسوو بەند.

قَصا: قَصِيَ. بَعُدَ. تَباعَدَ/ دوور بوو. دووركەوتەوە.

قَصا. قَصاء: قَصْو. بُعد/ دووری.

قَصّاب: جزّار/ گۆشت فرۆش. سەربڕ. قەساب.

قَصّاب: الزمّار. النافخ من القصب/ بلوێرژەن. شمشاڵ ژەن. دووزەلە لێدەر.

قِصابة: جِزارة/ قەسابی. سەربڕین. گۆشت فرۆشتن.

قُصابة: قَصيبة. خصلة من الشعر/ پرچ.

قُصار. تقصير.

قُصار: كَسَل/ تەمەڵی. تەوەزەلی.

قُصار. قُصار. قُصاري: جُهد. أقصى. غاية/ توانا. لەوپەڕی توانا. درێغی نەكردن.

قُصار الأقمشة: مُبَيِّض/ سپیكەرەوە.

قَصّاص: مؤلف الروايات/ چیرۆكنووسین.

قَصّاص: راوٍ. حاكٍ. الذي يقرأ القصص في المجتمعات/ حیكایەت خوان. چیرۆكڤان.

قَصّاص: مُقتَصّ الأثر. مُقتَفي. مُتتَبِّع/ شوێنكەوتوو. شوێن پێهەڵگرتوو.

قَصّاص الغنم والدواب: جَزّاز/ سەربڕەوە. ئاژەڵ بڕەوە. خوری بڕەوە.

قِصاص: عقاب. جزاء. مُعاقَبة. إيقاع العقاب/ سزا. سزادان. سزا پێگەیاندن.

قِصاص: إنتقام. ثأر/ تۆڵە. تۆڵەسەندنەوە. تۆڵەكردنەوە.

قُصاصة: ماقُصّ/ بڕاو. بڕشت. سەرەپارچە.

قُصالة: قُشاشة. قُصامة/ نەرمی. ناسكی. قرچۆكی.

قَصّال: قاصل. قاطع. مِقصَل/ تیژ. بڕەر. بڕندە.

قُصالة القمح. قَصَل. قُشّ. تِبن/ پووش. كا. كۆزەر.

قُصامة: قُصالة. قُشاشة/ نەرمی. ناسكی. قرچۆكی.

قَصَبَ: قَطَعَ/ بڕی. جنی. پارچەپارچەی كرد. كوت كوتی كرد.

قَصَبَ: طَرَزَ. نَعَتَ/ چنی. بە ریز داینا. ڕازاندیەوە.

قَصَب: نبات مائي. يَراع/ قامیش. ژاژ. چیتك. لەوەن. نەی. لەڤەن.

قَصَب السكّر. قَصَب المَصّ/ قامیشی شەكر. نەی شەكر.

قَصَب: كل عظم مجوف ذي مُخّ. عظام اليدين والرجلين/ ئیسقانی لوولە. هۆڵۆل.

حقل القَصَب. مكان يكثر فيه القَصَب/ ژاژەڵان. ژاژزار. قامیشەڵان.

قَصَبٌ فارغ. مُجوَّف/ نەیجوو.

قَصَبٌ مملوء/ نەیچە.

قَصَبة: يَراعة/ قامیش. ژاژ. چیتك. لەوەن. نەی.

قَصَبة: بلدة. مدينة صغيرة/ شارۆچكە. شارۆكە. بازێڕۆك.

قَصَبَة: مزمار. آلة نفخ موسيقية/ شمشاڵ. نەی. دووزەلە.

قَصَبَة البلاد: عاصمة/ پایتەخت.

قَصَبَة الأنف: عَظمَة/ کۆڵەکەی لووت.

قَصَبَة الساق. قَصَبَة الرجل/ لولاق.

قَصَبَة المرىء: مجري الطعام/ سووڕێنچە. لوولەی خواردن. خڕخڕاگە.

قَصَبَة الرئة. قَصَبَة هوائية. مجرى التَنَفُّس/ بۆری هەوا. کرکراگە.

قَصَبَة: مقياس للطول/ پێوانەیەکە ئەکاتە (٥,٥ یارد).

قُصَّة ناجية. شعر مُقدم الرأس/ پەرچەم.

قُصَّة: خُصلَة شعر/ قژ. پارچە قژ. ليسپ. قول.

قِصَّة: رِوايَة. حِكايَة/ چیرۆک. ڕاز. بەسەرهات. داستان. دیرۆک. ڕۆمان. ڕووداو.

قَصَدَ إلى: تَقَصَّدَ. تَوَجَّهَ. ذَهَبَ/ چوو. چوو بۆ لای.

قَصَدَ: نَوى. أراد. عَنى/ ویستی. نیازی بوو. وای نیاز بوو. مەبەستی بوو. بڕیاری دا.

قَصَدَ الى: سَعى. بَحَثَ. فَتَّشَ/ هەوڵی دا. کۆششی کرد. هەڵپەی کرد.

قَصَدَ: إقتَصَدَ. إدَّخَرَ. تَوَسَّطَ بين الإفراط والتقتير/ دەستی گرتەوە. پاشەکەوتی کرد.

قَصَدَ قَصدَهُ: حَذا حَذوَه. نَحا نَحوَهُ/ لاسایی کردەوە. پەیڕەوی کرد. وەکو ئەوی کرد.

قَصد: نِيَّة. غَرَض. غايَة/ نیاز. خواست. داخوازی. ئارەزوو. مەبەست. ئامانج.

قَصد: إعتدال. ضد إفراط/ مامناوەندێتی.

قَصد.. إقتصاد/ مەبەست، ئابووری.

رَجُل قَصد: لاجَسيم ولا نحيف/ پیاوی مامناوەندی نە قەڵەو نە لەڕ.

طريق قَصد: مستقيم/ ڕێگەی ڕاست.

بِقَصدِ كذا: لِغَرَض/ بەو مەبەستەی. بە مەبەستی ئەوەی. بەو نیازەی. بۆ ئەوەی.

قَصداً: عَمداً. عَن قَصد/ بە ئارەزوو. بە هەوەس. بە ئەنقەس.

بغير قَصد/ بێ نیاز. بێ مەبەست.

قَصدي: مَقصود. عَمدي/ هەوەس. ئەنقەس. مەبەست لێبوو.

قَصدير: صفيح. عُلبَة/ تەنەکە. قوتوو.

قصدير للحم وطلاء المعادن/ قەڵایی.

قَصَرَ على: حَصَرَ. حَدَّ. قَيَّدَ/ لەسەر یەک مەبەست بوو.

قَصَرَ: حَبَس: گلی دایەوە. دەستی بەسەراگرت.

قَصَرَ عن الهَدَف: لم يَبلُغهُ/ کورتی هێنا. نەی پێکا. لێی نەدا. نەی گەیشتێ.

قَصَرَ عن. قَصُرَ: عَجَزَ عن. تَوانى/ بۆی نەکرا. پێی نەکرا. لە توانایا نەبوو.

قَصَرَ عَن. قَصُرَ: كَفَّ. تَرَكَ. إمتنع/ دەستی لێ هەڵگرت. وازی لێهێنا. لێی گەڕا.

قَصَّرَ. قَصَرَ: جَعَلَهُ قَصيراً/ کورتی کردەوە. لە کورتی بڕیەوە.

قَصَّرَ: تَخَلَّفَ عن الدفع أو المُثول. أهمَل/ کەمتەرخەمی کرد. سەرپێچی کرد. ئامادە نەبوو. نەیدایەوە.

قَصَّرَ: بَيَّضَ/ سپی کردەوە.

قَصَّرَ: قَلَّلَ. أخسَ/ کەمی کردەوە. لێی بڕی.

قَصَّرَ: أهمَلَ. تَوانَى/ کەمتەرخەمی کرد. پشت گوێی خست.

قَصَّرَ في إمتحان أو درس: رَسَبَ/ دەرنەچوو. مایەوە.

قَصُرَ: ضد طالَ/ کورت بوو. کورت بووەوە. کورتی هێنا. هەڵچوو.

قَصر: تقصير. إهمال. تفريط/ کەمتەرخەمی.

قَصر: قُصور. كَسَل/ تەمەڵی. تەوەزەلی.

قَصر: بَيت أو مَنزِل كَبير فخم/ کۆشک.

قَصر.. تقصير/ کەمتەرخەمی.

قَصر: قُصارى. قُصار: جُهد. أقصى. غايَة/ توانا. ئەوپەڕی توانا. درێغی نەکردن.

قِصَر: ضِد طول/ کورتی.

قُصَرَة: مايَبقى في الغِربال من النخالة/ سەرکۆزەر.

قَصَرَة: زِمكى الطائر/ قنگەجۆڵە.

قَصري: حَصري/ لە چوارچێوەیەکی دیاریکراوا. یەک مەبەست. تایبەتمەندیتی.

قَصَّ قَصّ: قَطَعَ. جَزَّ. شَذَّب. قَلَّمَ/ کەرتی کرد.

قَصّ: الصَدر أو عظم الصَدر/ سنگ. کوڵەکەی سنگ. پەراسوبەند.

قَصَص: قِصَّة. رِوايَة. حكايَة/ چیرۆک. ڕاز. بەسەرهات. داستان. نیرۆک. ڕۆمان. ڕووداو.

قَصَص: قُصاصَة. مقَص/ بڕاو. بڕشت. سەرەپارچە.

قَصَصي: طَعَن/ هاڕی. وردی کرد. کەرەی کرد.

قَصَعَ. قَصَعَ الجُرحُ بالدَم: إمتلأ/ خوێنی تێزا.

قَصعَة: جَفنَة/ تەشت. لەگەن. قسعە.

قَصَفَ: كَسَرَ/ شکانی.

قَصَفَ: أطلق القنابل أو المدافع/ بۆردومانی کرد. گوللەبارانی کرد.

قَصَفَ الرَعدُ: إشتَدَّ صَوتُه/ هەور گرمانی. گرمەی هات.

قَصَفَ: عَربَدَ. مَرِحَ. أقام في أكل وشرب/ ڕایبوارد. بە ڕابواردن و خواردنەوەو خۆشڕێتییەوە خەریک بوو.

قَصِفَ: كان قَصِفاً هَشاً/ ناسک بوو. قرچۆک بوو.

قَصَفَ: كَسَرَ/ شکانی. لەت و کوتی کرد.

قَصِف: هَش/ شکست. قرچۆک. زوو هەڵئەوەری. ناسک.

قَصف: قَذف بالقنابل أو المدافع/ بوردومان. تەقینەوە. گوللەباران.

قَصف: كَسر/ شکان. نوشتانەوە. چەمانەوە.

قَصفُ الرَعد: دَوِيّ/ گرمەی هەور.

قَصف. قُصُوف: عَربَدَة. لَهو/ ڕابواردن. خواردنەوە و خۆشڕێتی.

قَصَلَ: قَطَعَ/ بڕی. دروویەوە.

قَصَلَ عُنُقَهُ: ضَرَبَها/ لە ملی دا. ملی پەڕان.

قَصل. قَصَل: قُصالَة. تِبن. قَش/ پووش. کا. کۆزەر.

قَصَمَ: كَسَرَ/ شکانی.

قَصَمَ ظَهرَهُ: حَطَمَهُ/ پشتی شکان. زیانی پێگەیان.

قَصم: قَصيم. هَش. قَصِف/ شکست. قرچۆک. زوو هەڵئەوەری. ناسک.

قَصو. قُصُو: بُعد/ دووری.

قُصوى.. أقصَى/ دوورترین.

قُصور: تَقصير. إهمال. تَفريط/ کەمتەرخەمی. فەرامۆش کردن. پشتگوێ خستن. درێغی کردن. گوێ پێنەدان.

قُصور: سِنّ القُصور. حداثة. صِغَر/ تەمەنی منداڵی.

قُصور: عَجز/ نەتوانین. لە توانادا نەبوون.

قُصور القلب: عجز القَلب/ بێهێزی دڵ.

قُصور: كَسَل/ تەمەڵی.

قُصور: جمع قَصر.. قَصر/ كۆشك‌و تەلار.

قُصوف: قَصف. عَربَدَة. لهو/ ڕابواردن. خواردنەوە و خوێنڕێتی.

قَصِيَ: قَصا. بَعُدَ/ دووركەوتەوە. دوور بوو.

قَصِّي: بَعيد/ دوور.

قَصيد: قَصيدَة: شِعر. مَنظومَة/ هۆنراوە.

قَصير: ضد طويل/ كورت.

قَصير الباع: عـاجِز. واهِـن. ضـعيف/ دەستكورت. بێ دەسەڵات.

قَصير الأجَل. قَصير الأمل/ ماوە كورت.

قَصير القامَة/كورتەباڵا. كورتە بنە.

قَصير العُمر/ تەمەن كورت.

قَصير بدين: قَصير ممتلىء الجسم/ كرگنە. قەڵەو و كورت.

قَصيم: قَصِم. هَشّ. قَصِف/ شكست. قرچۆك. زوو هەڵئەوەریٚ. ناسك.

قَضّ: هَدَم/ ڕووخانی. ڕمانی. خاپووری كرد.

قَضّ: قَلَعَ/ هەڵیكەن.

قَضّ: ثَقَبَ/ كونی كرد. سمی.

قَضّ عليه المَضجَعُ: خَشُنَ/ جێگەكە ڕەق بوو. قۆقز بوو.

قَضّ: قَضَض. صِغار الحَصى/ بەردی هاڕاو. وردە بەرد. چەو. زیخ.

جاء القومُ قَضُّهُم او قَضَّهُم: جميعهم/ هەموویان هاتن.

قَضَى الأمرَ لـه او عليـه: اوجَبَـهُ والزمه بـه. فَـرَض/ پێی ڕاگەیان كە ئەبی بیكا. بەجێی بێنێ.

قَضَى الأمرَ اليه: ابلَغَه/ پێی ڕاگەیان. پێی وت.

قَـضَى بَـيـنَ الخَـصمَين: حَكَـمَ وفَـصَلَ/ كەوتـە بەینیانەوە. لە یەكی كردنەوە. ڕێكی خستنەوە. ئاشتی كردنەوە.

قَضَى الحاجَة: تَغَوَّطَ/ گوی كرد. سەرئاوی كرد. دەستی بە ئاو گەیان.

قَضَى الصلاة: اداها/ نوێژی كرد.

قَضَى على: ابلا. ازال. قَتَل. سَحَقَ. اخمَدَ/ لە ناوی برد. فەوتانی. دای مركانەوە. كۆتایی پێهێنا.

قَضَى العمل: انجَزَ. اتَمَّ. انفَذَ/ تـەواوی كرد. بردە سەر. لێبووەوە.

قَـضَى العَجَبَ مـن. قَـضى منـه العَجَب: تَعَجَّبَ منـه/ سەری سوڕما. سەرسام ما.

قَضَى: قَدَّرَ بقـضاء وقَـدَر. إستوجَبَ/ بەستیەوە بە چارەنووسەوە. چارەنوس وابوو. ناچاری بوو.

قَـضَى: لَبّـى. أجـاب/ بـە دەنگـەوە هـات. بـەجێی هێنا.

قَضَى العمل: انجَزَ. اتَمَّ. انفَذَ/ تەواوی كرد. بردیە سەر. لێبووەوە.

قَضَى: قَدَّرَ بقضاء وقَدَر. إستوجنَبَ/ بەستیەوە. بە چارەنووسەوە. چارەنوس وابوو. ناچاری بوو.

قَـضَى: لَبّـى. أجـاب/ بـە دەنگـەوە هـات. بـەجێی هێنا.

قَـضَى وطَـرَهُ: بَلَـغَ مـرادَهُ. اتَـمَّ مُـرادَهُ/ بە ئامانجی خۆی گەیشت. بە مەبەستی خۆ گەیشت.

قَـضَى وقتـاً: امضى. صَرَفَ. اضـاعَهُ سُدىً/ كـاتی كوشت. كاتی بردەسەر. كاتی بەفیڕۆدا.

قَضى نَيناً: سَدَدَهُ. وَفَاهُ/ قەرزی دايەوە.

قُضِيَ الأمرُ: إنتهى كل شيء/ هەموو شت تەواو. كار لەكار ترازا.

قَضاء: إنجاز. إتمام/ تەواوكردن. بەجێهێنان. راپراندن. رایی کردن.

قَضاء: إصدار حكم/ بڕیاردان.

قَضاء: أداء. تَلبيَة. إجابَة/ بە هاناوەچوون. بە دەنگەوەچوون.

قَضاء: تقسيم إداري. مَنطِقَة/ ناوچە. شارۆچکە.

قَضاءُ الدَّين: تسديد/ قەرزدانەوە.

قَضاء: سِلكُ القضاء. السلطات القضائية. المحاكم/ دادگا. دەزگای دادوەری.

قَضاءُ على: إبادة. سَحق. إخمَد. إزالة/ لەناوبردن. فەوتاندن. دامرکاندنەوە. نەهێشتن.

قَضاءُ الوَقت: إضاعةُ وقت. صَرف. تَمضيَة/ کات کوشتن. کاربردنە سەر. کات بە فیڕۆدان.

قَضاءُ الله: موت/ مردن.

قَضاءُ وقَدَر: نصيب. حَظ/ چارەنووس. بەخت. سەرنڤیشت.

قَضاء: مُحاكَمَة/ دادوەری.

الإيمان أو الاعتقاد بالقضاء والقَدَر: مَذهَب الجَبرِيَة. حَتمِيَة/ باوەڕکردن بە چارەنووس.

قُضابَة: ماشُذِب/ لق و چڵی هەڵپاچراو.

قُضاع: قَضع. مَغص. وَجَع البَطن/ ژانەسک. پێچ بە سکداهاتن.

قُضاعَة: ثَعلَب الماء.. كلب الماء/ سەگلاو.

قَضَبَ. قَضَّبَ: شَذَّبَ. قَطَعَ الأجزاء الزائدة عن الشجرة/ هەڵپیاچی. سەرپۆتی کرد. بڕی.

قَضقَض.. قَضَّ/ کەوت. ڕووخا.

قَضب: تقضيب. تقليم/ هەڵپاچین. سەرپۆتکردن. بڕین.

قَضع: قُضاع: كَسَرَ الشيء بأطراف أسنانه. قَرَضَ/ قرتانی. بە دان قرتانی. کرۆشتی.

قَضيب: عُود. عَصا/ دار. داردەست. گالۆك. گۆپاڵ. تووڵ. شووڵ. لوولە.

قَضيب: عُضو الرجل. عُضو الذكورة/ چووك. چووچ. سوورە. کێر.

قَضيَة: دَعوىً قَضائيَة/ داوا. کێشە.

قَضيَة: مسألة. شأن. أمر/ کاروبار. کێشە. کێشمە.

قَضيَة مَقضيَة. قَضيَة مُسلَمَة. مُنتهيَة. مايَقبل به الخصمان/ ڕێکەوتننامە. کێشەی کۆتایی پێهاتوو.

قَضيض: صغار الحَصى/ بەردی هاڕراو. وردە بەرد. چەو. زیخ.

جاء القومُ قَضُّهُم وقَضيضُهُم: جميعهم/ هەموویان هاتن.

قَطَّ: بَرىَ. نَحَتَ/ دایدا. نووکی بۆ کرد. تیژی کرد.

قَطَّ: بَرىَ. نَحَتَ/ دایدا. نووکی بۆ کرد. تیژی کرد.

قَطّ: قصير وجَعد/ کورت و لوول.

رَجُل قَطّ. إمرأة قَطّة: قصير الشعر جَعدُهُ/ قژ لوول و کورت.

قَطُّ: أبَداً/ نەوە. نەخێر. هەرگیز. بیرای بیرای.

قَطّ: حَسب. كَفى/ بەس.

قَطّ: فقط. لاغير/ تەنها.

قِطّ: هِر/ پشیلە. کتك. گوربە. پشیلەی نێرە.

**قِط بَرّي**/ پشیلەی کێوی.

**قَطاة.** طائر/ قەتێ. قەتا. ڕیخەخرە. کورکوڕ.

**قِطار:** قِطار السکة الحدیدیة/ شەمەندەفەر.

**قِطار:** قافِلَة. مَوکب. طابور. تتابُع/ ڕیز. یەك لە دوای یەك. بەدوای یەکدا.

**قَطّارة:** أداة لإنزال السائل بقطرات. نَقّاطَة/ دڵۆپێن. تنۆك تکێن.

**قُطارَة:** نتاج عملیة التقطیر/ دڵۆپاو.

**قَطّاط:** خَرّاط. حَفّار/ خەرات. تۆڕنەچی. داتاش.

**قَطّاع:** قاطِع. الذي یَقطَع/ بڕەر.

**قِطاع:** مَجال. حَقل. قِطعَة. قِسم/ بەش. پارچە. کەرت. بڕگە.

**قِطاع خاص**/ بڕگەی تایبەتی.

**قِطاع عام**/ بڕگەی گشتی.

**قِطاع مُختَلط**/ بڕگەی تێکەڵ.

**قَطّاعَة:** مقطع. مایُقطَع بە/ بڕەر.

**قَطّاعي.** بالقَطّاعي. بائع أو بیع بالقَطّاعي: مُفرَد. مُفرّق. بائع بالتجزئة/ وردەفرۆش.

**قِطاف:** أوان القطف/ کاتی بەرووبووم (بڕین. لێکردنەوە. چنین. ڕنین).

**قِطاف:** قَطف. جَنی/ ڕنین. چنین. لێکردنەوە.

**قَطّان:** تاجر القُطن/ لۆکەفرۆش.

**قِطّان:** سَمَك قِطّان/ ماسی سمێڵە. لوتی.

**قَطان:** عناج. الم أسفل الظهر/ پشت ئێشە.

**قَطَبَ:** جَمَعَ/ کۆیکردەوە.

**قَطَبَ. قَطَّبَ** (جبینَهُ. حاجِبَیه. وَجهَهُ): زَوی بَینَ عَینَیه/ دەموچاوی دا بەیەکدا. ناوچەوانی گرژ کرد. مۆن بوو.

**قَطِب:** قاطِب. قَطوب. مُقَطِّب. عابس/ مۆن. ڕووگرژ. مرومۆچ.

**قُطب:** محور. مَدار/ تەوەرە.

**قُطب:** زَعیم. سَیِّد القَوم/ گەورە. گەورەپیاو. سەرگەورە.

**قُطب:** طَرَفَي المحور/ جەمسەر. پۆل. هەردوو جەمسەری تەوەرە.

**القُطب الجنوبي**/ جەمسەری باشوور.

**القُطب الشمالي**/ جەمسەری باکور.

**قُطب سالب**/ پۆلی سارد. جەمسەری سارد. نەرێ.

**قُطب موجب**/ پۆلی گەرم. جەمسەری گەرم. ئەرێ.

**قُطبَ الارض**/ دوو جەمسەری گۆی زەوی.

**قُطبَ الکهرباء**/ دوو پۆلی کارەبا.

**قُطبا المغناطیسیة**/ دوو جەمسەری موگناتیسی.

**قِطَّة:** هِرَّة/ دەڵەپشیلە. پشیلەی مێ.

**قَطَرَ:** سالَ قَطرَةً قَطرَةً. ذَلَفَ/ تکا. دڵۆپەی کرد. تکەی کرد.

**قَطَرَ:** سَحَبَ. جَرَّ/ ڕایکێشا.

**قَطَرَ:** طَلی بالقطران/ قیری تێهەڵسوو.

**قَطَرَ الصَمغ من الشجرة.** خَرَجَ/ کەتیرەی دەردا.

**قَطَرَ. قَطَّرَ.** سَطَرَ. صَفَّ/ ڕیزی کرد. ڕیز بوو. ڕیزی گرت.

**قَطَّرَ:** أسال قطرةً قطرةً/ دڵۆپاندی. تکاندی.

**قَطَّرَ:** صَفّی. رَشَّحَ/ پاڵاوتی.

**قَطَّرَ:** إستخرج بالتقطیر/ دڵۆپ دڵۆپ گرتی.

**قَطر:** تَقَطّر. ذَلف. تنقیط/ دڵۆپاندن. تکاندن.

